# میژوو

گۆڤارێکی مێژوویی وەرزییە،



[illegible] مێژوویی کوردستان دەریدەکات

- ڕاپەڕینی سمکۆی شکاك (١٩١٩-١٩٣٠ ز)
- ڕاپەرینی ٦ئەیلولی ١٩٣٠ز بەردەرکی سەرا هۆکار و دەرئەنجامەکانی
- شاندێن کاسولیکی و کاریگەریا وان یا رەوشەنبیری و جڤاکی لسەر جڤاکێ کوردستانێ
- ألقاب و أصناف التجار في كردستان خلال العصر العباسي
- مساهمة المسيحيين في ازدهارعلوم الطب خلال العصر الايوبي
- نظام هيئة دار المخطوطات الكوردية

ژمارە ١٣
ساڵی چوارەم
زستانی ٢٠١٠




KURDISTAN HISTORICAL CULTURAL ASSOCIATION

جمعية الثقافة التاريخية لكردستان

**راوێژكاران**

پ.د.جەبار قادر(زانكۆی كۆیە)

پ.د. حەسەن جاف

د.شەوكەت عارف(زانكۆی دهۆك)

د.ئیسماعیل حەساف(زانكۆی سەلاحەددین)

- گۆڤار : مێژوو
- ژمارە : [ ١٣ ]
- تیراژ : [ ٥٠٠ ] دانە
- چاپخانە : گۆڤار

كوردستان / هەولێر - نزیك دەستەی وەبەرهێنان – كۆڵانی ٥١ – گەڕەكی ٢٠٤ منارە

كۆڵانی بەرامبەر بانكی كرێدیتی عێراقی

g.mezhu@yahoo.com

g.mezhu@hotmail.com

# پێرست

## ✓ کەشکۆڵی گۆڤار

# گەڕاندنەوەی هاوسەنگی بۆ نووسینی مێژوو

## سەرنووسەر

زۆرجار باس دەکرێت کە سەرکەوتوو مێژوو تۆمار دەکات و بە ئارەزووی خۆی دەینووسێتەوە، لەم ڕووەشەوە هەندێك لە فیرعەونە میسرییەکان ناوی فیرعەونەکانی پێش خۆیان لەسەر نووسینەکان دەسڕیەوە تاکو ناویان نەهێنن. هەروەها لە مێژووی کۆنی میسر باس لە پێغەمبەران یوسف و موسا نەکراوە، لەکاتێکدا لە کتێبە ئاسمانیەکاندا باسیان لێوە کراوە، لە کتێبە مێژووییەکانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی باس لە سەرهەڵدانی پێغەمبەرێك نەکراوە بەناوی مەسیح، لەوانەیە هۆیەکەش ئەمەبێت کە ئەم پێغەمبەرانە لەکاتی خۆیاندا دژی دەسەڵاتە ستەمکەرەکانی سەردەمەکانی خۆیان بوونە، ئەم دەسەڵاتانەش بۆیە ناویان نەهێناون.

لە مێژووی سەدەکانی کۆن و ناوەڕاست و نوێش دەسەڵات هەمیشە هەوڵیداوە مێژوو لە بەرژەوەندی خۆی بنوسێ، یان بنوسێتەوە، وە یان لێکبداتەوە.

جا بۆ گێڕانەوەی هاوسەنگی بۆ نووسینی مێژوو کە هەر بەگوێرەی بۆچوونی دەسەڵاتداران تۆمار نەکرێ بەڵکو بۆچوونی خەڵکی ڕەمەکیش بە هەند وەربگیرێ، گرنگە بایەخ بە مێژووی زارەکی بدرێت، ئەمەش پتر لەگەڵ مێژووی هاوچەرخ دەگونجێت کە ژمارەیەکی باش خەڵکی بە تەمەن هەن دەتوانرێ چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا بکرێت، بۆچوونی ئەوانیش دەربارەی بابەتە جۆراوجۆرەکانی مێژوو تۆمار بکرێ، و مێژوونووس دواتر بە ڕێبازێکی لێکۆڵینەوەی زانستیانە سوودیان لێ ببینێ، بەمەش هاوسەنگیەك دروست دەبێت لەنێوان مێژووی فەرمی و مێژووی میللی، و بواری چەواشەکردن لە مێژوودا کەمتر دەبێتەوە.

بێگومان هەندێك زانیاری مێژوویی گرنگ لای خەڵکی هەیە، لەوانەیە لە بەڵگەنامەکاندا تۆمار نەکرابن لەبەرئەوەی بە گرنگ نەزانراون یان فەرامۆش کراون.

مێژووی کۆمەڵایەتی کوردستان یەکێك لەو بابەتانەیە زۆر کەم لە سەرچاوە نووسراوەکاندا باسی لێوە کراوە، لەکاتێکدا لەڕێگای چاوپێکەوتن لەگەڵ کەسە بەتەمەنەکان کە بۆ نموونە لە سەردەمی پاشایەتیدا ژیاون دەتوانین زانیاری باش لەسەر ئەم لایەنە مێژووییەی نەتەوەکەمان بەدەست بهێنین، بۆیە ئەم کەسە بە تەمەنانە لەڕێگای ئەزموون و زانیارییەکانیانەوە سامانێکی نەتەوەیی گرنگن، ئەگەر زوو بە فریای تۆمارکردنی زانیارییەکانی نەگەین، ئەوا نەتەوەکەمان لەم سامانە گرنگەش بێ بەش دەکەین، با جارێکی تریش ئەمە نەخەینە ئەستۆی دراوسێکانمان یان دوژمنانی کورد، ئەمە کارێکە ئەگەر بکرێت دەبێت کورد پێی هەڵبستێ، ئەگەر نەشکرێ ئەوا کورد نەیکردووە و خۆی لێی بەرپرسیارە.

# ڕاپەڕینی سمكۆی شكاك

# (١٩١٩- ١٩٣٠ز)

هۆگر حەسەن - پیرداود

زیادبوونی نفوزی دەولەتە ناكۆكە گەورەكان لە وولاتانی ڕۆژهەلاتی ناوەراست ونزیك دا، لەگەلیشی دا تەنگەتاویی سیستەمی كۆلۆنیالیستی ی دەولەتە سەرمایەدارە گەورەكان،بزاڤی ڕزگاریخوازی دیموكراتی كوردستانی كرد، بە بەشێكی جیانەبۆوەی جولانەوەی گەلانی ستەم لێكراو وژێردەست وپاشكۆ، دژی ئیمپریالیزم ودەرەبەگایەتی ودیكتاتوری. بۆ وەدەست هێنانی ڕزگاریی نەتەوەیی كەوتنە خۆو شۆرش  وراپەرینی چەكدارانەیان هەلگیرساند.بۆ نمونە لە كوردستانی باشور ، راپەرینەكانی شێخ محمود لە سلیمانی لە سالەكانی ١٩١٩، ١٩٢٢، هەروەها لە ناوچەی بادینان،و راپەرینی ١٩٣٢–١٩٣٤ی ناوچەی بارزان، لە كوردستانی باكوریش راپەرینی شێخ سەعیدی پیران لە ١٩٢٥، وراپەرینی ١٩٣٧–١٩٣٨ی ناوچەی دێرسیم [١].

بەرچاوترین جولانەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی لە كوردستانی رۆژهەلات لە دوای جەنگی یەكەمی جیهانی (١٩١٤–١٩١٨) خۆی لە خەبات وتێكۆشانی سمكۆی شكاك دەبینێتەوە، كە ئامانجی دامەزراندنی دەولەتێكی نەتەوەیی سەربەخۆ بوو.

سمكۆ كەسایەتیەكی ناودارو جەنگاوەرێكی لێهاتوو بوو،خودان پێشینەیەكی درێژی چالاكی نەتەوەیی بوو [٢]. پیاوێكی چوار شانەی بالا رێك بوو ،سمێلەكەی نیشانەی قنجی بوو،رێك وپێكی لەش و جل وبەرگی وەك ئەفسەری سوپای ئینگلیز بوو[٣] هەروەك حەسەن ئەرفەع [٤] دەلێ: سمایل ئاغا سەرۆكی بە هەیبەت وبەدەسەلاتی هۆزی شكاك،لەبەر كەسایەتی بەرزو ئازایەتی تێكەلاو بەبێبەزەیی ، لە نێوان هۆزەكاندا بەشەركەرێكی بێهاوتا ناوی دەركرد. لە باكوری شاری خۆی تا نزیكی شارەكانی سەقزو بانە خاوەن هێزو دەسەلات بوو. هەروەها دەلێ: سمایل ئاغا كوری محەمەد ئاغای شكاك بوو، ژمارەی ئەندامانی هۆزەكەیان لەسالی ١٩٢٠ زاینی دا دەگەیشتە دووهەزار بنەمالە.ئەو هۆزە لە دوولق پێكهاتووە (عەبدۆیی) و(ممدەوی) [٥].

لە دوای مردنی محەمەد ئاغای سەرۆکی تایەفەی عەبدۆیی وسەرخێلی شکاك، ئیسماعیل ئاغای کوری ناسراوترین وبەهێزترین کەسی ناو هەموو هۆزی شکاك بوو. شکاك لە دوای کوژرانی جەعفەر ئاغای برای سمکۆ کە دوایی باسی دەکەین، پەلاماردانی عەجەمیان کردبووە پیشە،لەبەر ئەوە ژمارەیەکی زۆر پیاوی شارەزاو جەربەزە لەسمکۆ کۆببوونەوە (٦).

سمکۆ پیاوێکی ژیرو لێهاتوو بوو .ڕۆژنامەی (بەرەبەیانی ڕۆژهەلات) لە ژمارەی ١٣٠٦ ی بەرواری ٢٠ ی ئۆکتوبەری ١٩٢٦ دا نووسیوویەتی سمکۆ (سیاسیەکی مەزنە بەلام لەچوارچێوەیەکی بچوك دایە)(٧).سمکۆ پیاوێکی جەربەزەو نەترس و جەنگاوەر بوو،قسەکردنی زۆر کاریگەر بوو،لە گەل هەرکەسێکا کەوتبێتە قسەکردن رایکێشاوە بۆ لای خۆی ، ئەو کەسە بادوژمنیشی بوایە پـێ ی ئەسەلماند کە خۆی لەسەر حەقە لەگەلّ ئەوەش پیاوێکی بە سام وترسێنەر بووە.

ئەو هۆیانەی یارمەتی سمکۆی شکاك یاندا

لێهاتووی سمکۆی شکاك ئەگەر بیویستبا لەگەلّ یەکێ لە کاربەدەستی حکومەتەکانا یان هەرکەسێك کە لایەنگری خۆی نەبووایە بۆ قسەو گفتوگۆ چاویان بەیەك بکەوێ، شوێنێکی تایبەتی دیاری ئەکرد بۆ ئەو چاوپێکەوتنە . ئینجا لە پێش وەختدا زەلام وتفەنگچی خۆی ئەناردە ئەو ناوچەیە بۆ ئەوەی بزانن دوژمن لەو ناوچەیە خۆی حەشار نەداوە ، پاش ئەو کارە تفەنگچیەکی زۆری ئەنارد لەوناوچەیەدا بلاوی ئەکردنەوە وسەر لوتکەو تەپۆلکەکانیان ئەگرت . دوای ئەوە سمکۆی شکاك ئەچووە شوێنی ی مەبەست بۆ ئەم چاوپێکەوتنە (٨).

جگە لەوەی سمکۆ بەهۆی مێژووی درێژی بنەمالەکەی وبەهۆی ئەم دەسەلاتەوەش کە لەناو هۆزەکەی وله مەلبەندەکەی دا هەی بوو،کەسێکی ناسراو بوو لەناوکورداو،پەیوەندی لەگەل زۆر کەس وسەرۆك هۆزو زۆرلادا هەبوو .پێش هەلگیرسانی جەنگی جیهانی یەکەم ،سمکۆ لەگەلّ عەبدولرەزاق بەگی بەدرخان(٩) هاوکارو هاوبیر بوو،عەبدولرەزاق بەگ ئەو پرۆژەی کەداینابوو بۆ بەر پاکردنی شۆرش و دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ بەسمکۆی شکاك پشت ئەستور بوو (١٠).هەروەها پەیوەندی لەگەلّ رابەرانی تری نەتەوەیی لەپارچەکانی دیکەی کوردستان هەبوو،وەك (شێخ عەبدولسلامی بارزانی و،سەید تەها شەمزینی و،شێخ مەحمودی حەفید و،خالید بەگی جوبرانلی). ئاسۆی بیری نەتەوەیی فراوانترکردبوو کە زۆرجار باسی دامەزراندنی دەولەتی کوردستانی مەزنی ئەکرد(١١).

هەروەها سەرۆك عەشیرەتەکانی شکاك بە هۆی هەلکەوتەو بارودۆخی ناوچەکەیان، لە هێلی سنوری ئێران و دەولەتی عوسمانی دا هەلکەوتبوو، بۆ هیچ یەك لەم دوو دەولەتە نەدەبوونە ژێر چنگ ،کاتێك ئێران تینی بۆ دەهێنان ،بەرەو عوسمانی دەبوونەوە،عوسمانیەکانیش غەدریان لێکردبان لە ئێران نزیك دەبوونەوە (١٢). کە کەوتبوونە نێوان چەهریق لەبناری زۆزان لەرووی ئێران، وە سایەنقەلا لەرووی توورکەکانەوە (١٣).

پشتگیری عەشیرەتەکان بۆسمکۆی شکاك ،بێجگە لە هۆزی شکاك،هۆزی هەرکی (١٤) وتەواوی هۆزەکانی کوردی :مامەش،مەنگوڕ،دێبوکر،زەرزا،پـشدەر،چوونە ریـزی هێزەکـانی سمکـۆی شـکاك ،هۆکـارێکی تـری سەرکەوتنی سمکۆی شکاك بوون(١٥) .

کوشتنی جەعفەر ئاغا برای سمکۆ لەلایەن حکومەتی تەوریز ،کاتێك بـەناوی بانگهێـشت ودۆسـتایەتیەوە ،داوای لە جەعفەر ئاغاکرد کە لەگەڵ ژمارەیەك لە سوارەکانی بێتە تەوریز وهاوکاری بکات لە هێمنکردنـەوەی تەوریز ،کە بەهۆی شۆرشی ١٩٠٥ ی رووسیا،ئازەربایجان وقەفقاز پەشێوی تێکەوتبوو.چەند رۆژ دوای چوونی جەعفەر ئاغا بۆ تەوریز،داوای لێکرد بۆ گفتوگۆ سەبارەت بە دۆخـی شـار بێتـە فەرمانگـەی حکومـەت ،لـە وێ کوشتیان لە ١٩٠٧ز.ئەو کردەوە ناجوامێرانەی حکومەتی تەوریز بە جێگەی ترساندنی هـۆزی شـکاك ،ئـەوانی زیاتر تووڕە وسەربزێوکرد بۆ تۆلەکرنەوەی [١٦] .

بارودۆخی ئێران ، شایەکانی قاجار لە کۆتاییەکانی دەسـەلاتیان دا ،هـەموو هێـزو توانایـەکیان ئـەوەبوو لەقەبی زل زل ببەخشن، وەك سالار فاتح، مکرم السلطنة، مفخم الملك ئەمانە موچەیەکیان ئەدا بە شـا و ئـیتر خۆیان چیان لە ژێر دەست وهەژاران ئەکردو ئەیان چەوساندنەوە لێپرسینەوە نەبوو[١٧] . لـە کۆتـایی یـەکانی جەنگی یەکەمی جیهانی ئێران لە رووی ئیداری ودارایییەوە پەشێوی تێکـەوتبوو. شـەری هۆزەکـان وبۆشـایی سیاسی وبلاوبونەوەی برسیەتی وقات وقری لە ناوچەکاندا. روسـەکان وبەریتانیـەکان هێـشتا لـە سـەر خـاکی ئێران بوون.حکومەت لە تاران کەوتبوو ،لە ئەنجامی رێکەوتنی ساڵی ١٩١٩ لەگەڵ بەریتانیا لـە ژێردەسـەلاتی ئەودابوو.مەترسیەکان پتر بوون،بە هـۆی کۆمەڵـەی شۆرشـگێری لـە ناوچـەی قـەزوین بـەرەو تـاران دەکشان بەیارمەتی سوپای سوری سۆڤیەت [١٨].وە هەرەسی دەسەلاتی حکومەتی ناوەندی لە دواساڵەکانی پاشایەتی بنەماڵـەی قاجـاری دا ،یارمەتیـەکی زۆری سمکـۆی دا .ئێـران بـۆ بـەرگری لـە خـاکی بـەرینی خـۆی هێزێکـی سەربازی ئەو تۆی نەبوو، تا کودەتای ساڵی ١٩٢١ ی رەزاخانیش کە هاتەسەردەسەلات ،سەربازەکانی لە ژێـر فەرماندەیی بێگانەدا بوون ، ئەفـسەرانی روس فەرمانـدەیی هێزەکـانی ئێرانیـان ئـەکرد وئازوقـەو پێداویـستی سەربازەکان لەلایەن دەوڵەتی بەریتانیاوە دابینکرابوو. کەئەمە بوو بە هۆی نابوتی ئێران [١٩] .

لەلایـەکی تـرەوە ڕووداوەکـانی تـری جیهـانی وناوچـەیی وهـەرێمی وەك شۆرشـی ئۆکتۆبـەری رووسـیا وبلاوکردنەوەی چواردەبەندەکەی ویلسن ی سەرۆکی ولایەتە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا ، کـە ئامـاژە بـۆ مـاف نەتەوایەتی گەلانی بن دەست دەکات ،هەروەهابەندەکانی پەیمانی سیڤەر لەمەر مـاف نەتـەوەیی گـەلی کـوردو چالاکی وتەقەلاکانی شێخ محمودلەکوردستانی باشـوور، ئەمانـەو راپەرینـە شۆرشـگێرییەکانی تـری ئێـران لـە گەیلان ومازندەران وئازەربایجان دژی حکومەتی مەرکەزی ،هەریەکەیان بەرادەی جیاواز کاریگـەری تایبـەتیان لە ماندان وجۆشدانی خەباتی نەتەوایەتی لە کوردستانی ئێران لەو کاتەدا هەبوو[٢٠].

هۆیەکی دیکە دەستکەوتنی ژمارەیەکی زۆر چەکی سووکی وەك تفەنگ دەتیر ودۆشکەی سووك بوو،کە لەئاکامی پاشەکشەی هێزەکانی رووس وتورك بە دەستیان هێنابوو، بە تایبەتی لە سوپای روسیا کە بەهۆی سەرکەوتنی شۆرشی ئۆکتۆبەر لە ساڵی ١٩١٧دا وگەرانەوەی بەپەلەیان بۆ ولاتەکەیان دەستیان کەوتبوو بەم هۆیەوە خۆیان پر چەك کرد [٢١].وە کاتێك عوسمانیەکان لە جەنگ دا تێکشکان و ناوچەی ورمێ یان بەجێهێشت ،دەستەیەکی چەند سەدکەسی لە سوپای عوسمانی وتۆپچیەکانیان نەگەرانەوە وولاتەکەیان ،بە هەموو کەل وپەلی سەربازیانەوە چوونە چهریق وخۆیان خستە ژێر فەرمانی سمکۆیشکاك [٢٢].

دروست بوونی بۆشایی سیاسی لە ناوچە کوردییەکان هۆیەکی دیکەبوو،ئەوەتا دوایی شۆرشی ئۆکتۆبەر و کشانەوەی سوپای روسیا لە ئێران ،لەو کاتەدا دەولەتی ئێران هیچ دەسەلاتێکی لە کوردستان دا نەمابوو،لەبەر ئەوە کورد خۆی کاروباری خۆی بەرێوە دەبردو بەنەمانی نفوزی روسیا لە ناوچەکەدا هەلێکی لە باری بۆ سمکۆ رەخسان بۆ ئەوەی پەرە بەدەسەلاتی خۆی بداو راپەرین بەرپا بکات [٢٣].

رووداوەکانی راپەرین

سمکۆی شکاك لەسەرەتای دەست پێکردنی بزووتنەوەکەی ئاگاداری لاوازی حکومەتی ئێران وخراپی بارودۆخی گشتی ئێران بوو،لە بەر ئەوە لای وابوو ئەوە هەلێکە ئەبێ کورد بۆ سودی خۆی بیقۆزێتەوە،کوردی شوێنەکانی تریش پشتیوانی لەوان بکەن ،بۆ وەدیهێنانی ئامانجی نەتەوەیی .

لە ساڵی ١٩١٩ زاینی دوو رووداو هاتە پێشەوە بوون بەهۆی تەقاندنەوەی ناکۆکی دێرینەی کاربەدەستانی ئێران وکورد بەتایبەتی شکاك لە ناوچەی ورمێ دا ،پلانی کوشتنی سمکۆ وناردنی حاکمێکی نوێ بۆ بەرهەلستی کردنی کورد لەورمێ [٢٤].

ئەوەتا دوای شکستی هەولی حکومەتی ئێران بۆ تیرۆرکردنی سمکۆ لە نیسانی ١٩١٩ دا،ئەم سەرکردەیە راپەرینی سەرتاسەری دژی حکومەتی ناوەندی راگەیاند ،دوای ئەوەی لە زنجیرەیەك شەرو پێکدادانەدا هێزەکانی حکومەتی تێك وپێکشکاند، ناوچەیەکی فراوانی رزگارکرد هەر لە گۆمی ورمێ تا سنوری تورکیا ولە وێوە بەرەو خوار هەتا شارەکانی سابلاغ وسەقز وبانە،عەشیرەتەکانی ناوچەکە چوونە ریزی راپەرینەکەو هێزی چەکداری گەیبە ١٠٠٠٠شەرکەر. سمکۆ بەرێوەبەرایەتیەکی کوردیی لە ناوچەکەدا دامەزراند وشاری ورمێ ی کردە ناوەندی دەسەلاتی و رۆژنامەیەکی بەناوی (رۆژکرد شەوعجم) دەرکرد،دواتر ناوەکەی گۆرا بۆ (رۆژکرد)[٢٥]. لەم ماوەیەدا سنوری ناوچەکانی خۆی بەتەواوی پەرەپێدا، لە شنۆ و لاجانەوە تا ورمێ وسایەنقەلا، لە رۆزان وچەهریق ەوە تا سەقز وبانە، ئەو ناوچانە بە هەموو عەشایرەکانیانەوە کەوتنە ژێر چاودێری وفەرمانیەوە[٢٦].توانی ناوچەیەکی فراوانی کوردستانی رۆژهەلات ئازاد بکات .

دوای چەسپاندنی بنەماکانی دەسەڵاتی خۆی ،لە ساڵی ١٩٢٢ دا خۆی وەك مەلیکی کوردستان ڕاگەیاند. دورشمەکەی بریتی بوو لە دوو لوتکە چیای بەرامبەر بەیەك و ووشەی کوردستانی ئازادی بە دەوردا هەڵکەندرابوو. (٢٧)

حکومەتی ئێران بریاری هێرشکردنی بۆ سەر سمکۆدا ،ئەوە بوو (٨٠٠٠) هەزار چەکداری ئامادەکرد بۆ ئەم مەبەستە ،لە شەکریازی شەری یەکلاکەرەوە لە ١٩٢٢/٧/٢٥ روویدا،سمکۆشکاك لەسەرەتای شەردا ١٠٠٠٠ چەکداری لەگەڵ دابوو دواتر تەنها ١٠٠٠ چەکداری مابوون ئەوانیش ئەندامی عەشیرەتی شکاك بوون ،هێزە ئێرانیەکان بەرەو ورمێ کشان وچونە ناویەوە ،پاش ئەوەی بۆماوەی چوارساڵان لە ژێر دەسەڵاتی سمکۆ دابوو.دواتر بەرەو چەهریقی بارەگای سمکۆ وەرێ کەوتن،یەکەیەك لەو هێزانە چوو بۆ سەر سنور ،تا داوا لە تورکەکان بکەن هەر چەکدارێکی سمکۆ بپەرێتەوە لە سنور چەکی بکەن.بەڵام سمکۆ هێرشی کردە سەر ئەو یەکە ئێرانیەی کە گەیبووە سەر سنور وناچاری کرد پاشەکشە بکات.گەیشتنی هێزی زیاتر بە ئێرانیەکان ،سمکویان ناچارکرد،پاش زنجیرە شەرێکی قورس بچێتە خاکی تورکیا،بەم شێوەیە قۆناغی بەهێزی بزووتنەوەکەی سمکۆی شکاك کۆتایی پێهات (٢٨) .

دوای بەسەر دادانی لەلایەن تورکەکان ،سمکۆی شکاك دێتە کوردستانی باشور ،لە ساڵی ١٩٢٤ سەر لە نوێ لە ئێران سەرهەڵدەداتەوە وخۆی تەسلیم بە جەنەراڵ تەهماسوبی فەرماندەی هێزەکانی ئێران لە باکور کردومۆلەتی وەرگرت کە لەچەهریق دابنیشێ،لە ساڵی ١٩٢٥ رەزاشا پێشوازی کرد.دوای یەك ساڵ بەچەند سەد کەسێکی هۆزی هەرکی یەوە ،دەشتی سەلماسی گرت ،بەڵام هێزەکانی ئێران رووبەرووی بوونەوە تا سنوری ئێران وتورکیا راونرا،

دوای چەند مانگێك دیسانەوە لە عیراق سەری هەڵدایەوە،پاشان لە تورکیا لە ساڵی ١٩٢٧ ،جارێکی تر لەساڵی ١٩٢٨ هاتەوە عیراق.دەوڵەتی عیراق مەترسی لە سمکۆ هەبوو،هەربۆیە گوشاری خستە سەر ئێران کە بیگەرێنێتەوەبۆ ناوخاکی وولاتەکەی، لە ئەنجام دا کرا بە فەرمانرەوای شنۆ ،دوای چەند رۆژێك بەغەدر لەلایەن سەربازانی ئێران کوژرا لەساڵی ١٩٣٠ (٢٩).

پەیوەندییەکانی سمکۆی شکاك

سمکۆ وحکومەتی ئێران

سمکۆی شکاك ئەزموونێکی باشی لەگەڵ دەسەڵاتی ناوەندی ئێران دا نەبوو،هەر لە ساڵی ١٩٠٧ لەوکاتەی بە بیانوی پاراستنی ئەمن و ئاسایش و گفتوگۆ کردن دەربارەی پەشێوییەکانی ناوچەکە ،دەسەڵاتی ئێرانی ناردی بەدوای جەعفەر ئاغای ، برای سمکۆ بێت بۆ تەورێز، کە ئەوکاتە سەرۆکایەتی هۆزی شکاکی دەکرد، بۆ سەیەکی بۆ نرایەوە وجەعفەر ئاغا یان کوشت.ئیدی لەوکاتە بەدواوە سمکۆ

کینەیەکی زۆری لە ئێرانییەکان هەڵگرت [٣٠]. هیچ لایەکیان بروایان بەویتریان نەبوو، کاربەدەستانی ئێران سمکۆیان بە یاخی ونافەرمان و راووڕووتکەر دادەنا ئەویش کاربەدەستانی ئێرانی بە پەیمان شکێن و زاڵم وبەرتیلخۆر دائەنا، لەبەر ئەوە لەیەك گەیشتنی کورد وئێران لە تواناادا نەبوو،دەسەڵاتی ئێرانی لە بەرامبەر سمکۆدا زمانی هەرەشەو گوللەومەیدانی شەربوو ، ئەو چەند جارەی ئێران بە هۆی لاوازی و گیروگرفتی ناوخۆیی پەیوەندی لەگەڵ سمکۆ کردووە ، هەمووی بەنیازی خاوکردنەوەی سمکۆ و،دانانی ڕێوشوێنی لە ناوبردنی بووە .سمکۆش لە ئەنجامی ناچاری ونائومێدی تێکشکاندا پەیوەندی پێوەکردوون وبەنیازی خۆ گرتنەوەو جێگیر کردنەوەی خۆی بووە [٣١].

لەگەڵ هاتنە سەردەسەڵاتی رەزاشا،مەترسی لە سمکۆی شکاك پەیداکرد، بیری لە لەناوبردنی کردەوە، ئەوەبوو رۆژێك دیارییەکی بۆ دەنێرێ کە بە ماددەی تینتی چێنرابوو ،هەرچەندە دیارییەکە گەیشتە دەست سمکۆ وتەقییەوەو بووە هۆی کوشتنی برایەکی سمکۆ بەڵام لەم کارەساتە سمکۆ دەرباز بوو [٣٢]،رەزاشا چەند جارێك ویستی لەگەڵ سمکۆی شکاك بکەوێتە گفتوگۆ،کە شەرو جەنگان لەگەڵی چارەسەر نەبوو.ئەوەبووبریاریاندا لە سەر کانیەك لە (شاروێران) رەزاشا هاتوو وسمکۆش چووە ئەوێ ،لەو شوێنە ڕێك کەوتن لەسەر ئەوەی بەشی وڵاتی کوردەواری بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی سمکۆی شکاك و بەشی وڵاتی فارس وتورکمانەکەیش ،رەزاشا وحکومەتی ئێران،ئیتر سمکۆ وازبێنێت.بەڵام ئەمە زمانلوسی ئێرانییەکان بوو ،هەرجارەی لەگەڵ کوردان ئەیانکرد هەر قسەو هیچی تر [٣٣].

دوا گفتوگۆی لەگەڵ حکومەتی ئێران لە ساڵی ١٩٣٠ بووەهۆی کۆتایی پێهێنانی بزوتنەوەکەی ،کاتێك حکومەتی شا داوای لە سمکۆ کرد بۆگفتوگۆکردن وبەئاشتی چارەسەرکردنی مەسەلەکە سمکۆش لەم بارەیەوە لاری نەبوو، لە شاری شنۆ زۆر بەگەرمی پێشوازی لە سمکۆ کراو،بەم بۆنەیەوە ئاهەنگیان گێرا ،بەڵام کۆنەپەرستانی ئێران لە ڕێگەی گەرانەوەی سمکۆدا بۆسەیان بۆ داناو لە ناویان برد [٣٤].

### سمکۆی شکاك وئینگلیزەکان

سمکۆی لە نێو سیگۆشەیەك دا دەژیا کە لە باکوری رووس و خۆر ئاوای تورك وخۆرهەڵاتی ئێران بوو.لە ئێرانیش بە تەواوی نەبان بوو.بۆ سمکۆ مەسەلەی دوو وڵاتی دراوسێ زۆر گرینگ بوو پێشتریش بە چەك و ئیمکانیاتی هێزەکانی رووس وعوسمانی خۆی تەیار کردبوو،ببووە بە هێزترین کەسی ناوچەی ورمێ. ئینگلیزەکان لە ڕێگای میسیونێرەکانیانەوە پەیوەندیان بە سمکۆ وە کردبوو ،بۆ ئەوەی لەگەڵ مارشمعون سەرۆکی ئاشورییەکان ببێ بە یەك [٣٥]، بە مەبەستی لێك جیاکردنەوە لە عوسمانیەکان لە کۆتایی جەنگی

یەکەمی جیهانی بۆ بەهێز کردنی بەرەی رووس ، بەلآم سمکۆ ئەم یەکگرتنەی رەتکردەوە ،لە جیاتی ئەمە سەرۆکی ئاشوریەکانی کوشت لەساڵی ١٩١٨ (٣٦) . عەلائەدین سجادی دەڵێ: رووسەکان هانی مارشمعون یان دا ،کە بوونی سمایل ئاغا کۆسپێکی گەورەیە ،بۆ رووسەکان خۆیان وە بۆ مارشمعون و، سمکۆ لەناو بەرێ.کەوتە گفتوگۆ لەگەڵ سمکۆی شکاك بەناوی ئەوەی حکومەتێکی کوردی –ئەرمەنی دروست بکەن.بەلآم لە راستی دا ئەیویست لەم رێگەیەوە سمکۆ وکوردەکان لەناو بەرێ وحکومەتێکی ئەرمەنی –ئاسوری دروست بکات.سمکۆ هەموو شتێکی بۆ دەرکەوتبوو ئەگەر نەکەوێتە خۆ مارشمعون لەناوی ئەبا بۆیە مارشمعونی کوشت (٣٧).

سمکۆ لە ساڵی ١٩١٩ کەوتە سەر ئەوەی بەریتانیای مەزن بەلای خۆیدا رابکێشێت ویارمەتی لەوان وەربگرێ. بۆیە لەو ساڵەدا سەید تەهای بۆ بەغدا نارد تا رەزامەندی ئینگلیزەکان وەربگرێ کە کوردستانی ئێران بخرێتە سەر ئەودەوڵەتە کوردییەی کە لەوسەروبەندەداباس لە دامەزراندنی دەکرا. سەید تەها چەندین جار ویلسنی حاکمی مەدەنی بەریتانی بینی ولە دووره پەرێزی ویلسن لەو مەسەلەیە زۆر نائومید بوو،بەریتانیا سەرگەرمی گفتوگۆی بەستنی پەیمانێك بوو لەگەڵ ئێران دا،بە گوتەی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا جیابوونەوەی ئەم بەشەی کوردستان لە ئێران سەرەتایەکی باشی نابێت بۆ ئەو بارە تازەیەی کە ئومێدی ئەوە هەیە بە مۆرکردنی پەیمانی دووقۆڵی نێوان ئینگلیز وئێران دەست پێ بکات .کودەتای ١٩٢١ ی ئێران ئەم پەیمانەی هەڵوەشاندەوە کە لە سالی ١٩١٩ بە سترابوو لە نێوان ئینگلیزو ئێران. لە کانونی دووەمی ١٩٢١ٰ سمکۆ رای گەیاند ئامادەیە بۆ دیداری مامورێکی ئینگلیزی تا شنۆ بروات گوتبووی: دەیەوێت پەیوەندی یەك لەگەڵ بەریتانیا دروست بکات ئەوسا سێرپرسی کوکس لە ١٩٢١/٨/١٩ داپەیوەندییەکەی پەسندکرد (٣٨) .گفتوگۆی نێوان بەرپرسانی ئینگلیزو سمکۆ لە بەغدا لەرێگەی یەکێك لە سەرۆك عەشیرەتەکانی سنور بەناوی بابکر ئاغا بۆ ماوەی سێ مانگ بەردەوام بوو ،دوای کوکس هەربەوەندە وازدێنێ هیچ کەس بۆدیداری سمکۆ نانێرێ(٣٩).

دوای تێکشکانی سمکۆ لە ئێران رووی کردە کوردستانی عیراق لە بە حرکەی نزیك هەولێر نوێنەرانی ئینگلیزی بینی دوو پێشنیاری خستە بەردەستیان ،هاوکاری کورد لەگەڵ ئینگلیز بەرامبەر بەوە ئەوانیش پشتیوانی کورد بکەن بۆ دامەزراندنی دەولەتی کوردستان .ئەگەر ئەوە ناکەن یارمەتی خۆی بدەن بەئاشت کردنەوەی لەگەڵ ئێران یا بەشەر بگەرێتەوە شوێنی خۆی .

دوایین بەرهەڵستی ئینگلیز لەگەڵ سمکۆ ئەوەبوو کاتێ سمکۆ لە ژێر گوشاری تورکی چووە ناوخاکی کوردستانی عیراق ، موعتەمیدی بەریتانی لە بەغدا داوای لەحکومەتی عیراق کرد، هاوکاری لەگەڵ حکومەتی ئێران بکا بۆ سەرکوت کردنی راپەرینی سمکۆ (٤٠).

نێوانی سمکۆ و ڕووسەکان

بـوونی سـوپای ڕووس لـە ناوچـە کوردنـشینەکانی کوردسـتانی ڕۆژهـەلأت دەگەڕێتـەوە بـۆ پـێش هەڵگیرساندنی جەنگی جیهانی یەکەم ،هەروەك حەسەن ئەرفەع دەڵێ :هەر لە ساڵی ١٩١١ زاینی بەوە زۆربەی ناوچە کوردنشینەکان لەلایەن سوپای ڕووسیاوە دەستیان بە سەرداگیرا(٤١).

کاتێك عبدلرزاق بەدرخان لەسایەی سمکۆی شکاك،قوتابخانەیەکی لە شاری خـوێ دامەزرانـد ،ڕووسـەکان یارمەتیـەکی باشـیان دا،سمکـۆی شـکاك لـە کـاتی کردنـەوەی قوتابخانەکـەدا وتـارێکی خوێنـدەوە سوپاسـی ڕوسیای قەیصەری کرد(٤٢).حوسینی مەدەنی دەڵێ: ڕووسەکان بۆ دڵنیابوونی یەکجاریان لە سمکۆ لە کانونی یەکەمی ١٩١٢ بۆ ڕوسیایان دەعوەت کرد. حاکم ی تفلیس بە گـەرمی پێـشوازی لێکردو،خـەڵات کـرا وکردیـان بەسەرۆکی کوردە پاسەوانەکانی سنوری قوتوور، موچەیان لە خەزێنەی دەوڵەتی ڕووس بۆ بڕیەوە(٤٣).

بە گوێرەی قسەکانی حەسەن ئەرفەع لە ماوەی جەنگی یەکەمی جیهانی سمکۆی شکاك دژ بـە ڕوسـەکان جەنگاوە ،هەروەك دەڵێ:کوردەکان لەلایەن دەوڵەتەکانی ئەلمانیاو تورکیاوە بۆ شەر دژی ڕوسیا پرچەك کران (٤٤) . ئەوەی کە دیارە ڕوس لەگەڵ خواستە نەتەوەییەکانی کورد نەبوو ، لە پێش هەڵگیرسـانی جـەنگ ولـە ساڵانی جەنگی جیهانیش دا.ڕوسیا هاوکاری ئاسوری وئەرمەنی دەکرد ،نەیئەویست بـۆ کـورد نێـوانی لەگـەڵ ئەوان تێك بچیێت .

ڕوسیا لە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەر توشـی کێـشەی نـاوخۆی وگـەمارۆدانی وڵاتـانی ئـەوروپی بوو،نەی ئەویـست نفـوزی دەوڵـەتانی ئیمپریالیـستی بگەنـە سـنوری لای خـوارووی، هـەر لەبـەر ئـەوەش بـە پێچەوانەی سەردەمی قەیصەر کە ڕێك کەوتبوو لەگەڵ بـەریتانیا وفەرەنـسا وئیتالیـا بـۆ دابەشـکردنی خـاکی عوسمـانی و ئێـران ،سیاسـەتی حکومـەتی سـۆڤیەتی هەڵوەشـاندنەوەی هـەموو ڕێکەوتنامـە کۆنـەکان ودامەزراندنی دەوڵەتی تورکیا وئێران وئەفغانستان بوو(٤٥).

کـریس کۆچـێرا بـە پـشت بەسـتن بـە ڕاپـۆرتی ١٩٢٢/٧/٣ کونسولی بـەریتانیا لـە کرمانـشان ،وەزارەتـی کاروباری دەرەوەی بەریتانیا ژمارە( ٣٧١٧٨٠٨ ) دەڵێ: هەندێ پروپاگەنـدە هـەن سمکـۆ هـەوڵی داوە یارمـەتی وپشتگیری سۆڤیەتەکان وەدەست بێنێ بۆ ئەم مەبەستە لە بـەهاری ١٩٢٢ نوێنـەری خـۆی بـۆ بـاکۆ نـاردووە .ئەگەر ئەمە ڕاست بێ کاتێکی درەنگی بۆ ئەم کارە هەڵبژاردووە .ڕژێمی تازەی ئێران لە ١٩٢٢/٢/٢٦ دا بە پێـی ڕێکەوتنێکی دووقۆڵی پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتیدا ئاسایی کردبووە(٤٦).

سمکۆ و تورکەکان

لـە سـەرەتای جـەنگی جیهـانی یەکـەم دا ،عوسمانیـەکان توانیـان ناوچـەکانی ورمـێ ودەوروبـەری بگـرن وڕوسەکان لەم ناوچەیە وەدەرنێن وپەیوەندی بە عەشیرەتی شکاك بکەن بیانکەن بەلایەنگری خۆیان [٤٧].

لە تشرینی یەکەمی ١٩٢١ دا مستەفا پاشای یامولکی لە گفتوگۆیەك دا،کە لەگەڵ سمكۆی كردوە لە بارەگاكەی خۆی لە چهریق بیروڕای خۆی سەبارەت بە تورکەكان روون ئەكاتەوە: ((پرسیار باشە تۆ هەوڵ دەدەی بۆ ئەوەی كورد رزگارو ئازاد بكەیت ، ئەی بۆچی پێش هەموو شتێك ناوچەی وان وئەرزروم بەتلیس وهەكاری وخەربوت رزگار ناكەیت وئەو خەڵكە رێك ناخەی ،كەماوەیەكە لەژێر جەوروستەمی تاقمەكەی مستەفا كەمال دان. وەڵام: من وای بەباش دەزانم ،كەلە پێش دا لە ئێرانەوە دەست پێ بكەم، من هیچ بە چاكی نازانم، لەم رۆژەدا لەگەڵ توركەكان دا تێكی بدەم ،چونكە ئەوان بەتفەنگ وفیشەك یارمەتیم دەدەن...))

توركەكان بەرواڵەت دۆستایەتی سمكۆ یان ئەكرد .هەندێ چەك وتەقەمەنییان دابویە، ئەویش بەدابین كردنی خواردەمەنی ،كە لەو سەردەمەدا گرنگییەكی تایبەتی هەبوو ،یارمەتی ئەدانەوە.بەڵام سمكۆ هەوڵی دامەزراندنی كوردستانی سەربەخۆی ئەدا .ئەمەش بەتەواوی ناكۆك بوو لەگەڵ ئامانجی كەمالییەكان دا[٤٨].

رەفیق حلمی دەڵێ: لە سەرەتای جولأنەوەی سمكۆی شكاك دا لە سەر سنوری ئێران وتوركیا،بڵاو بوونەوەی دەسەڵاتی ،توركەكانی خستە ئەندێشەوە ، كە ئەم راپەرینە بە هۆی كۆمەڵەكانی سیاسی كوردەوە رەنگێكی تر وەربگرێ وبگۆرێ بە بزوتنەوەیەكی سیاسی قەومی وكوردستانی باكوریش بگرێتەوە (كوردستانی توركیا) بەڵام سەرقاڵبونیان بەشەری یونان ،رۆژی ئەوە نەبوو دوژمنی تر بۆ خۆیان پەیدابكەن .لەبەر ئەمە مێچكەشیان لەبەرداكرد ،تەنانەت بەناوی دیاریەوە بە چەك وجبەخانە یارمەتیشیان داو هەڵیان فریواند[٤٩].

هەروەك باسمان كرد دوای شكست خواردنی لەلایەن هێزەكانی ئێران، سمكۆی شكاك چووە ناوخاكی توركیا توركەكانی خستە ئەندێشەوە بەوەی ،كە ئەم جولأنەوەیە بگوازرێتەوە بۆ ناوچەكانی كوردستانی باكور لە ژێر دەسەڵاتی توركیا، ئەمە لەلایەك ،لە لایەكی دیكە هەندێ هەواڵیان هەبوو دەربارەی پەیوەندی نیوان سمكۆ و بەریتانیەكان ،ئەمە بوو بەهۆی گۆرانی هەڵوێستی توركەكان بەرامبە بەسمكۆ . ئەوەبوو شەوێك بەسەر سمكۆیان دادا،توانی خۆی رزگار بكا، لەم رووداوەدا خێزانەكەی كوژرا ،كورەكەی بەدیل گیرا ،خۆشی هاتە باشوری كوردستان[٥٠].

سەرچاوەو پەراوێز

(١) عزیز شەمزینی ،جولأنـەوەی ڕزگـاریی نیـشتمانی ی كوردسـتان ، وەرگێرانـی فەریـد ئەسەسـەرد، سـلیمانی، ٢٠٠٦، ل١٥٦ .

(٢) یاسین سەردەشتی ،كوردستانی ئێران لێكۆلینەوەیەكی مێژوویی لە جولأنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی گەلی كورد، سلیمانی، ٢٠٠٣ ، ل٣٧ .

(٣) بەدرخان سندی ،كۆمەلگای كوردەواری لە دیدی ڕۆژهەلأتناسیدا، وەرگێرانی ئیسماعیل ئیبراهیم سەعید،چاپخانەی خانی، دهۆك، ٢٠٠٨،ل٣٤٣.

(٤) حەسەن ئەرفەع: ژەنـەڕاڵێكی سـوپای ئێرانـی بـووە بۆمـاوەی بیـست وپێنج سـاڵ، لـە هەرێمـەكانی ئازەربایجـانی ڕۆژئاواو مەریوان وهەورامان لەرۆژهەلأتی كوردستان دژی سمكۆی شكاك ومەحمود خانی كانی سانان شەری كردووە.

(٥) حەسەن ئەرفەع ،كوردەكان، وەرگێرانی حامید گەوهەری، چاپخانی منارە، هەولێر،٢٠٠٧، ل٩٢ .

(٦) نەوشیروان مستەفا ئەمین، كوردو عەجەم،چاپخانەی ڕوون ،سلیمانی، ٢٠٠٧، ل٤١٢ .

(٧) عزیز شەمزینی، سەرچاوەی پێشوو، ل٢١٤ .

(٨) عەلائەدین سەجادی ،شۆرشەكانی كورد وە كۆماری عێراق، تاران،٢٠٠٥، ل٢٤٢ .

(٩) عبدولرەزاق بەگی بەدرخان كوری نەجیب پاشایە: كەسایەتیەكی شۆرشـگێری كـوردی كوردسـتانی بـاكورە لەسـالی ١٨٦٤زاینی لە شاری ئیستنبول لە دایك بووە ،بەر لە جەنگی جیهـانی یەكـەم چـۆتە كوردسـتانی ڕۆژهـەلأت پەیوەنـدی بەسمكۆی شكاك كردوە،لەسالی ١٩١٨زاینی كۆچی دوای كردوە.

(١٠) نەوشیروان مستەفا ئەمین،سەرچاوەی پێشوو،ل٤١٢ .

(١١) یاسین سەردەشتی ،سەرچاوەی پێشوو، ل٣٧ .

(١٢) حوسێنی مەدەنی،كوردستان وستراتیژیی دەولەتان، بەرگی دووەم،هەولێر، ٢٠٠١، ل٧١ .

(١٣) عەلائەدین سەجادی ،سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤١ .

(١٤) حەسەن ئەرفەع،سەرچاوەی پێشوو،ل٩٣.

(١٥) حەسەن ئەرفەع،هەمان سەرچاوە، ل١٠٠.

(١٦) حەسەن ئەرفەع، هەمان سەرچاوە، ل١٠١.

(١٧)عەلائەدین سەجادی، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣٩-٢٤٠ .

(١٨) دیڤید مكداول، تاریخ الاكراد الحدیث، بیروت، ١٩٩٦، ل٣٣٤..

(١٩) كـریس كوچـێرا ، كـورد لـە سـەدەی نـۆزدەو بیـست دا،وەرگێرانـی حەمـە كـەریم عـارف، سـلیمانی ،چـاپخانەی شڤان،٢٠٠٤، ل٥٢ .

(٢٠) یاسین سەردەشتی ، سەرچاوەی پێشوو ،ل٣٦.

(٢١) حەسەن ئەرفەع، سەرچاوەی پێشوو، ل٥٥ .

(٢٢) حوسینی مەدەنی ،سەرچاوەی پێشوو، ل٧٥ .

(٢٣) عزیز شەمزینی، سەرچاوەی پێشوو، ل٢١٤ .

(٢٤) نەوشێروان مستەفا ئەمین، سەرچاوەی پێشوو،ل٤٢٣ .

٢٥ یاسین سەردەشتی، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٧.

(٢٦) عەلائەدین سجادی ، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤٩ .

(٢٧) ئاراس عبدالرحمن موستەفا ،شوێنی جوگرافیای کوردستان وبایەخ پێدانی لە لایەن دەولەتە زلهێزەکانەوە،بلاوکراوەی زانکۆی کۆیە ،ژمارە (١) ،کانونی دووەم (٢٠٠٤) ،ل٩١ ،

(٢٨) کریس کوچیرا،سەرچاوەی پێشوو،ل ٦٢-٦٣.

(٢٩) کریس کوچیرا،هەمان سەرچاوە، ل٦٤-٦٥.

(٣٠)کرس کوچیرا، ل٥١.

(٣١) نەوشیروان مستەفا ئەمین، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٥٠ .

(٣٢) کریس کوچیرا ،سمکۆی شکاك وبەریەرەکانی تورکیاوئێران ورووس وئینگلیز ، وەرگێرانی جەمال تەها حسین وعەبدولخالق

محەمەد تاهر،گۆڤاری یەکبون ،ژمارە (١٧) ،نیسانی ٢٠٠١ ، ل٨٣ .

(٣٣) عەلائەدین سەجادی،سەرچاوەی پێشوو،ل٢٥٨.

(٣٤) عزیز شەمزینی، سەرچاوەی پێشوو،ل٢١٦.

(٣٥) حوسێنی مەدەنی ،سەرچاوەی پێشوو، ل٧٦ .

(٣٦) کریس کوچیرا ، سمکۆی شکاك وبەریەرەکانی تورکیا وئێران ورووس وئینگلیز ، وەرگێرانی جەمال تەها حسین وعەبدولخالق

محەمەد تاهر،گۆڤاری یەکبون ،ژمارە (١٧) ،نیسانی ٢٠٠١ ، ل٨٣ .

(٣٧) عەلائەدین سەجادی،سەرچاوەی پێشوو، ٢٤٤ .

(٣٨) کریس کوچیرا،سەرچاوەی پێشوو، ل٥٨ .

(٣٩) کریس کوچیرا، سەرچاوەی پێشوو،ل٥٩.

(٤٠) نەوشیروان مستەفائەمین، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٥٦ .

(٤١) حەسەن ئەرفەع، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٠.

(٤٢) حوسێنی مەدەنی،سەرچاوەی پێشوو، ب٢،ل٥٦.

(٤٣) حوسێنی مەدەنی، هەمان سەرچاوە، ل٧٤ .

(٤٤) حەسەن ئەرفەع، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٠.

(٤٥) نەوشیروان مستەفائەمین، سەرچاوەی پێشوو،ل٤٥٦.

(٤٦) کریس کوچیرا ،کورد لە سەدەی نۆزدەوبیست، ل٦٠ .

(٤٧) د.کەمال مەزهەر ئەحمەد: کوردستان لە ساڵەکانی شەری یەکەمی جیهاندا ، چاپخانەی کۆری زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٥، ل٥٨ .

(٤٨) نەوشیروان مستەفا ئەمین،سەرچاوە پێشوو،ل٤٥٢ .

(٤٩) رەفیق حیلمی ،یادداشت،سلیمانی ،٢٠٠٣،ل٣١٠ .

(٥٠) سروه اسعد صابر ،كوردستان من بدايه الحرب العالميه الاولى الى نهايه مشكله الموصل ١٩١٤-١٩٢٦، مؤسسه موكرياني ،اربيل ،٢٠٠١،ل٢٢٠-٢٢١ .

سەرچاوەکان

یەکەم: کتێبەکان

ا- بەزمانی کوردی

(١) بەدرخان سندی ،کۆمەڵگای کوردەواری لە دیدیٰ رۆژهەلآتناسیدا، وەرگێرانی ئیسماعیل ئیبراهیم سەعید،چاپخانەی خانی،دهۆك، ٢٠٠٨ .

(٢) حەسەن ئەرفەع ،کوردەکان، وەرگێرانی حامید گەوهەری، چاپخانی منارە، هەولێر،٢٠٠٧.

(٣). حوسێنی مەدەنی،کوردستان وستراتیژیی دەولەتان، بەرگی دووەم،هەولێر، ٢٠٠١.

(٤) عەلائەدین سەجادی ،شۆرشەکانی کورد وە کۆماری عێراق، تاران،٢٠٠٥.

(٥) عزیز شەمزینی ،جولانەوەی رزگاریی نیشتمانی ی کوردستان ، وەرگێرانی فەرید ئەسەسەرد، سلیمانی، ٢٠٠٦.

(٦) کەمال مەزهەر ئەحمەد، کوردستان لە ساڵەکانی شەری یەکەمی جیهاندا ، چاپخانەی کۆری زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٥.

(٧) کریس کوچێرا ، کورد لە سەدەی نۆزدەو بیست دا،وەرگێرانی حەمە کەریم عارف، سلیمانی ،چاپخانەی شڤان،٢٠٠٤.

(٨) رەفیق حیلمی ،یادداشت،سلیمانی ،٢٠٠٣.

(٩) نەوشیروان مستەفا ئەمین، کوردو عەجەم،چاپخانەی روون ،سلیمانی، ٢٠٠٧.

(١٠) یاسین سەردەشتی ،کوردستانی ئێران لێکۆلینەوەیەکی مێژوویی لە جولانەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی گەلی کورد، سلیمانی، ٢٠٠٣ .

ب- بەزمانی عەرەبی

(١١) ديفيد مكداول، تاريخ الاكراد الحديث، بيروت، ١٩٩٦.

(١٢) سروة اسعد صابر ،كوردستان من بداية الحرب العالمية الاولى الى نهاية مشكلة الموصل ١٩١٤-١٩٢٦، مؤسسة موكرياني ،اربيل ،٢٠٠١.

دووەم: گۆڤارەکان

(١٣) ئاراس عبدالرحمن موستەفا ،شوێنی جوگرافیای کوردستان وبایەخ پێدانی لە لایەن دەولەتە زلهێزەکانەوە،بلاوکراوەی زانکۆی کۆیە ،ژمارە (١) ،کانونی دووەم (٢٠٠٤) .

(١٤) کریس کوچیرا ، سمکۆی شکاك وبەربەرەکانی تورکیا وئیران ورووس وئینگلیز ، وەرگیرانی جەمال تەها حسین وعەبدولخالق

محەمەد تاهر،گۆڤاری یەکبون ،ژمارە (١٧) ،نیسانی ٢٠٠١ .

# هێرشەکانی نادر شا بۆ سەر شاری کەرکوک

بەختیار سەعید محمود شوانی

شاری کەرکوک لە مێژووی خۆیدا توشی چەندین شالآوی هێزی داگیرکاری بۆتەوە، یەکێك لەو شالآوانە شالآوە داگیرکاریەکەی نادرشای ئەفشار[1] بووبۆ سەر شاری کەرکوك لە سەدەی هەژدەدا. لەئەنجامدا ئەم شالآوە کاریگەری نەگێتڤی بۆسەر شاری ناوبراو هەبوو، هەربۆیە لەجێگەی خۆیدایە ئەم بابەتە بەگوێرەی سەرچاوە مێژوویەکان تیشکی بخرێتە سەر.

دوای ئەوەی نادرشا دەسەلآتی خۆی لە ئێراندا جێگیرکرد بە لەشکرێکی گەورەوە رووی کردە عێراق لە پێناو تۆلّە سەندنەوە لە عوسمانیەکان کە لەکاتی داگیرکاری ئەفغانەکاندا هێرشیان کردبووە سەر ئێران. هەربۆیە بریاری دا بەغدا داگیربکات. وە لەکاتی هێرشەکانیدا ناوچە کوردیەکانیش کەوتنە بەر پەلاماری داگیرکاری ناوبراو، لە ئاکامدا بەشێك لە سوپاکەی ناردە سەر کەرکوك بە سەرکردایەتی نێرگزخان بەمەبەستی داگیرکردنی شارەکە. ئەم سوپایە لە سالّی(١٧٣٣ن)دا گەیشتە قەلآی کەرکوك، شایەنی باسە بەشێکی ئەم سوپایە پەلاماری قەرەتەپەو خورماتو و کفری و داقوقیشی دا بەلآم نەیتوانی سەرکەوتووبێ ، هەرچەندە نادر خان دووجار هەولّی گرتنی شاری کەرکوکی دا بەلآم سەرکەوتوو نەبوو، بێجگە لەوەی کە ژمارەیەك خەلّکی کوشت و دەوروبەری شارەکەی وێرانکردو زیانی گەورەی بە بەروبومی کشتوکالّی ناوچەکە گەیاند[2].

هەرچی لەبارەی ئەو زیانانەی کە بەناوچەکە گەیشتووە ،ئەوەتا قەشەیەکی شاری کەرکوك کە خۆی هاوسەردەمی رووداوەکان بووە بۆمان دەگێرێتەوە کە سوپاکەی نادرشا فەسادی و وێرانکاریەکی گەورەیان لەناوچەکە نایەوە، لەئەنجامدا ژمارەیەکی زۆری لەمندالّ وژن و پیاوی کردە غەنیمەی جەنگ وە ژمارەیەکی زۆریشی لە پیاوانی ناوچەکە کوشت بەتایبەتی جولەکەکانی شاری کەرکوك کە دوای بەدیلگرتنیان کوژراون. هەروەها قەشەی ناوبراو لەباسی رووداوەکانی ناوچەکەدا ئاماژە بەوەش دەکات کە خەلّکی شاری کەرکوك خۆراگریان نواندووە و بەتوندی بەرپەرچی هێرشەکانی نادرشایان داوەتەوە[3]. هەروەها مێژوونوسێکی کوردیش لەم بارەیەوە دەلّێت "سەرکردەی سوپای نادرشا نێرگزخان هەر وولآتێکی بهاتایەتە

پێش وێران و تالآنی دەکرد، زوڵم وستەمی ئەم نێرگزخانە لە رادەبەدەر بوو، ژن و منداڵیش لە دەستی دەریازی نەدەبوو، هەربۆیە دەورووبەری کەرکوی وێران کرد"[4].

شایەنی باسە عوسمانیەکان هەڵوێستی توندیان وەرگرت دژی لەشکرکێشی نادرشا بۆ سەر ناوچەکە، سەرەتا هەوڵیان دا بە یارمەتی سوپای کورد بەرلە هەڵمەتی نادرشابگرن بەڵام سەرکەوتوو نەبوون[5].ئەوەتا ئەحمەدپاشا میری کۆیە وهەریر هەوڵیدا لە کەرکوك سوپای هێرشبەر تێکبشکێنێ بەڵام لە ئاکامدا نەك هەر سەرکەوتوو نەبوون بەڵکو خودی ئەحمەدپاشا لەشەرەکاندا کوژرا[6]. هەربۆیە عوسمانیەکان بەمەبەستی یەکلایی کردنەوەی بارودۆخی ناوچەکە، هێزێکیان بە سەرکردایەتی تۆپاڵ عوسمان پاشا ناردە عێراق بۆ لێدانی نادر شا و یارمەتی دانی والی بەغدا، هەروەها عوسمانیەکان دلوایان لەحەسەن پاشای والی موسڵ کرد کە یارمەتی تەواو پێشکەش بەو سوپایە بکات و ملکەچی فرمانەکانی تۆباڵ عوسمان پاشا بێت، دوای ئەوەی نادر شا بەهاتنی هێزی فریادرەسی عوسمانی زانی بۆ ناوچەکە بڕیای دا رووبەرری ببێتەوە، تا لە ئاکامدا کەناری رووباری دجلە لەنزیك سامەرا هەردوو هێزەکە بەیەك گەشتن لە ١٩تموزی ١٧٣٣، شایەنی باسە هێزی عوسمانی لەلایەن میرە کوردەکانەوە یارمەتی درا، لە ئەنجامدا دوای شەرێکی خوێناوی کە نۆ سەعاتی خایاند هێزی نادرشا بەتوندی شکستی خواردو و ژمارەیەکی زۆر لەسوپای ناوبراو کوژرا بەجۆرێك هەندێك لە سەرچاوە مێژوویەکان بە هەزارەها کوژراو دیخەملێنن، بەڵام زیانی سوپای عوسمانی لە چاو سوپای ئێرانی کەمتر بووە، جێگەی ئامازەیە دوای ئەم شکستەی نادر شا بەناچاری ناوچەکەی جێهێشتوو گەرایەوە ئێران[7].

بەڵام ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە دوای سێ مانگ نادرشا توانی سەرلەنوێ لەشکرەکەی رێکبخاتەوەو رووی کردەوە عێراق، کە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر توانای سەربازی لە رادەبەدەری ناوبراو[8]. شایەنی باسە ئەو کات سەربازگەی تۆباڵ عوسمان پاشا لە دەورووبەری کەرکوك بوو لەئاکامدا ٢٥تشرینی یەکەمی (١٧٣٣ز) لە دەشتی لەیلان لە نزیك کەرکوك هەردوو سوپا جارێکی تر بەیەك گەیشتن، هەرچەندە میرنشینە کوردیەکانی وەك سۆران و بابان وبادینان یارمەتی لەشکریان نارد بۆ سوپای عوسمانی، ئەمە سەرەرای یارمەتی هەندێ هێزی کوردستانی باکوور بۆ لەشکری عوسمانی بەڵام تۆباڵ عوسمان پاشا لە شەرەکەدا سەرنەکەوت و تەنانەت لەشکرەکەشی تەفروتونا بوو وە خۆشی لە بەرەی شەردا کوژرا، بەڵام نادرشا نەیتوانی لەم سەرکەوتنە کەڵك وەربگرێت، ئەمەش بەهۆی سەرهەڵدانی هەڵگەرانەوە لە دژی ناوبراو لە ئێراندا، هەربۆیە دوای رێکەوتن لەگەڵ والی بەغدا هەر لەم ساڵەدا نادر شا گەڕاوە ئێران[9].

بەم پێیە دەبینین لە ئەنجامی ئەم شاڵاوەدا چەند شەڕێکی گرنگ لە نێوان سوپای عوسمانی و هێزی نادر شا لە نزیك کەرکوك ڕوویانداوە، ئەمەش بێگومان بۆتە هۆی ئەوەی کە ئەو ناوچەیە زیانی ماددی و کاولکاری زۆری لێبکەوێ، هەروەها شتێکی ئاساییە کەلە ئاکامی ئەم شەرو لەشکرکێشیانەدا خەڵکی ناوچەکە زەرەرمەند بووین.

ئەوەی جێگەی ئاماژەیە کە سەرکردەی عوسمانی تۆپاڵ عوسمان پاشا لەکاتی هاتنی بۆ عێراق بۆ ڕووبەڕووبونەوەی نادرشا، ژمارەیەك لە هێزی میسری لەگەڵ خۆیدا هێنابوو، هەربۆیە ئەم هێزەی میسریەکان توانیان لە شەرەکانی ناوبرلو دژ بە نادرشا ڕۆڵی گرنگ بگێرن، بەتایبەتی لەو شەرانەی لە نزیك کەرکوك ڕویاندا، بێگومان ئەم کارەی سەربازانی میسریش لە سۆنگەی خزمەتکردن بوو بۆ ئاین و دەوڵەتی عوسمانی(١٠).

دوای ئەوەی نادر شا جارێکی تر هاتەوە سەر دەوڵەتی عوسمانی و دەستی بە هێرشکاریەکانی خۆی کردەوە بۆسەر دەوڵەتی ناوبرلو لە ساڵی (١٧٤٣ن)دا ، لە ئەنجامدا ناوچەکە بۆ جارێکی تر کەوتەوە بەر شاڵاوی تاڵان و تێکدان و خراپەکاریەکانی شای ناوبراو، لەم چوارچێوەیەدا جاری دووەم شاری کەرکوك کەوتەوە بەر گەمارۆدان، بەجۆرێك خەڵکی ناو قەڵای کەرکوك بەهۆی بەردەوامی لێدانی تۆپەکانی هێزی نادرشاوە تەواو بێزار بوون هەرچەندە بەرگریکاران بە توندی بەرگریان کرد، بەڵام پاش هەفتەیەك لە گەمارۆدان، ژمارەیەکی زۆر لە بەرگریکاران کوژران وە بەناچاری خۆیان بە دەستەوەدا، دوای دەست بەسەرداگرتنی شارەکە تاڵان و برۆیەکی زۆر لە ناو شارەکەو دەوروبەریدا ئەنجام دران(١١).

لە باسی ڕووداوەکانی ساڵی ناوبرلودا مێژوونوسی ناسراو (ڕەسول کەرکوکلی) باسی ئەوە دەکات کە لە ئەنجامی ئەم داگیرکردنەی شاری کەرکوك لە لایەن نادرشاوە خراپترین چارەنووس بەسەر خەڵکەکەیدا داهات، ئەمەش لەبەر ئەوەی ماڵیان تاڵان کراو و ئافرەتەکانیان ئەتك کران و پیاو و زاناکانیان بەدیل گیران و باج و غەرامەی زۆریان بەسەردا سەپێنرا، تەنانەت ئەو بارودۆخەی بەسەر ئەوان داهات بووە هاندەرێك بۆ خەڵکی بەغدا تاوەکو بە توندی دژی نادر شا بوەستن و بەرگری بکەن و شارەکەیان بەدەستەوە نەدەن(١٢). شایەنی ئاماژە پێکردنە گەریدە نێبۆر کە لە ساڵی (١٧٥٨ن)دا، واتە کە ماوەیەکی زۆر بەسەر ئەم ڕووداوە تێنەپەڕیبوو هاتۆتە ناوچەکە، باسی ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە "لە ئەنجامی ئەم گەمارۆدانەدا (٥٠٠)کەس لە بەرگری کاران کوژران و خەڵکەکەش تۆقین و زۆر خراپ تەنگاوکران"(١٣). هەروەهاگەریدەی ئینگلیزی نیبور کە لە ساڵی (١٧٦٦ن)دا بە کەرکوکدا تێپەڕ بووە دەڵێت: "هیچ نەماوە جگە لە شتێکی کەم نەبێت لە شارە ڕەسەنەکە کە لەسەر گردەکە هەڵکەوتووە کە ئەمیش تووشی ڕۆچوونێکی بەهێز بووە لە خوارەوەی، ئەمەیە

کە پێی دەڵێن قەڵا، نابوتترین شوێن بوو کە تا ئێستا بینیبێتم، خانووەکانی بەبێ جیاکاری لەوپەڕی خراپی دان" [١٤]، جێگەی بەبیر هێنانەوەیە کە گەشتەکەی نیبور دوای چەند ساڵێك دێت لە هێرشە کاولکاریەکانی نادر شا بۆ سەر شاری کەرکوك، لێرەدا بۆمان روون دەبێتەوە کە تەنانەت دوای چەندین ساڵ هێشتا شوێنەواری کاولکاریەکانی نادرشا بەسەر کەرکوکەوە هەردیاربووە.

ئەوەی لێرەدا جێگەی تێڕامانە ئەوەیە کە زۆربەی ئەو هێزانەی ویستویانە شاری بەغداو موسڵ داگیر بکەن بە تایبەتی ئێرانیەکان بە شاری کەرکوکدا تێپەڕیوون [١٥]، ئەمەش بۆتە مایەی ماڵ وێرانی و زەرەرو زیانی گەورە بۆ خەڵکی ئەم شارە، وا دیارە داگیرکردنی شاری کەرکوك لە لایەن نادر شاوە لە چوارچێوەی هەوڵەکانی ناوبراو دەهات بۆ داگیرکردنی بەغدا و موسڵ، بێگومان شوێن و هەڵکەوتەی کەرکوکیش لەم بوارەدا رۆڵی خۆی هەبوو.

پێدەچێت دوای نیوسەدە لە شاڵاوەکانی نادرشا بۆ سەر کەرکوك ئینجا شارەکە کەمێك بووژاوەتەوە، ئەمەش بە گوێرەی گوتەی گەریدەی فارسی (ئەبوو تالیب خان) لە ساڵ (١٧٩٩ن) دا سەردانی شارەکە دەکات و لەبارەیەوە دەڵێت: "کەرکوك شارێکی گەورەیە، بە قەڵایەك توندو بەهێز بووە، خانووەکانیشی کەدەووری قەڵایان داوە لە بەردوو خشتی سوور دروست کراون" [١٦]. شایەنی باسە ئەم گەریدەیەش ئاماژەی بە خراپی خانووەکانی شاری کەرکوك داوە بەڵام نەك بەپلەی ئەو گەریدانەی کەماوەیەکی کەم دوای شاڵاوەکانی نادرشا هاتونەتە ناوچەکە.

سەرچاوەکان

(١) نادر قولی کە دواتر بە نادرشا ناسرا لە ساڵی ١٦٨٨زدا لە خوراسان لە دایك بووە و سەر بە هۆزی ئەفشارە. نادر قولی توانی کۆتایی بە سەردەمی ئەفغانەکان(١٧٢٢-١٧٣٠ن) لە ئێراندا بهێنێت، دواتر لە ساڵی ١٧٣٦زدا خۆی کردە شای ئێران، بەڵام بە هۆی زۆری ئەو شەڕو شۆڕانەی ئەنجامیدا وڵاتی ئێرانی تووشی ئاژاوەو کێشەی زۆر کرد تا لە ساڵی ١٧٤٧زدا کوژرا. (بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: علاء نورس، العراق في العهد العثماني-دراسة في علاقتها السياسية ١٧٠٠-١٨٠٠، (بغداد:١٩٨٩)، ص١٣٧-١٣٨، هەروەها بڕوانە:
Lockhart, L, Nadir shah/ A critical study Based Mainly upon contemporary Sources, (London:١٩٢٨).

(٢) هاممەر(فون هاممەر)، دولت عيمانيه تاريخى، مترجمى: محمد عگا، ج٤، کتەئون بتروسيان مكبعه سى، (استانبول: ١٣٣٠)، ص ٣١٨٨" ستيڤن هيمسلى لۆنگريك، اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث، ت: جعفر الخياط، (بيروت: ٢٠٠٤)، ص١٧٠ ومابعدها"بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: د.عماد عبدالسلام رؤوف،دراسات وثائقية فى تاريخ الكرد الحديث وحضارتهم،الطبعة الاولى،مطبعة الثقافة، (اربيل: ٢٠٠٨)،ص ٨٠ ومابعدها" د.سعدي عثمان حسين، كوردستان الجنوبية في القرنين السابع عشر والثامن عشر/ دراسة في علاقتها الادارية والسياسية والاقتصادية مع ايالتي بغداد والموصل، مطبعة سيما، (السليمانية: ٢٠٠٦)،ص ٣٠٤ ومابعدها.

(٣) بڕوانە: سهيل قاشا، حملات نادرشا على العراق فى الوثائق السريانية، مجلة كاروان، عدد ٧٤، نيسان ١٩٨٩،ص ١٥٦.

(٤) محەمەد ئەمین زەکی، خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان، ئامادەکردنی: رەفیق سالح، بەرگی چوارەم، بەشی یەکەم ، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، (هەولێر: ٢٠٠٦)،ل ١٥٣.

(٥) مجموعة من المستشرقين،الكورد في دائرة المعارف الاسلامية،ت:حميد رێبوار،منشورات رابطة كاوا ، مطبعة اوفيست هەولێر، (اربيل:١٩٩٩)،ص٧٦.

(٦) محەمەد ئەمین زەکی، سەرچاوەی پێشوو،ل ١٥٣.

(٧) بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: ستيڤن هيمسلى لۆنگريك، المصدر السابق،ص ١٧٥-١٧٧" د.عماد عبدالسلام رؤوف،المصدر السابق،ص٨٢" د.سعدي عثمان حسين، المصدر السابق،ص ٣٠٧-٣٠٨.

(٨) بڕوانە: ستيڤن هيمسلى لۆنگريك، المصدر السابق،ص١٧٨.

(٩) یاسین بن خیر الله العمري، زبدة الاثار الجلية في الحوادث الارضية، حققه وعلق عليه: د.عماد عبدالسلام رؤوف، مطبعة الاداب، (النجف الاشرف: ١٩٧٤)، ص٨٩ ومابعدها، بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: علي شاكر علي، تاريخ العراق في العهد العثماني(١٦٣٨-١٧٥٠م) دراسة في أحواله السياسية، ط١، مطبعة اوفسيت الشعب، (نينوى: ١٩٨٥)، ص١٨٧ومابعدها" مجموعة من المستشرقين، المصدر السابق، ص٧٦" ستيڤن هيمسلی لۆنگریك، المصدر السابق،ص١٧٨-١٧٩" محەمەد ئەمین زەكی، سەرچاوەی پێشوو،ل١٥٢-١٥٤" د.سعدی عيمان حسين، المصدر السابق،ص ٣٠٩-٣١٠.

(١٠) د.عماد عبدالسلام رؤوف،المصدر السابق،ص ٨٣" سهيل قاشا، المصدر السابق،ص ١٥٨.

(١١) ياسين خيرالله العمري الخطيب الموصلي، غاية المرام في تاريخ محاسن بغداد دار السلام، مطبعة دار البصري، (بغداد: ١٩٦٨)، ص١٨١-١٨٢" محمد امين زكي، سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٤-١٥٥" محمدامين العمري، منهل الاولياء ومشرب الاصفياء من سادات الموصل الحدباء، حققه ونشره: سعيد الديوه جي، ج١، مطبعة الجمهورية، (الموصل: ١٩٦٨)،ص١٥٠.

(١٢) رسول حاوي الكركوكلي، دوحة الوزراء في تاريخ وقائع بغداد الزوراء، ت: موسى كاظم نورس، مطبعة كرم، (بيروت: دون التاريخ)، ص٥٠.

(١٣)گەشتی دكتۆر نێڤز بە كوردستاندا لە ساڵی (١٧٥٨ز)، وەرگێڕان و پەراوێز نووسین: دكتۆر سەعدی عوسمان، گۆڤاری مەتین، ژ(١١٩)، (دهۆك: ٢٠٠١)، ل١١.

(١٤) كارستن نيبور، رحلة نيبور إلى العراق في القرن الثامن العشر، ت: د.محمود حسين الامين، مراجعة وتعليق ووضع الحاشية: سالم الآلوسي، (بغداد: ١٩٦٥)، ص٨٥.

(١٥) دوای داگیركردنی بەغدا لە لایەن شاعەباسی سەفەویەوە لە ٢٨ی تشرینی دووەمی ١٦٢٣ز ناوچەكە بە گشتی و كوردستان بە تایبەتی ڕووبەڕووی چەندین شاڵاوی گەورەی عوسمانیەكان بووەوە بە مەبەستی گرتنەوەی بەغدا، بە تایبەتی سێ شاڵاوەكەی حافز پاشا و خەسرۆ پاشاو سوڵتان مرادی چوارەمی عوسمانی. ئەم شاڵاوانە كاریگەری گەورەیان بەسەر ناوچە كوردیەكان و كەركوكەوە هەبوو و لە ئاكامدا ناوچەكە ڕووبەڕووی زیان و كاولكاری بوەوە. بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: د.سعدی عيمان، المصدر السابق، ص٢٨١ومابعدها.

(١٦) بڕوانە: ابي طالب خان، رحلة ابي طالب خان إلى العراق واوربە ١٣١٣/١٧٩٩، ت: د.جواد مصطفى، (بغداد)، ص٣٦٢-٣٦٣.

# هاڤیبوون
# بەخششی بەردەوام و ناوەرۆکی چالاک

ئیسماعیل تەنیا- ئەڵمانیا

بەگوێرەی بوون و ئاستی چەندایەتی و چۆنایەتی ڕەوەندی کورد لە وڵاتە جۆراوجۆرەکانی دنیادا، بە دەیان ڕێکخراو و کۆمەڵە و ناوەند و گۆڤار و ڕۆژنامە دامەزراون، و درێژەیان بە کار و چالاکیەکانیان داوە... کرۆك و ئامانجی هەمووشیان خزمەتکردن بووە بە مێژوو و کەلتووری کوردی، و کێشە ڕەواکەی. هەریەکەو لە تێڕوانینی خۆیەوە هەوڵیداوە شتێك بە شتێك بکات. هەندێ: لەو دامو دەزگا و سەنتەرانە، بە حوکمی نەبوونی توانای مادی و مرۆیی و فیکرییەوە، نەیانتوانیوە بەردەوام بن و درێژە بە خەباتەکەیان بدەن، زوو بە زوو لە بەرچاوان ونبوون. هەندێکیش لەوانە بەهۆی لێهاتوویی و ئارامگرتن و سوور بوون لەسەر درێژەپێدان، توانیوویانە تا ڕۆژی ئەمڕۆ بەردەوام بن، و خەرمانەکە بە بەرەکەتتر بکەن.

یەکێك لەو ناوەندە چالاك و پڕ لە بەخششە، کە ڕۆڵێکی ئەکتیڤی هەیە لە ناساندن و بەرچاوڕوونکردنی کوردان لە دەرەوەی وڵات "ناوەندی هاڤیبوون بۆ لێکۆڵینەوە و بڵاوکردنەوەی کوردی– بەرلین)ە.

بەگوێرەی ئەو زانیارییانەی لە بەردەستی ئێمەدان، و بۆ بەسەرکردنەوەی ئەو ناوەندە توانیوومانە سوودی لێوەربگرین، سەرەتا بە هەوڵ و کۆششی چەند خوێندکارێکی کورد لە زانکۆی (ئازادی) بەرلین، لە هاوینی ساڵی (١٩٩٠)دا، توانیوویانە گرووپێکی کوردی لەو خوێندکارە کوردانە پێکبهێنن، کە لەو زانکۆیەدا دەیانخوێند. پاش چەند دانیشتن و کۆبوونەوەیەك توانیوویانە (گرووپی کاری کوردستانی – Kurdistan -AG) رابگەیەنن.

ئەو گرووپە لە ساڵی (١٩٩٢)دا، زۆر هەوڵیانداوە کار و چالاکیەکانیان فراوانتر بکەن و (ئینستیتوتەکی کوردۆلۆژی) لە زانکۆی ناوبراو دابمەزرێنن، بەڵام لەبەر فشاری دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان لە لایەك و پاراستنی بەرژەوەندییەکانی زانکۆ لە لایەکی ترەوە، ڕووبەڕووی ڕەفزکردن بوونەتەوە. بەتایبەتیش دەوڵەتی تورکیا زۆر هەوڵیداوە بەرپرسانی زانکۆ ڕازی بکەن کە ڕەزامەند نەبێت لە پێدانی مۆڵەت بەو گرووپە، ئەوانە لە هەوڵەکانیشیاندا سەرکەوتوو بوون. لەگەڵ وەرگرتنی ئەو ڕەفزەش، هەندێ: لە بەرپرسانی زانکۆ ڕێگەیان

بەو خوێندکارانە نیشانداوە و پێیانگوتوون: (ئەگەر لە سەرەتادا ئێوە بتوانن چەند سیمینارێك رێکبخەن، و تێدا سەرکەوتووبن، ئەوە دەبێتە رێخۆشکەرێك بۆ هاتنەدی خواستەکانتان).

شایانی گوتنە، لەو کاتەدا، ژمارەی سەرجەم خوێندکارەکانی ئەو زانکۆیە خۆی لە شەست و پێنج هەزارێك دەدا، بۆ بەختیاری ئەو گروپە یەکێك لە ئەندامەکانی، سەرۆکی (دەزگای خوێندکارانی زانکۆ) بووە، و رۆڵێکی چالاکی بینیووە، و پشتگیری لە بەئەنجامگەیاندنی پرۆژەکە کردووە.

هەر لەو کاتەدا، گروپێکی کاری کوردۆلۆژی لە زانکۆی (هامبۆرگ) هەبووە، و لە ئەنجامی پەیوەندیکردن و را گۆڕینەوەدا توانیوویانە یارمەتی گروپەکەی بەرلین بدەن، و بە هاوکاری ئەوان ریزە سیمینارێك لەسەر دۆز و کەلتووری کوردی لە هاوینی (١٩٩٣)دا، لە زانکۆی بەرلین سازکردووە. بابەتەکانی ئەو سیمینارانە، لە کتێبی جیا جیاو سەربەخۆدا، بە زمانی ئەڵمانی چاپکراون و دەنگدانەوەیەکی باشیان پەیدا کردووە.

لەمە بەدواوە، بەهۆی هەوڵە بەردەوامەکانی ئەو گروپە کوردییەوە، سەرۆکایەتی زانکۆ لە سەرەتای ساڵی (١٩٩٥)دا، رەزامەندبووە لەسەر داواکانیان. لە وەرزی خوێندنی (هاوینی ١٩٩٥ و زستانی ١٩٩٥ و ١٩٩٦)دا، بە هاوکاری لەگەڵ (بەشی ئیتنۆلۆگی) زانکۆ، چەند سیمینارێکی کوردۆلۆژییان رێکخستووە، و زانکۆش هەموو مەسرەفەکانی گرتۆتە ئەستۆی خۆی. بۆ ئەم سیمینارانەش دەیان پسپۆڕ و شارەزا و کوردناسیان، لە وڵاتە جۆربەجۆرەکانەوە، بانگهێشت کردووە.

لە ساڵی (١٩٩٨)دا، سەرۆکایەتی زانکۆ، خەڵاتی (مارگەریتا فۆن برینتانۆ)ی دایە گروپی ناوبراو، کە بریتی بوو لە بیست هەزار مارکی ئەڵمانی.

لە رۆژانی (٢٩- ٣١/ گوڵانی ١٩٩٨)دا، بەهاوکاری و پارەی سەرۆکایەتی زانکۆ، توانیوویانە گەورەترین کۆنگرەی کوردولۆژی لە ئەوروپا رێکبخەن، هەژدە پسپۆری کوردۆلۆژی لە وڵاتانی جیهاندا بەشدار و بانگهێشت بکەن.

پاش ئەو کۆنگرە یە و دانوستاندنی بەردەوام، سەرۆکایەتی زانکۆ بڕیاریدا دوو کەس لەو گروپە، بۆ ماوەی دوو ساڵ لە زانکۆدا دابمەزرێنن، تا هەوڵبدەن (ئینستیتوتەکی کوردۆلۆژی) دانمەزرێنن. دەزگاکە دامەزرا و شوێنەکەشی بریتی بوو لە دوو ژوور. پاش پێنج مانگ توانیان کتێبخانەیەك بۆ ناوەندەکە بکەنەوە.

لە رۆژانی ٢٣- ٢٥/٩/ ٢٠٠٠ دا، لە شاری (کاتسوف) کۆنگرەی (لێکۆڵینەوە لەسەر ژنانی کورد)یان سازکردووە، دواتر بابەتە پێشکەشکراوەکان، بە زمانی ئەڵمانی لە دوو کتێبدا، وەك زنجیرەی بڵاوکراوەکانی (کوردۆلۆژی)، بڵاوکرانەوە.

هەر لە سەرەتادا، چەندین ناوەند و مامۆستای زانکۆ، دژایەتی ئەو ناوەندەیان دەکرد، بۆیە ناوەندەکە ناچارو لەگەڵ (ئینستیتوتی ئێرانستیك)دا پێکەوە کار بکەن. (ئینستیوتی ئێرانستیك) هەوڵیدەدا تەواوی گروپی کوردی کۆنترۆڵ بکات و چالاکیەکانیان سنووردار بکات، و بۆ بەرژەوەندی ئێران بەکاریان بهێنێت. تا ئەو ئاستەی ئامادە نەبوون ناوی پرۆژەکەش بە (لێکۆڵینەوەی کوردی) بهێننەوە. بۆیە ئەو دوو کەسە کۆتاییان بە چالاکیەکانیان لەگەڵ ناوەندی ناوبراو هێنا، و لێی دوورکەوتنەوە. بەهۆی ئەو دژایەتیکردنە و گۆڕانکاری لە سەرۆکایەتی زانکۆی بەرلین لەو کاتەدا، زیانێکی گەورە بەر پرۆژەی کوردۆلۆژی کەوت.

لە کۆتایی ساڵی (٢٠٠١)دا، بە فەرمی (ناوەندی هاڤیبوون بۆ لێکۆڵینەوە و بڵاوکردنەوەی کوردی) لەلایەن (عەبدولڕەحمان مزوری و موحسین ئۆسمان و سالمێ جاسم) و، بە ڕاوێژکاری (د. فەرهاد ئیبراهیم)، دامەزرا. کە تا ئێستا بەردەوامە و توانیویانە چەندان سیمینار و کۆنگرەی گرنگ لەسەر پرسەکانی (کەلتوور، ژن، شانۆ، زمان، مێژوو) ساز بکەن، و تا سەرەتای ساڵی (٢٠٠٨)یش توانیویانە (٤٨) کتێبی جۆراو جۆربە زمانەکانی کوردی و عەرەبی و ئەڵمانی بڵاوبکەنەوە. لەپاڵ ئەو چالاکیانەشدا تا هاوینی (٢٠٠٨) توانیویانە (٢١) ژمارە لە گۆڤاری (هاڤیبوون)، و (٢) ژمارە لە گۆڤاری (کوردناسی)، کە گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕانی لێکۆڵینەوەکانی بابەتی کوردۆلۆژی بۆ سەر زمانی کوردی، و (٢) ژمارە لە گۆڤ اری (پێڵ) گۆڤاری نووسەرانی کورد- ڕۆژئاوی کوردستان لە دەرەوەی وڵات، چاپ بکەن.

## گۆڤاری (هاڤیبوون)

ئەو گۆڤارە هەروەك لە پێناسەکەیدا دیارە، گۆڤارێکی تایبەتە بە لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی، و شوێنێکی بەرچاوی هەیە لە بزاڤی ڕۆژنامەگەری کوردیدا. جگە لە دەستەی بەڕێوەبەر و ستافە هەمیشەییەکەی، چەندان پسپۆڕ و خاوەن بڕوانامەی ئەکادیمی پشتگیری لێدەکەن، و بابەتەکانیان لەو گۆڤارەدا بڵاودەکەنەوە. یەکەم ژمارەی لە هاوینی ١٩٩٧دا بە (١٣٢) لاپەڕەی قەبارە (٢٠,٥×١٤,٥) سم، بە زمانی کوردی (کۆمانجی خوار و ژوورو- ڕێنووسی ئارامی) دەرچووە. لە پێناسەکەیدا هاتووە: (گۆڤارەکا ڕەوشەنبیری گشتییە ژ پرۆژێ کوردۆلۆگێی سەر ب Kurdistan AG, Ast A FU ل زانکۆی ئازادا بەرلین دەردکەڤیت).

سەرنڤیسەر: سالمێ جاسم.

دەستەکا نڤیسەرا: کەریمێ بیابانی، موحسین ئۆسمان، نەجیب باڵایی.

دەرهێنانی هونەری: گوهدار سەلاحەدین.

### مانای (هاڤیبوون)

خوالێخۆشبوو (هەژار موکریانی) لە لاپەڕە (٤٠)ی فەرهەنگی "هەمبانە بۆرینە- یەك بەرگی"دا، ژاپی یەکەم، تاران، ١٣٦٩، دەڵێت: (هاڤی: نامۆ، غەوارە، بێگانە، غەریبە). کەواتە: (هاڤیبوون) بەمانای (نامۆبوون، ئاوارەبوون، بێگانەبوون) دێت.

### قەبارە و کاتی دەرچوونی

هەموو ژمارەکانی لە کاتی دیاریکراودا دەرنەچوونە، ژمارەی لاپەڕە و قەبارەکەشیان چەسپاو و نەگۆڕ نەبووە. لەبەرگەلێك هۆکار نەتوانراوە مانگانە یان وەرزانە ژمارەیەکی لێ بڵاوبکرێتەوە. جیاوازییەکی زۆر لەنێوان کاتی ژمارە بڵاوکراوەکان دەبینرێت. بۆ نموونە لە ساڵی (١٩٩٧)دا تەنها یەك ژمارە دەرچووە. لە ساڵی (١٩٩٩)دا دوو ژمارە دەرچووە. لە ساڵی (٢٠٠٠) دوو ژمارە لە یەك بەرگ، و (٢٠٠١) یەك ژمارە دەرچووە. ساڵی (٢٠٠٦)یش هیچ ژمارەیەکی لێ دەرنەچووە. دەتوانین کاتی دەرچوونی هاڤیبوون بەشێوەیەکی نارێك وەسف بکەین.

بۆ کارئاسانی و بەرچاوڕوونی ئەو کەسانەی دەیانەوێ لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو گۆڤارە بکەن، وا لە خوارەوە ئەو زانیارییانە دەخەینەڕوو:

- ژمارە (١)، ١٣٢ لاپەڕە، قەبارە (٢٠،٥×١٤،٥) سم، لە هاوینی١٩٩٧ دا دەرچووە.
- ژمارە (٢، ٣)ی جمکانە، ٢٨٠ لاپەڕە، قەبارەی پێشوو، لە ساڵی ١٩٩٨دا دەرچووە.
- ژمارە (٤)، ٢٠٨ لاپەڕە، هەمان قەبارەی پێشوو، ساڵی ١٩٩٨ دەرچووە.
- ژمارە (٥)، ٢٢٤ لاپەڕە، هەمان قەبارەی پێشوو، ساڵی ١٩٩ دەرچووە،
- ژمارە (٦) ٢٤٠ لاپەڕە، هەمان قەبارەی پێشوو، ساڵی ١٩٩٩ دەرچووە.
- ژمارە (٧، ٨)ی جمکانە، ٢٨٨ لاپەڕە، هەمان قەبارەی پێشوو، ساڵی ٢٠٠٠ دەرچووە.
- ژمارە (٩)، ٢٤٠ لاپەڕە، هەمان قەبارەی پێشوو، ساڵی ٢٠٠١ دەرچووە.
- ژمارە (١٠)، ٢٤٠ لاپەڕە، هەمان قەبارەی پێشوو، ساڵی ٢٠٠٢ دەرچووە.
- ژمارە (١١)، ٢٧٢ لاپەڕە، هەمان قەبارەی پێشوو، ساڵی ٢٠٠٢ دەرچووە.
- ژمارە (١٢، ١٣)ی جمکانە، (٣٣٦) لاپەڕە، هەمان قەبارەی پێشوو، لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠٢ و سەرەتای ساڵی ٢٠٠٣ دەرچووە.
- ژمارە (١٤)، ٢٤٨ لاپەڕە، هەمان قەبارەی پێشوو، ساڵی ٢٠٠٣ دەرچووە.

- ژمارە (١٥)، ٢٤٠ لاپەرە، هەمان قەبارەی پێشوو، ساڵی ٢٠٠٤ دەرچووە.
- ژمارە (١٦، ١٧)ی جمکانە، ٣٦٠ لاپەرە، هەمان قەبارەی پێشوو، ساڵی ٢٠٠٥ دەرچووە.
- ژمارە (١٨)، ١٨٦ لاپەرە، قەبارە (١٦×٢٤سم)، ساڵی ٢٠٠٧، دەرچووە.
- ژمارە (١٩، ٢٠)ی جمکانە، ٣٢٠ لاپەرە، قەبارە (١٦×٢٤سم)، ساڵی ٢٠٠٨ دەرچووە.
- ژمارە (٢١)، ٢٢٤ لاپەرە، قەبارە، (١٧,٥×٢٤سم)، ساڵی ٢٠٠٨ دەرچووە.

دەستەی بەڕێوەبەر

لە ڕووی کاردابەشکردن و سەرپەرشتکارانی (هاڤیبوون)ەوە، لە هەموو ژمارەکاندا یەك کڵێشە نابینرێت. لە ژمارە (١)دا (سالمێ جاسم) سەرنووسەر، (کەریمێ بیابانی و موحسین ئۆسمان و نەجیب باڵایی) دەستەی نووسەران، و (گوهدار سەلاحەدین) دەرهێنەری هونەری، بووینە.

لە ژمارە (٢، ٣)دا، سەرنووسەر وەك خۆی ماوەتەوە، و بەڕێوەبەری نووسینی بۆ زیادکراوە، و (کەریمێ بیابانی بۆتە بەڕێوەبەری نووسین. (عەبدولڕەحمان مزووری و سیامەند حاجۆ)ش بۆ دەستەی نووسەران زیادکراون.

لە (٤) دا، سەرنووسەر و بەڕێوەبەری نووسین وەك خۆیان ماونەتەوە. دەستەی نووسەران نەماوە. (بەڕێوەبەر) زیادکراوە و بە (موحسین ئۆسمان سپێردراوە).

لە ژمارەکانی (٥) و (٦) و (٧،٨) دا، هەمان کاردابەشکردنەکەی ژمارە (٤) دووبارە بۆتەوە.

لە ژمارە (٩)دا پرۆژەی گۆڤاەکە بۆتە پرۆژەی هاوبەشی (پرۆژەی کوردۆلۆژی زانکۆی بەرلین و ماڵی شەرەفخانی بەدلیسی لە هەولێر).

دەربارەی ئامانجی ئەو پرۆژە هاوبەشە لە سەرگوتای ژمارە (٩)دا هاتووە:

"کۆڤارا مە ژی (هاڤیبوون)، کو هەتا نها ل بەرلینێ چاپ دبوو ژ دەڤەری وەلاتی بەلاڤ دبوو، دخوازیت ژ ڤێ ژمارێ -٩- پێڤە ل کوردستانێ ژی چاپ ببیت و ب بەرفرەهی ل هەمی جها بێتە بەلافکرن، چونکی بەری نهو یەك ژ ئارێشێن مەگەهاندنا کۆڤارێ بوو بۆ کوردستانێ و رەنگە دابرینەك د ناڤبەرا مەو خواندەڤانێت د ناڤی وەلاتیدا بوو، لێ ب چاپبوونا (هاڤیبوون)ێ ل کوردستانێ د ئەڤ ئاریشە چارەسەر بیت ودێ گەهیتە بەردەستێ هەمی خواندەڤانان.

(هاڤیبوون)دێ بزاڤێ کەت پرەکێ د ناڤبەرا نڤیسەر و خواندەڤاناندا چێکەت، ل کوردستانێ ب هەردوو پارچێن خوڤە دگەل دەڤەری وەلاتی ژی پەیدا بکەت". (ژمارە -٩- لاپەرە ٤- ٥)

ئەم پرۆژەیە تا ژمارە (١٢، ١٣) بە هاوبەشی ماوەتەوە. لە ژمارە هاوبەشەکاندا (د. فەرهاد پیرباڵ) بۆتە خاوەن ئیمتیاز، و (سالمێ جاسم) بۆتە سەرنووسەر، و (موحسین ئۆسمان)یش بۆتە (بەڕێوەبەر)ی گۆڤارەکە.

لە ژمارە (١٤) دا، پرۆژە هاوبەشەکە نەماوە، و (سالمێ جاسم) بە سەرنووسەری، و (موحسین ئۆسمان)یش بە (بەڕێوەبەری نووسین) ماونەتەوە. (عەدنان شینۆ)ش بەڕێوەبەری هونەری بووە.

لە ژمارەکانی (١٥) و (١٦، ١٧) دا، هەمان دەستی ژمارە (١٤) دووبارە بۆتەوە.

لە ژمارە (١٨) دا، قەبارەی گۆڤارەکە گۆڕاوە، و خاوەنی ئیمتیاز بۆتە (عەبدولڕەحمان نەقشبەندی).

لە ژمارە (١٩، ٢٠) دا، سەرنووسەر و خاوەن ئیمتیاز و بەڕێوەبەری نووسین وەك خۆیان ماونەتەوە و بەشی (سەرپەرشتی گشتی) بۆ زیادکراوە و بە (عەبدولڕەحمان مزوری) سپێردراوە. هەروەها (د. فەرهاد ئیبراهیم و د. سەلاح هرۆری و د. فەرسەت مەرعی) وەك بەشی سەرپەرشتکاری ئەکادیمی بۆ زیادکراوە. هەمان کاردابەشکردن لە ژمارە (٢١)یشدا دووبارە بۆتەوە.

بابەتە بڵاوکراوەکان (بە ژمارە)

لەگەڵ ئەوەی گۆڤاری (هاڤیبوون) بە گۆڤارێکی ئەکادیمی ناسراوە، لە ژمارە سەرەتاییەکاندا چەند دەقی شیعر و چیرۆکیشی بڵاوکردۆتەوە. ئەو حاڵە تا ژمارە (٦) دەبینرێت. لەمە بەدواوە، هیچ دەقێکی شیعر و چیرۆکی بڵاونەکردۆتەوە وقورسایی خۆی خستۆتە سەر بڵاوکردنەوەی (لێکۆڵینەوەی زانستی)، کە هەندێك لەو لێکۆڵینەوانە بابەتی کتێب بوونە، و بە دوو سێ بەش بڵاوکراونەتەوە.

بۆ زانیاری زیاتر، تەواوی بابەتە بڵاوکراوەکان پۆلێن دەکەین :

- ١٦٧ لێکۆڵینەوەی زانستی (بە نووسین و وەرگێرانەوە).
- ٧٣ گووتار.
- ١٧ بابەتی تایبەت بە خستنەڕووی کتێب و خوێندنەوە.
- ١٥ دیدار و دیمانە لەگەڵ کەسایەتیە کۆمەڵایەتی و ئەکایمی و ئەدەبیەکان.
- ١٠ هەواڵی جۆر بەجۆر.
- ٨ شیعر.
- ٨ چیرۆك.
- ٧ ریکلام و ئاگاداری و نامە.
- ٦ گووتاری بیرەوەری ئامێز.
- ٤ ریپۆرتاژ.

- ٣ ڕەخنەی ئەدەبی.
- یەك نامە. (نامەی ئەیری حەسەن پور بۆ گۆڤارەکە).

هەمووی بەسەر یەکەوە (٣١٩) بابەت و ناونیشانی بڵاوکردۆتەوە، کە لێکۆڵینەوە بەشی شێری بەرکەوتووە، ڕێژەی (٥٢,٣٥٪)ی ناونیشانە بڵاوکراوەکانی داگیرکردووە. جگە لەو بابەتانە، لە ژمارە( ١٠) بادولوە وەك پاشکۆیەك، (٦١) بەڵگەنامەی بڵاوکردۆتەوە، کە نەجاتی عەبدوڵا لە پاریسەوە ئامادەی کردوون.

نووسەرەکانی (هاڤیبوون)

لە (٢١) ژمارەی (هاڤیبوون)دا بە دەیان نووسەر و پسپۆری شارەزای کورد و بێگانە لە زۆربەی وڵاتانی جیهانەوە، بابەت و لێکۆڵینەوەیان بڵاوکردۆتەوە. ڕێژەیەکی کەم بەناوی خوازراوەوەیە، هۆکای سەرەکیش ئەوەبوو وا ڕێکەتووە نووسەرێك دوو بابەتی لە یەك ژمارەدا هەبێت. بۆیە ناچار بووین پەنا بۆناوی خوازراو بەن. زۆرترین بابەت بەناو ئیمزاری (هاڤیبوون)ەوەیە کە (٢٢) بابەتە، بڵاوکراوەتەوە، کە دیارە زۆربەی ئەو بابەتانەش لە سەرگووتار خۆیان دەبیننەوە، ئەو کەسانە نووسیوویانە کە لە گۆڤارەکەدا کاریان کردووە.

نووسەرەکنی بابەتەکانی (هاڤیبوون) و نووسینەکانیان لە چەند گروپێکدا پۆلین دەکەین:

- گروپی یەك بابەتی ك ئەو نووسەرانەن کە تەنها یەك بابەتیان لەو (٢١) ژماریەدا بڵاوکردۆتەوە. ئەوانیش بریتین لە: (سیامەند حاجۆ، ش. لیرسینێڤیسکی، موحسین قۆچان، شکری شەهباد، نزار محەمەد سەعید، نەجیب باڵایی، مەجیدی حەسۆ، جوتیار بامەڕنی، د. سیابەگ میران، د. نەلیدا فۆگارۆ، د. گونتەر بێرند، موحسین ئەحمەد عومەر، شێرکۆ بێکەس، هزرڤان، جانکورد، د، عەباس وەلی، ئەشیروان مستەفا، د. مارف خەزنەدار، سەرفراز نەقشبەندی، م. مەلا ئەحمەد، د. محەمەد موکری، محەمەد فەریق حەسەن، عەبدوڵا جوندی، ڕ. ه، ئەحمەد بەر بەر، د. بورهان یاسین، میرهەم یگت، عومەر شێخ موس، د. یوسف زەنگەنە، سەبیحا، د. فەرهاد پیربال، سەیوان، سەلاح قادر، ڕۆژان حازم، د. ئیسماعیل شوکر زانا خەلیل، فەتحوڵا حوسێن، گوشاد حەمە سەعید، قادر ڕەشید "ئەبو شوان"، د. ئەفراسیاو هەورامی، عەبدولمونمین دەشتی، بەدرخان عەلی، پێشڕەوی سەید ئیبراهیم، عەمەریێ تۆڤی، خەلیل دهۆکی، د. جەبار قادر، ئومێد تەها، فوئاد سەدیق، د. هەژار مەعروف، کەرەڤان ئامێدی، د. عەبدال نوری، جەلال مستەفا ، موحسین عەبدولڕەحمان، بورهان هەژار، د. فازیل عەمەر، غەیاسەدین نەقشبەندی، د. کریستۆفەر ئونگەر، ڕەزو، غەفوری میرزا کەریم، عەبدولغەنی کاکۆ، محەمەد عەلی یونس، د. ئەحمەد مەلا، شیرالی ئەحمەد، ئەدیب چەلکی، سەلاح سەلیم سەیدۆك، عەبدوڵا سەراج، نەوزراد هروری، محەمەد ژلری، سەدیق سالح، د. ئازاد شێخانی، سالح محەمەد ئەمین، عەلی مەحمود محەمەد، عەبدوڵا دارتاش، حەمەجەزا سالح، جوتیار تۆفیق هەورامی، سدقی هروری،

فەیسەڵ داغلی، د. ئازاد ئەمین باخەوان، د. لەیلا جەلیل عەباس، فەیسەڵ مستەفا، سەلیم بچووک، مستەفا ڕشید، سەدیق سنداڤی، سەرفراز نەقشبەندی، سەعید ئۆسمان، مەسعود خالید گولی).

- گرووپی دوو بابەتی: بریتین لە (موحسین کارتاڵ، سیروان حەجی بەرکۆ، یاسین بانیخێڵانی، هەژار عەزیز سورمێ، حەمە سەعید حەسەن، کەچا کورد، تیمۆرێ خەلیل، حەمەنوری عومەر کاکی، حەجی جەعفەر، نەوزاد جەمال، غازی حەسەن، جەزا چنگیانی، ئامەدگرسیس، روهات ئالاکوم، د. عیزەدین مستەفا ڕەسول، زاگرۆس ئاگرخوین. عەبدوڵا ئۆزژێن "ئەڤدلا درێژ"، د. کەمال فوئاد، محەمەد ساڵح ئامێدی، زەین عابدین خان، هۆشەنگ بروکا).
- گرووپی سێ بابەتی: بریتین لە (عەلی جەعفەر، حەیدەرێ ئۆمەر، خەسەرەو پیربال، پەروێز جیهانی، شاخەوان شۆڕش، عەبدولڕەحمان نەقشبەندی، د. زەردەشت حاجۆ، فەرسەت ڕۆژبەیانی، کەریمێ بیابانی، محەمەد ئەمین پێنجوێنی، فەهمی بالایی، شێرزاد هەینی، تەلعەت تاهیر).
- گرووپی چوار بابەتی: بریتین لە (کونێ ڕەش، فاتح ڕەسول، د. نوری تاڵەبانی، د. فەرهاد ئیبراهیم).
- گرووپی پێنج بابەتی: بریتین لە (کاکشار ئورەمار، د. ئەمیری حەسەن پوور، حازمێ جاسم).
- گرووپی شەش بابەتی: بریتین لە نوسەران (د. سەروەر عەبدوڵا و جەمال خەزنەدار).
- گرووپی حەوت بابەتی: بریتین لە نووسەران (د. جەلیلێ جەلیل و سەعید دێرەشی).
- گرووپی هەشت بابەتی: تەنها (سالمێ جاسم).
- گرووپی یازدە بابەتی: بریتین لە نووسەران (عەبدولڕەحمان مزوری و زۆرابێ بودی).
- گرووپی دوازدە بابەتی: تەنها (موحسین ئۆسمان).
- گرووپی شادە با بەتی: تەنها (نەجاتی عەبدوڵا).

ڕاوێژکارەکان

بابەت و لێکۆڵینەوەی زانستی کە لە (هاڤیبوون)دا بڵاوکراونەتەوە، پێویستیان بە سەرنج و بۆچوونی خەڵکی پسپۆڕ هەبووە، هەربۆش گۆڤارەکە لە دەرەوەی ستافی کارەوە، چەند ڕاوێژکارێکی بۆ خۆی دەستنیشان کردووە. ئەو ڕاوێژکارانە پشتگیرییان لێکردووە، بە سەرنجەکانیان گۆڤارەکەیان دەوڵەمەندتر کردووە.

لە ژمارە چوارەوە، کۆمەڵێك ناو وەك گرووپی پشتگیریکردنی گۆڤارەکە دەبینرێت. لە ژمارە (١٤)دا و بە دواوە، ئەو گرووپە پشتگیریکار و ڕاوێژکارە نەماون.

ئەوکەسانەی کە لە ژمارەکانی (٤) تا (١٣) ناویان لەو بەشەدا هاتووە و لەسەر گۆڤارەکە نووسراون، بریتین لە: (د. ئەمیری حەسەن پوور، د. ئۆردیخانی جەلیل، د. بورهان یاسین، د. جەلیلی جەلیل، د. سیابەگ مگارۆیان، م. عەبدولڕەحمان مزوری، عومەر شێخ موس، د. فەرهاد ئیبراهیم، د. مەمۆ عوسمان، د.

ئەزەند بەگی خانی، د. نوری تاڵەبانی، د. یوسف زەنگەنە، دڵشاد سەعید، د. محەمەد موکری، د. زۆرابی بودی، شارەزاد موجاب، د. سەروەر عەبدوڵا، د. ئەحمەدی مەلا، جەمال خەزنەدار، د. دلێر شاوەیش، ئەجدەت ئاکرەیی، د. عارف حیتۆ، د. عەبدوڵا ئاگرین، عزەت فندی، د. مارف عومەر گوڵ، د. مۆفەق دەرگەڵەیی).

ئەو ناوانە لە هەموو ژمارەکاندا دووبارە نابنەوە، و جاروبار ناوێك نەماوە، و ناوێکی تر هاتۆتە جێگای، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی ئەو کەسە ناو هاتووانە، نویان وەك پشتگیری و ڕاوێژکار، لەو چەند ژمارەیەدا هاتووە.

## هەندێك وورده زانیاری تر

١- ژمارەکانی (٩، و ١٠، ١١، ١٢، ١٣)، بە هاوبەشی لەگەڵ ماڵی شەرەفخانی بەدلیسی لە هەولێر دەرچووە.

٢- لە ژمارە (١- ١٧) بە قەبارەی (٢٠,٥×١٤,٥ سم) دەرچووە.

٣- لە ژمارەکانی (١٨، ١٩- ٢٠) بە قەبارەی (١٦×٢٤ سم)، و ژمارە (٢١)یش بە قەبارەی (١٧,٥×٢٤ سم) دەرچووە.

٤- بەرگی هەموو ژمارەکان بە تابلۆیەکی جوانی ڕەنگاوڕەنگ ڕازێندراوەتەوە.

٥- هەڵەی چاپ کەمە.

٦- کۆی سەرجەم لاپەڕەکانی بە هەردوو قەبارەکەیەوە (٤٠٣٨) لاپەڕەیە.

٧- (١٣٦) نووسەر بابەتیان تێدا بڵاوکردۆتەوە.

٨- بە کرمانجی ژووروو زێتر بابەتی بڵاوکردۆتەوە.

٩- سالمێ جاسم و موحسین ئۆسمان بە داینەمۆی سەرەکی دەژمێردرێن.

١٠- لە ژمارە (٤)دا نرخی گۆڤارەکە دیاریکراوە کە (١٠) مارکی ئەڵمانی بووە. هەروەها ئابۆنەی ساڵانەش (بۆ کەسەکان پەنجا مارك، و دەزگاکان حەفتاو پێنج مارك) بووە. لە ژمارە (١٠)یشدا ئابۆنەکە بۆتە (٢٥) یۆرۆ بۆ کەسەکان، و (٣٥) یۆرۆ بۆ دەزگاکان.

١١- زۆرترین بابەت لە دوای (هاڤیبوون)ەوە، (ئەجاتی عەبدوڵا) بڵاوی کردۆتەوە.

هاڤیبوون، بۆ؟!

لەبەرئەوەی گۆڤارێکی ئەکادیمییە و لەلایەن دەزگایەکی کوردۆلۆژی لە دەرەوەی وڵات دەردەچێت، و کۆمەڵێك بابەتی گرنگ بە بە قەڵەمی ڕۆژهەڵاتناسان و شارەزایانی کوردۆلۆژی بڵاوکرۆدتەوە و لە دوا ڕۆژیشدا دەبنە ژێدەری باش بۆ نەوەی داهاتوو، هەموو کەسێکیش لەوانەیە بەو گۆڤارە نەزانن، بۆیە بە پێویستمان زانی کۆمەڵێك زانیاری وورد لەسەر (نووسەرەکان، کاتی دەرچوون، ژمارەکان، قەبارە، لاپەڕەکان، جۆری بابەتەکان) بڵاوبکەینەوە. ئامانجیش لە نووسینی ئەم بابەتە دەستنیشانکردنی پێگەی (هاڤیبوون)ە لە کاروانی ڕۆژنامەگەری کوردی، و ئاسانکردن و بەرچاو ڕوونیەکە بۆ ئەو کەسانەی کە لە بارەی مێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردی و کاری بیبلۆگرافیاوە هەوڵەکانیان چڕ کردۆتەوە.

سەرچاوەکان :

جگە لە ژمارەکانی (هاڤیبوون)، بەتایبەتیش هەر سێ ژمارەی (٧، ٨)ی جمك و ژمارە (٩)، سوودیش لەو دیمانەی (سالمێ جاسم)ی سەرنووسەر وەرگیراوە، کە ڕۆژنامەنووس (نازم دڵبەند) لەگەڵیدا ئەنجامی داوە ولە لاپەڕە (١١)ی ژمارە (٤٥٠٠)، ٢٠٠٨/٢/١٩ی ڕۆژنامەی (کوردستانی نوێ)دا، بڵاوکراوەتەوە.

# کورد و ولآتەکەی لە سالآنی ٤١-١٣٢ك/ ٦٦١-٧٤٩ز لەکتێبی ( تـاريخ الامم والملوك )ی الطبري دا

هۆگر رحمان قادر/ زانکۆی سەلاحەدین

تەوەرەی یەکەم

کورد وبزووتنەوەی خەواریج

یەکەم: گرنگی شەهرەزور[١] لەبزوتنەوەکەی (فروه بن نوفل الأشجعي/ فروه کوڕی نەوفل ئەلئەشجەعی[٢]):

دەستەیەك، گروپێك کەسی خەوارج لەڕۆژگاری فەرمانڕەوایی کردنی خەلیفە عەلی کوڕی ئەبو طالب (ڕەزای خوای لەسەربێت) دوورەپەرێزیان کرد و پەنایان بردەبەر شەهرەزور بەلآم لەسالی ٤١ك/٦٦١ز ئەم خەوارجانە دەرچوون و یاخی بون بەسەر دەسەلآتی موعاویەوە [٣].

دواتر موعاویە هات و لە (النخيلة)[٤] دابەزی، لەم کاتەدا ئـەم خەوارجە پێنج سەدکەسیەکە لـە شـەهرەزور بـوون بەسەرکردایەتی فەروە کوڕی نەوفل ئەلئەشجەعی بەرەو ڕووی موعاویەو هێزەکانی چوون[٥].

(اليعقوبي) یش دەنووسێت و دەڵێت: ((لەو کاتەی کە( فەروە کوڕی نەوفل ئەلئەشـجەعی) هـەواڵی کـوژرانی عـەلی کوڕی ئەبو طالب و زاڵبون و هاتنە سەر دەسەلآتی موعاویەی پێگەیشت، بەهـەزارو پێـنج سـەد کەسـەوە دەرچـوو تاهاتە النخيلە بەمەبەستی جەنگانی موعاویە و هێزەکانی ))[٦].

ئیتر لە ئەنجامی ڕوودانی شەڕێك لەنێوان هەردوولادا خەڵکی کوفە جەنگێکی سـەخت وبـەهێزیان لـە بەرژەوەنـدی موعاویە دژ بە خەوارجەکان ئەنجامدا کەلەئـەنجامی ئـەم شـەڕەداخەوارجەکان تێشکان و فـەروەی سـەرکردەیان کوژرا و هێزەکانی موعاویە سـەرکەوتن هەرلەدەرئـەنجامی ئـەم ڕووداوەدا مەترسـی و هەڕەشـە لەسـەر موعاویـە و کوفە نەما[٧].

کەواتە شەهرەزوور پێگەو بایەخێکی گرنگی هەبووە لەم ڕووداوەدا بەتایبەتی لە داڵدەدان و حەوانەوەی ئەو پێنج سەد کەسە لە خەوارجەکان کە لە ڕۆژگاری خەلافـەتی عـەلی خۆیـان لەوێـدا داڵدەدا چـونکە شـەهرەزوور لەلایـەك ناوچـەیەکی دوورەدەسـت و گـرنگ بـووە جگـە لەمـەش خـەڵکی کـورد لەشـەهرەزووردا ئـەم خەوارجانـەیان حەواندۆتـەوە و بـوونی خەوارجـەکانیان لـە شـەهرەزوور دا لـەلا ئاسـایی بـووە ئەمـە سـەرەڕای قبـوڵ کردنـی

خەوارجەکان و پێشوازی لێ کردنیان و پیشان نەدانی هەڵوێستی نەخوازراو دژ بەوان، و بە دوور نازانرێت لەم کاتەدا خەوارجەکان لە شەهرەزووردا هەوادار و لایەنگریان لەنێو کورد دا پەیدا کردبێت.

جگەلەمانەش بەدوور نازانرێت کە کورد ئەگەرچی بە ژمارەیەکی کەمیش بووبێت بەشداری لەریزەکانی ئەم هێزە کردبێت کەبەرە و جەنگانی موعاویە چوون چونکە کاتێك کە ئەشجەعی گەیشتە (النخیلە) بەمەبەستی جەنگانی موعاویە سەرکردایەتی هێزێکی هەزار و پێنج سەد کەسی دەکرد ئەمە لەکاتێکدا کە فەروە و هێزەکەی لەو کاتەی کە هاتنە شەهرەزوور ژمارەیان پێنج سەد کەس بوو کەواتە هەزارجەنگاوەری ئەم پیاوە زیاد بوو، بۆیە دەکرێ بلێین کە زیادبونی ئەم هەزار جەنگاوەرەی خەوارجەکان لەکاتی ڕووبەڕووبونەوەی موعاویە یان ئەوەتا کوردەکان بوون و هاتنە پاڵ جەنگاوەرەکانی ئەشجەعی بەمەبەستی هێرش کردنەسەر موعاویە و هێزەکانی کە ئەمەش ئەگەرێکی بەهێزە بەهۆی بوونی ئەو سەرکردەیە وخەوارجەکان لەشەهرەزووری کوردان و مانەوە و ژیان ودالدەدان وپەیداکردنی لایەنگریان لەوێدا کەواتە بەپێ ی ئەم لێکدانەوەیە بەشداری و ڕۆڵی کورد لەم بزووتنەوەیەدا کاریگەرو گەورە بووە، و ئەگەرێکی تریش هەیە کە گریمانەی زیادبوونی ئەم هەزار جەنگاوەرە دەدات بەدەستەوە و ژمارەی هێزەکانی ئەشجەعیان کرد بەهەزار و پێنج سەد جەنگاوەر ئەویش ئەوەیە کەلەکاتی ڕێکردنی هێزەکانی خەوارج بەسەرکردایەتی ئەشجەعی لەشەهرەزوورەوە بەرەو کوفە و ڕووبەڕووبونەوەی موعاویە،ڕەنگە خەڵکی ناوچە کوردنشینەکانی دەرەوەی شەهرەزوور یاخود خەڵکی ناوچەکانی دەرەوەی ناوچە کوردنشینەکان بەپاڵنەر و هۆکاری جیاجیا هاتبنە پاڵ هێزەکەی ئەشجەعی و ژمارەی جەنگاوەرەکانیان بووبێتە ئەم ژمارەیە.

یاخود هەردوو ئەگەرەکەی سەرەوە بەیەکەوە بەڵام بەڕێژە و ژمارەی جیاواز گریمانەی زیادبوونی ژمارەی جەنگاوەرەکانی خەوارج دەکەن لەم بزوتنەوەیەدا.

بەشێوەیەکی گشتی کورد بەهەر ژمارەیەك بووبێ بەشداریان لەم بزوتنەوەیەدا کردووە ئەمە جگە لەوەی کە خەوارجەکان لەم ڕووداوەدا شەهرەزووریان وەك بنکەیەکی ئارام بەکارهێناوە و خۆیان تیایدا ساز و ئامادەداوە بەمەبەستی شاڵاوکردن و هێرش کردنە سەر موعاویەی کوری ئەبو سوفیان و هێزەکانی ئەگەرچی لە دوای ڕوودانی شەڕێك لەبەرامبەر موعاویە و لایەنگرانی (هێزەکانی) شکستیان هێناوە.

لەم ڕوودلوەدا سەرچاوەکان جگە لەکوژرانی فەروە ئاماژە بەژمارەی کوژرانی لایەنگرانی هێزەکانی ئەو نادەن، کە بێگومان ئەگەر سەرکردەی ئەم بزووتنەوەیە کوژرابێت، ئەوا کوژراو بەهەر ژمارەیەك بووبێ لەلایەنگرانی ئەودا هەبووە بۆیە بەدوور نازانرێت کورد بەهەر ژماریەك بووبێ قوربانی دابێت لەم شەڕەدا.

دووەم: گرنگی ناوچە کوردنشینەکان لەبزوتنەوەکەی (صالح بن مسرح/صالح کوری مەسرەح) لەساڵی ٧٦ك/٦٩٦ز:

صالح کوری مەسرەح ئەلتەمیمی کە یەکێ بوو لە سەرکردە دیارەکانی خەوارج لەساڵی ٧٦ك/٦٩٦ز دەرچوو، هەرلەم ساڵەدا لەناوچەکانی دارا و خاکی موصل و جەزیرە[8] بوو لەم ناوچانەدا هەوادارو و لایەنگری هەبوون[9].

ئەو سەرکردەیە داوای لە هەوادارەکانی کرد لەم شوێنانەی کە لەسەرەوە ئاماژەم پێدان کە دەرچن و ستەم لە ناوببەن و جیهاد دژی سەرپێچی کارەکانیان بکەن (مەبەستی ئومەویەکان) بوو، و لایەنگران و هاوەڵەکانیشی وەڵامی ئەم داواکاریەیان دایەوە و ژمارەیەکیان پەیوەندیان پێوە کرد بەمەبەستی جەنگانی ئومەویەکان. دواتر صالحی سەرکردەی بزوتنەوەکە و ئەو جەنگاوەرانەی کە لەگەڵی دا کۆبونەوە سێزدە شەو لەخاکی دارا مانەوە و خەڵکی خاکی دارا و نصیبین[10] و سنجار[11] ئەو و هێزەکەیان حەواندۆتەوە و داڵدەداوە، دەرچونی ئەم پیاوە و جەنگاوەرەکانی لەنێوان (١١٠-١٢٠) جەنگاوەر بووە جگە لەمەش دەرچوونی ئەو و لایەنگرانی بە محمدی ئەمیری جەزیرە گەیشت[12].

بۆئەم مەبەستە ئەمیری جەزیرە سوپایەکی هەزار کەسی لەدژ ناردن و ئەم سوپایەش بە حران دا ڕەت بوو تاهاتە دوغان بەمەبەستی ڕووبەڕووبونەوەی ئەو ئیتر لە ئەنجامی ڕوودانی شەڕێك لەنێوان هەردوولا دا ئەو سوپایە لەبەرامبەر صالح و هێزەکانی تێکشکان دواتر ئەو هێزە هەڵاتن و هاتنە لای ئەمیری جەزیرە[13].

دواتر ئەمیری جەزیرەی ناوبراو دوو سوپای پێکهێنا بەمەبەستی ڕووبەڕووبونەوەی ئەو سەرکردەیە سوپای یەکەم بریتی بوو لەهێزێکی هەزار و پێنج سەد جەنگاوەری بەسەرکردایەتی (خالد کوڕی جزو السلمی/خالید کوڕی جزو ئەلسولەمی)کە لە لایەن ئەمیری جەزیرەوە نێردرا دژ بە صالح دواتر ئەمیری جەزیرە هێزێکی تری هەزار و پێنج سەد کەسی بەسەرکردایەتی (الحارث بن جعونە/حارس کوڕی جعونە) بەرەو ڕووی ئەو نارد، بەڵام لەم کاتەدا ناوبراو بەرە و ئامەد ڕۆیشت کە ناوچەیەکی کوردنشین بوو و ئەم دوو هێزەی ئومەویش دوای صالح و هاوەڵەکانی کەوتن، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم هەڕەشە و مەترسیە ئەم سەرکردەیە هێزەکانی خۆی کرد بەدوو بەشەوە لەلایەك (شبیب الخارجی)[14] ی هاوەڵی و سەرکردەی بەرە و ڕووی حارس ئاراستە کرد، خۆشی واتە صالح خۆی ئامادەکرد بەمەبەستی ڕووبەڕووبونەوەی خالید، ئیتر دوای ڕوودانی شەڕێك لەنێوان هەردوولا دا نزیکەی سی جەنگاوەر لەهاوەڵانی صالح کوژران لە هاوەڵانی محمد کوڕی مەروانیش زیاتر لەحەفتا کەس کوژران دوای ئەم ڕووداوەش ئەو پیاوە و هاوەڵانی هەرێمی جەزیرەیان جێهێشت وچوونە خاکی موصڵ و دواتر گەیشتنە[15]الدسکرە[16].

کاتێك (حجاج بن یوسف الثقفي/حەجاج کوڕی یوسف ئەلسەقەفی[17]) بەم ڕووداوەی زانی هێزێکی سێ هەزار جەنگاوەری لەخەڵکی کوفە بەسەرکردایەتی (الحارث بن عمیرة بن ذي المشعار الهمداني) پێکهێنا بەمەبەستی ڕووبەڕووبونەوەی ئەو سەرکردەیە ،ئیتر ئەم هێزە بەڕێکەوت تاالدسکرە نزیك بۆوە، بەڵام لەم کاتەدا صالح دەرچوو بەرە و جەلەولا و خانەقین (الحارث کوڕی عمیرە) و هێزەکەشی دوایکەوتن تا لەخاکی موصل لەگوندێك بەناوی (المدبج) بەو پیاوە و هێزەکەی گەیشتن کە ژمارەیان نۆهەت کەس بوو، ئیتر دوای ئەنجام دانی شەڕێك لە نێوان هەردوو لادا سەرکردەی ئەم بزووتنەوە خەوارجیە کوژرا، و دواتر هاوەڵانی ئەو بەیعەتیان دا بە شبیب الخارجی[18].

لەئەنجامی هەڵسەنگاندنمان بۆ ئەم ڕووداوە دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە بەشێ لەناوچە کوردنشینەکانی هەرێمی جەزیرە وەکو ناوچەکانی دارا و ئامەد و سنجار و ناوچەی کوردنشینی تر لەلایەن ئەم بزووتنەوەیە بەکارهێنراوە وەکو گۆڕەپانێك بۆ ئەنجامدانی چالاکیەکانیان تیایدا، ئەمە جگە لەوەی بەدوور نازانرێ ژمارەیەك ئەگەرچی کەمیش بێت، کورد لەڕیزەکانی ئەم بزوتنەوەیەدا هەبووبن. چونکە لەبنەڕەت دا ژمارەی جەنگاوەرانی بزووتنەوەکە کەم بووە و پانتاییەکی بەرفراوان لەخاکی ناوچەکوردنشینەکان ببوونە گۆڕەپانی جموجۆڵی ئەم بزووتنەوەیە و دوژمنەکەی (دەوڵەتی ئومەوی).

جا بەهۆی ئەنجام دانی زنجیرەیەك شەڕ و پێکدادان لە نێوان جەنگاوەرەکانی ئەم بزووتنەوەیە و هێزەکانی ئومەوی بەدوور نازانرێ ژمارەیەك لە کوردیش لە ڕیزەکانی خەوارج بووبنە قوربانی ئەمە،جگە لەوەی کە ئەم ناوچە کوردنشینانەی کە بوونەتە گۆڕەپانی پێکدادانەکانی نێوان ئەم بزووتنەوەیە و هێزەکانی ئومەوی دووچاری بارودۆخێکی نائاسایی ونالەبار بوونەتەوە کەئەمەش بەزیانی خەڵکەکەی تەواو بوو.

- جموجۆڵەکانی (شبیب بن یزید/شبیب کوڕی یەزید) لە ساڵی ٧٧ك/٦٩٦ز:

کاتێ (صالح کوڕی مسرح) کوژرا دواتر هاوەڵانی ئەو بەیعەتیان دابە ( شبیب کوڕی یەزید) بەم شێوەیە شبیب بووە جێگرەوە و درێژە پێدەری بزووتنەوەکەی ئەو[١٩].

بەشێك لە ناوچە کوردنشینەکانی جەزیرە و هەرێمی ئازەربیجان[٢٠] و شاری خانەقین و نەهرەوان و داقوقا و ناوچەی کوردنشینی تریش بوونەتە گۆڕەپانی چالاکیەکانی ئەم خەوارجانە و لەهەندێ حاڵەتیش دا مەیدانی ململانێ و پێکدادانەکانی نێوان هێزەکانی دەوڵەتی ئومەوی و لایەنگرانی ،ئەندامانی ئەم بزووتنەوەیە، بۆیە الطبري لەیەکێ لەڕووداوەکانی پەیوەندیدار بەم بزووتنەوەیە دەنووسێت: کاتێك (عبدالرحمن بن محمد بن الأشعث/عەبدولرەحمان کوڕی محەمەد کوڕی ئەلئەشعەس) بەسەرکردەی سوپایەك دیاریکرا لەلایەن حەجاج بەمەبەستی ڕووبەڕووبونەوەی شبیب،ئیتر ئەم سوپایە لە هێزەکەی شبیب نزیك بۆوە لەم کاتەدا ئەو بەرە و داقوقاو شەهرەزور ڕۆیشت و هەڵات عبدالرحمن یش بەپێ ی فەرمانی حەجاج کەوتە دوایەوە و لە ئەنجامی کەوتنە دوای شبیب عبدالرحمن بەناوچەکانی خانەقین وجەلەولا وناوچەکانی دەوروبەری موصل دا ڕەتبوو[٢١]. دواتر شبیب بەهۆی ڕووداوی نقوم بونی ناو ئاو و بە هۆی پاڵەپەستۆو گوشاری حەجاج و هێزەکانی لەساڵی ٧٨ ك /٦٩٨زخنکاو مرد[٢٢].

کەواتە ئەنجامدانی جموجۆڵەکانی خەوارج بەسەرپەرشتی شبیب هەردرێژە پێدەری بزووتنەوەکەی صالح بووە ، لەم جولانەوەیەش دا ناوچەیەکی، پانتاییەکی بەرفراوانی کوردنشین بۆتەمەیدانی چالاکی و جموجۆڵەکانی ئەم بزووتنەوەیە.

سیّ یەم: بایەخی شەهرەزوور لەبزوتنەوەکەی (الضحاك بن قیسالشیبانی/زوحاك کوڕی قەیسی شەیبانی) لەساڵی ١٢٧ك/٧٤٤ز:

ئەکاتی کوشتنی وەلید لەساڵی ١٢٧ك/٧٤٤ز خەوارجێك لەجەزیرەدا دەرکەوت کە پیّ ی دەووترا (سعید بن بهدل الشیبانی/سەعید کوڕی بەهدەل ئەلشەیبانی) کە پێشەوایەتی دووسەد کەسی دەکرد لەخەڵکی جەزیرە، زوحاکیش لەنێو ئەم دووسەد کەسە دابوولەم کاتەدا سعید دەرفەتی کوژرانی وەلید و خەریك بوونی مەروانی بەشام قۆستەوە و لەخاکی کفرتوپا دەرچوو ،دواتر سعید بەهۆی نەخۆشی طاعونەوە مرد و زوحاك جێگا ی گرتەوە[٢٣].

ئیتر بەم چەشنە ئەو پیاوە سەرکردایەتی ئەم بزووتنەوە خەوارجیەی کرد و لەلایەن خەوارجەکان بەیعەتی پێدرا تا سەرکردایەتیان بکات ، لەم کاتەدا زوحاك لەشەهرەزوور نیشتەجیّ بوو و (الصفر)[٢٤] یەکانیش کەدەستەیەك بوون لەخەوارج لەهەموو لایەکەوە ڕوویان تێکرد تاژمارەیان بوو بەچوار هەزار کەس[٢٥].

بەڵام لەهەمان کاتدا طبري زانیاریەکی تر لەبارەی ئەم مەسەلەیە دەهێنێت و دەڵێت: دوای ئەوەی کە ئەو کەسایەتیە سەرکردایەتی ئەم بزووتنەوە خەوارجیەی وەرگرت لەگەڵیدا نزیکەی (١٠٠٠) جەنگاوەر کۆبوونەوە ئینجا دوای ئەوە بەرەو کوفە بەڕێکەوتن و بەخاکی موصل داتێپەڕین و لەوێدا خەڵك هاتنە پاڵ جەنگاوەرەکانی، و نزیکەی سیّ هەزار جەنگاوەری خەڵکی جەزیرەش هاتنە پاڵ هێزەکەی ئیتر ئەم هێزە بەسەرکردایەتی زوحاك لەساڵی ١٢٧ك بەرە و کوفە بەڕێکەوتن (کە ئەم زانیاریەش جیاوازیەکی ئەوتۆی لەگەڵ گێڕانەوەکەی پێشووتر نیە) ئیتر دوای ڕوودانی شەڕێك هێزەکانی زوحاك دەستیان بەسەر کوفەو دەوروبەرەکەی داگرت و بەسەر هێزەکانی ئومەوی دا سەرکەوتن[٢٦].

دواتر زوحاك و مەروانی کوڕی محمد خەلیفەی ئومەوی لەناوچەی (کفرتوثا)[٢٧] کە لەڕووی جوگرافیەوە سەر بەشاری ماردین و لەنێو هەرێمی جەزیرەدا بوو بەیەك گەیشتن و بوو بەشەڕیان کە لە دەرئەنجامی ئەم شەڕەدا ئومەویەکان سەرکەوتن و هێزەکانی زوحاك یش شکان وزوحاك کوژرا[٢٨].

لە ئەنجامی خستنە ڕووی ئەم ڕووداوە دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە شەهرەزوور بایەخێکی گرنگ وگەورەی هەبووە لەم ڕووداوەدا وشەهرەزوور بنکەی ئەو بزووتنەوەیە بووە کە لەوێوە خەوارجەکان ڕوویان تێکردووە و ژمارەی لایەنگرەکانی بووە بەچوار هەزار جەنگاوەر و لەوێوە واتە لە شەهرەزوورەوە خۆیان سازو ئامادە کردو شەهرەزوور بۆ ئەوان لەزۆر ڕووەوە ژینگەیەکی لەبار بووە بۆ یەك خستن و کۆکردنەوەی جەنگاوەران بەمەبەستی بەدیهێنانی ئامانجەکانی بزووتنەوەکە.

جگە لەمانەش ئەگەرێکی نزیکە و بەدووریش نازانرێت کە خەڵکێکی زۆر و بەرچاوی کوردی جەزیرە هاتبنە پاڵ جوڵانەوەکە بەهەر ژمارەیەك بوو بیّ.

بەشێوەیەکی گشتی گومانی تێدانیە کە لەبزووتنەوەکەی زوحاك جەنگاوەری کورد بەهەر ژمارەیەك بووبیّ لەڕیزەکانی ئەم بزوتنەوەیە هەبووبن و ڕۆڵی خۆشیان بەپیّ ی سروشت و چۆنیەتی ڕووداوەکان بینیووە لەهەمان

کاتیش دا بەدوور نازانرێت کە لەشەڕ و ڕوویەڕوبونەوەکەی ئەم بزوتنەوەیە و مەڕوانی کوڕی محمد و سوپاکەی لە کفرتوپا کورد بەهەر ژمارەیەك بووبێ لەڕیزەکانی سوپای مەڕوانی کوڕی محمد دا هەبووبن.

کەواتە بەشێوەیەکی گشتی کورد لەم ڕووداوانەدا وەکو ڕەگەزێکی مرۆیی گرنگ لەجەنگەکاندا سوودی گرنگی لێ وەرگیراوە، لەبەرژەوەندی هەردوو لایەنە ناکۆکەکە بەتایبەتی لەبەرژەوەندی ئەم بزوتنەوەیە.

جگە لەمانەش ناوچەی کفرتوپا کە دەکەوێتە نێوان داراو رأس العين و سەر بەشاری ماردین و لەخاکی جەزیرە دایە ئەمە ناوچەیەکی کوردنیشن و گۆڕەپانی شەڕەکە بوو و لەسەر ئەم ناوچە کوردنیشنە دەرئەنجامی شەڕەکە لە بەرژەوەندی مەڕوانی کوڕی محمد و ئومەویەکان یەکلایی بۆتەوە.

تەوەرەی دووەم

کوردلەبزووتنەوەکانی (المختار الثقفي وعبدالرحمن کوڕی الاشعث) دا

یەکەم: بزوتنەوەکەی المختار الیقفی/موختاری ئەلسەقەفی) و ناوچە کوردنشینەکان:

لەساڵی ٦٦ك/ ٦٨٦ز (المختار بن أبو عبيد الثقفي) لەشاری کوفە ڕاپەڕی و دەرکەوت و موختار بۆ مەبەستێکی سیاسی داوای تۆڵەی خوێنی حوسێنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو طالب ی دەکردو کاربەدەستی (عبدالله بن زبیر/عەبدوڵلاکوڕی زوبێر) ی لە کوفە وەدەرنا[٢٩].

هەر لەم بارەیەوە الدینوری دەنووسێت: ((موختار داوای لە شیعەکانی کوفە کرد و هانی دان کە لێ ی کۆببنەوە و داوای خوێنی حوسێن بکەن خەڵکێکی زۆر وەلآمی ئەم داواکاریەی موختاریان دایەوە و بەپیر بانگەوازەکەیەوە چوون زۆرترین ئەو کەسانەی کە وەلآمی داواکاریەکانی موختاریان دایەوە خەڵکانێکی زۆر بوون لەعەجەمەکان کە لە کوفە دەژیان و ژمارەیان نزیکەی بیست هەزار جەنگاوەر دەبوو))[٣٠].

کاتێ موختار دەرکەوت ژمارەیەکی زۆر مەوالی هاتنەپاڵ ڕیزەکانیەوە موختاریش وای بینی کە مەوالیەکان ئامرازێکن بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی لەدەسەلآت و نفوذپەیداکردن بۆیە لەگەڵ عەرەب دا لەبەخشین بەشداری پێ کردن و زۆرینەی ئەندامە(جەنگاوەرەکانی) موختار لەڕۆڵەکانی فورسەکان بوون کە لەکوفە بوون و بە (الحمراء) دەناسران، تا گەیشتە ئەو ڕاددەیەی کە لەسوپاکەی دا ژمارەیەکی زۆر مەوالی هەبوون و موختار لەدەسەلآتدارێتیەکەی بەردەوام بوو وپەپشت بەستن بەمەوالی یەکان نزیکەی هەژدە مانگ فەرمانڕەوایی کرد[٣١].

دوای ئەوەی کە هەڵومەرج و باروتۆخەکە لە بەرژەوەندی موختار و فەرمانڕەوایەتیەکەی کەوتەوە، هەڵسا بەئەنجام دانی هەندێ کارڕایی کارگێڕی و سیاسی لەم بارەیەوە الطبری دەڵێت: ((المختار الثقفی پەیمانی دابە ( عبدالله بن الحارث) بەمەبەستی هەڵسوڕاندنی کاروباری ئەرمینیا و هەڵسوڕاندنی کاروباری ئازەربیجان ی دا بە (عبدالرحمن بن عمیری بن عطارد) و (عبدالرحمن بن سعید بن قیس) کردە کار هەڵسووڕێنەری موصل،(سعد بن

حذیفە بن یەمانی)نارده سەر (حەلوان) بەمەبەستی هەڵسوڕاندنی کاروباری ئەوێ و جەنگاوەر و پارەی بۆ سەعد لە حەلوان دابین کرد و فەرمانی پێدا کەجەنگی کوردەکان بکات و فەرمانی پێدا کە دەست بەسەر ڕێگاکان دا بگرێت و موختار بۆ کاربەدەستان و والیەکانی سەر هەرێمی چیاکانی نوسی و فەرمانی پێدان کە سامانی ناوچەکانیان کۆ کەنەوە وبیدەن بە (سەعد کوڕی حوزەیفە کوڕی یەمان) لە حەلوان))[32].

ئەنەنجامی هەڵسەنگاندنمان بۆ ئەم ڕووداوە دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە دوای ئەوەی موختار دەستی بەسەر کوفە داگرت و توانا ودەسەلآتی بەهێز دەبێت ، ئیتر دوای ئەمە دەسەلآت بەسەر هەندێ ناوچەی تر دا دەسەپێنێت و چەند کەسایەتیەکیش بۆسەر ئەم ناوچە تازە بەدەست هاتووانەی ژێر دەسەلآتەکەی دەست نیشان دەکات جا لەنێو ئەم ناوچە تازە بەدەست هاتوانەی کە موختار دەستیان بەسەردا دەگرێت هەندێ ناوچەی کوردنشین یش دەگرێتەوە وەکو هەرێمی ئازەربیجان و شاری حەلوان و ناوچەی تر.

لەم دەقەی کە ئامازەم پێداوە دەردەکەوێت کە چۆن المختار سەعد کوڕی حوزەیفە کوڕی یەمان) بۆ سەر حەلوان دەنێرێت کە ناوچەیەکی کوردنشین بوو و فەرمانی پێدەدات کە جەنگی کوردەکان بکات، ئەمە لە کاتێك دا کە خودی موختار و هێزەکانیشی یاخیگەر و هەڵگەڕاوە بوونە بەتێڕوانینی دەوڵەتی ئومەویەوە و نەیاری عەبدولآ کوڕی زوبێر بوون،بەلآم بەدیدی خۆیان شۆڕشگێڕ و لەسەر ڕێگای ڕاست بوون ،کەچی لەم بارەدا موختار فەرمانی جەنگان و شەڕکردن دژ بە کوردەکان و فەرمانی دەست بەسەراگرتن و کۆنترۆڵ کردنی ڕێگاکان دەدات تا کوردەکان نەتوانن دەست بەسەر ڕێگاکان دا بگرن و، دەسەلآتدارێتی موختار لەوێدا لاواز بکەن و بیخەنە ژێر هەڕەشەوە، چونکە لەلایەك موختار کوردەکانی بە هەڕەشە زانیوە بۆ سەر دەسەلآتدارێتیەکەی، لەلایەکی تریشەوە ڕەنگە کوردەکان بە ئاسانی فەرمانڕەوایی کردن و خۆزاڵکردنی موختاریان بۆسەر ناوچەکانیان قبوڵ نەبووبێ، و بەدووریش نازانرێت ،لە ناوچە کوردنشینەکانی ژێردەسەلآتی تازەی موختار دا کوردەکان لەخەڵکی تر خاوەنی جەنگاوەری توند تر و بەهێزتر بووبن و بەئاسانی کۆنترۆڵ نەکرابن بەلای موختارەوە، بۆیە موختار فەرمانی جەنگ کردنی دژ بە کوردەکان و پاراستنی ڕێگاکانی داوە تا زیان بە ناوچەکانی ژێر دەسەلآتە تازەکەی نەگات و ناوچەکە بە تەواوی لە بەرژەوەندی خۆی هەڵسوڕێنێت .

لەلایەکی ترەوە، هەروەك لەم دەقەی سەرەوە ئاماژەمان بۆ کرد، دەردەکەوێت کە موختار فەرمانی دەست بە سەراگرتنی ئابووری بەشێ لە ناوچەیەکی کوردنشینی داوە لە بەرژەوەندی خۆی و دەست و پێوەندەکانی و دەسەلآتدارێتی یەکەی ئەویش لەو کاتەی کە نامە بۆ کاربەدەستان و والیەکانی سەر هەرێمی چیاکان دەنووسێت(بێگومان بەشی ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان کوردنشین بوون) و فەرمانیان پێدەدات کە سامانی ناوچەکانیان کۆکەنەوە و بهێنن و بیدەن بە سەعد کوڕی حوزەیفە کوڕی یەمان لە حەلوان، کەواتە لێرەش دا دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە بەشێك لە ناوچە کوردنشینەکان لە ڕووی ئابووریەوە لەپاڵ لایەنە سیاسیەکە بەفەرمانی موختار و لەلایەن والی و کاربەدەستەکانیەوە دووچاری چەوساندنەوە و قۆستنەوە هاتوون.

لە گرنگترین ئەو شەرانەی کەموختار ئەنجامی دا شەڕی خازر بوو[٣٣]، ئەو شەڕە کە لەنێوان هێزەکانی ئیبراهیم کوڕی ئەشتەری[٣٤] سەر بەدەسەلاتی موختار ئەلسەقەفی و نێوان هێزەکانی (عبیداللە بن زیاد/عوبەیدولا کوڕی زیاد)ی[٣٥] ئومەوی لەخازر لەساڵی٦٧ك/ ٦٨٧ز ڕووی دا.

ئیتر لەئاکامی ڕوودانی شەڕێکی توند و تیژ لەنێوان هەردوولادا هێزەکانی (ئیبراهیم کوڕی ئەشتەر)ی سەرکردەی موختار سەرکەوتن و هێزەکانی (عوبەیدەلا)ی ئومەوی شکستیان خواردو کوژراوێکی زۆریش لە هەردوولا کەوتەوە[٣٦].

هەر لە بارەی شەڕەکەوە مێژوونوس الدینوری دەڵێت: ((ئیبراهیم کوڕی ئەشتەر تین و پاڵەپەستۆی زۆری بۆ هێزەکەی (عوبەیدولا کوڕی زیاد) هێنا بۆیە لە نێویاندا کوژراو زۆر بوو وخەڵکی شامیشی شکاند، هەر لە دەرئەنجامی ئەم شەڕەدا (الحصین کوڕی نەمیر) کوژرا کە لە بکوژانی حسین بوو و (شرحبیل بن ذي الكلاع) وگەورە پیاوانی خەڵکی شامیش لەم شەڕەدا کوژران هەر لە ئاکامی شەڕەکەدا (عبیداللە بن زیاد)یش کوژرا، و (ئیبراهیم کوڕی ئەشتەر) دەستی بەسەر غەنیمەیەکی زۆری سوپای شام دا گرت))[٣٧].

ئینجا طبري نوسیویەتی: ((لەو کاتەی کە هاوەڵانی عوبەیدولا شکان ئەوا هاوەڵانی ئیبراهیم کەوتنە دوایان ئەوەی کە نقوم بوو زیاتر بوو لەوەی کە کوژرا و سوپای ابراهیم تاڵان و دەسکەوتی زۆریان دەسکەوت ))[٣٨].

دوای ئەوەی کە ئیبراهیم لەم شەڕەدا سەرکەوت بەسوپاکەیەوە بەرەو موصل چوو و کاربەدەستەکانی بۆ سەر ناوچە دەست بەسەر گیراوەکان نارد، و براکەی (عبدالرحمن کوڕی عبداللە) ی بۆسەر نصیبین نارد، و زاڵ بوو بەسەر سنجار و دارا لەگەڵ چەند ناوچەیەکی تر لەخاکی جەزیرە کە (ئەم ناوچانەی بە والیەتی دا بەچەند کەسایەتیەك)[٣٩].

هەر لەم بارەیەوە الدینوری دەڵێت: ((کاتێ کە ئیبراهیم کوڕی ئەشتەر) لە موصل نیشتە جێ بوو ئەوا والیەکانی نارد بۆ سەر شارەکانی جەزیرە وەکو: (السفاح کوڕی کردوس) ی بۆ سەر سنجار نارد و (عبداللە بن مسلم) بۆ سەر میا فارقین نارد و(مسلم بن ربیعه العقیلی) بۆ سەر ئامەد نارد وخۆشی چووە نصیبین و لەوێدا نیشتەجێ بوو[٤٠]. (ئیبراهیم کوڕی ئەشتەر) کاروبارو والێتی قرقیسیای دابە (زفر بن الحرث)، و (حاتم بن النعمان الباهلی) بووە والی لەسەر (حران و الرها و سمیساط) و دەوروبەری، و (عمیر بن الحباب السلمی بووە والی لەسەر کفرتوپا وطور عبدین))[٤١].

هەڵسەنگاندمان بۆ شەڕی خازر و پەیوەندیداربونی ئەم شەڕە بەکورد و وولاتەکەیەوە ئەوەیە کە ناوچەیەکی کوردنشینی وەکو خازر بۆتە گۆڕەپانی شەڕێکی گرنگ و سەخت و ئەم شەڕە دەرئەنجامی دیار و کاریگەری بەرچاوی بەسەر ناوچە کوردنشینەکانەوە هەبوو چونکە دوا بە دوای تێکشکاندنی هێزەکانی عوبەیدولا و ئومەوی

و کوژرانی ئەو، ئەوا لەو کاتەدا هێزەکانی (ئیبراهیم) درێژە بەسەرکەوتن وگرتنی زۆر ناوچەی تریش دەدەن کە لەنێو گرتنی شار و ئاوەدانی تازە ئەوا دەست بەسەر کۆمەڵێ شارو ئاوەدانی کوردنشین دا دەگرن وەکو ناوچەکانی (سنجار-شنگال) و دلرا و الرهاو میافارقین و ئامەد(دیار بەکر) و ناوچەی کوردنشینی تریش، کەواتـە لـەم ڕووداوە دا پانتایەکی بەرفراوان لەناوچە کوردنشینەکان بەر پـەلامارەکانی هێزەکانی موختـار کـەوتون و داگیرکـراون و ململانێ ی سەختی سیاسی و سەربازیان لەلایەن هێزە ناکۆکەکانی ناوچەکە لەسەر کراوە.

ئەم ناوچە کوردنشینانەی کە بەر شالآوەکەی لایەنگرانی بـەرەی موختـار کـەوتن لـەڕووی سیاسـی و ئـابووری و سەربازی و کارگێڕیەوە خرانە سەر دەسەلآت و قەڵەمڕەوی موختار ئەگەر چی بۆ ماوەیەکی کورتیش بوو بێت.

(مصعب بن زبیر/موسعەب کوڕی زوبێر) لەساڵی ٦٧ك/٦٨٧ز ڕوویەڕوی موختار ئەلسەقەفی بـۆوە و کوشـتی[٤٢] .

دوای کوژرانی موختار (موسعەب کوڕی زوبێـر)کاربەدەسـتانی نـارد بۆسـەر چـیاکان و ڕەشـەخاك(ارض السواد) ، دواتر ئەو سەرکردەیە نوسراوێکی بۆ (ئیبراهیم کوڕی ئەشتەر) نووسـی و پـێ ی ڕاگەیانـد کـە ئەگـەر وەلآمـی ئـەم دلوایەت دامەوە و بویتە لایەنگری من ئەوا خاکی جەزیرە و خاکی مەغریب هـەمووی بـۆ تـۆ بێـت . (عەبدولمـەلیك کوڕی مەڕوان)یش بە (ئیبراهیم ) ی ڕاگەیاند کە ئەگەر ملکەچی من بیت و بێیتە ژێر فەرمانڕەوایی من ئـەوا عێـراق بۆ تۆ بێت ،دواتر (ئیبراهیم) هاتە پاڵ موسعەب[٤٣].

کەواتە ئەوپیاوە کاربەدەستانی خۆی دەنێرێتـە سـەر هـەرێمی چیاکان (بەبەشـی ڕۆژئاواکەشـیەوە چـونکە دوای کـوژرانی موختـار و تێکشکانی هێزەکـانی، ئـەم ناوچـانە لەلایـەن موسـعەبەوە بـەڕێوە دەبـرێن و دەکەونـە نـاو دەسەلآتدارێتی ئەوەوە، لەلایەکی ترەوە هەرێمی جەزیرە کە کوردێکی زۆری تیادا ژیاوە شان بەشانی نەتەوەی تر بۆتە جێگای گرەو لەسەر کردن لەلایەن ئەوەوە لە پێناو ڕاکێشانی لایەنگری (ئیبراهیم کوڕی ئەشتەر) و بەدیهێنان و پاراستنی بەرژەوەندیە سیاسی و سەربازی و ئابووریەکانی.

دووەم: بزووتنەوەکەی ( عبدالرحمن بن الأشعث/عەبدولڕەحمان کوڕی ئەلئەشعەس )[٤٤] و ڕۆڵی کورد تیایدا:

لەسـاڵی ٨٠ك/٧٠٠ز حـەجاجی کـوڕی یوسـف ئەلـسەقەفی (عبـدالرحمن کـوڕی محمـد کـوڕی ئەشـعەس) ی وەك سـەرکردەی سـوپایەکی ئومەویـەکان بـۆ سجـستان[٤٥] نـارد، بەمەبەسـتی جـەنگانی پادشـای ئـەوێ کـە نـاوی ( رتبیل)بوو[٤٦]. ئیتر بەم چەشنە حەجاج سوپایەکی باشی لە هەردوو شاری کوفە و بەصرە بۆ عەبدولڕەحمان پێك هێنا، لەگـەڵ ئـەو سـوپایەش دا پـارە و سـوارە و چـەکی تـەواوی دانـێ و ئـەم سـوپایەی بـەرە و سجـستان نـارد بەمەبەستی ملکەچ کردنی رتبیل وگرتنی پانتایەکی بەر فراوان لە خاکەکانی ژێر دەسـەلآتی ئـەو نـاوی سـوپاکەش (الطواویس)بوو[٤٧].

الیعقوبی لەم بارەیەوە دەڵێت: ئەو پیاوە کاربەدەستی حەجاج بوو لەسەر سجستان و بۆ حـەجاجی نوسـی و پـێ ی ڕاگەیاند کە ئەم شالآو کردنە بۆ سەر رتبیل بۆ ساڵی داهاتوو دوادەخات ، دواتر عەبدولڕەحمان خەڵکی لە دژی

حەجاج ماندا و بەیەعەتی لەلایەن خەڵكەكەوە پێدراو ئاشتی و پێكهاتنی لەگەڵ رتبیل بەست و چووە عێراق و پیاوێكی لەسەر سجستان جێهێشت(٤٨).

لەم بارەیەوە الطبری دەڵێت: عەبدولرەحمان نوسراوێكی بۆ حەجاج نووسی و پێیراگەیاند كە شاڵاوكردنە سەر رتبیل بۆ ساڵی داهاتوو دوادەخات بەڵام حەجاج لەمە تورەبوو و هەرەشەی لێكرد، كوڕی ئەشعث یش یاخی بوونی خۆی ڕاگەیاند و پێكهاتنێكی لەگەڵ رتبیل بەست و لەم پێكهاتنەدا وا ڕێك كەوتن كە ئەگەر عەبدولرەحمان سەركەوت ئەوا خەراج لە رتبیل وەرناگرێت و ئەگەر تێكیششكا لەبەرامبەر حەجاج دا ئەوا رتبیل داڵدەی دەدات دوای ئەوە عەبدولرەحمان بە مەبەستی چوونە ناو عێراق بەرێكەوت )(٤٩).

لەكاتی بەرەو پێش چونی ئەو پیاوە و هێزەكانی بەرەو عێراق شەڕێك لەنێوان ئەو هێزە و حەجاج و هێزەكانی لەناو خاكی ئەهواز ڕوویدا كە لەدەرئەنجام دا حەجاج شكاو كشایەوە بەرەو بەصرە(٥٠).

هەروەها لەساڵی ٨٣ك /٧٠٣ز ڕووداوی دیرالجماجم(٥١) ڕووی دا لەنێوان حەجاج و عەبدولرەحمان كە لە دەرئەنجامی شەڕێكی سەخت لەنێوان هەردوولا دا بەخۆی و هێزەكانی تێكشكان(٥٢).

لەدوای شەڕی (دیر الجماجم) ڕووداوی (مسكن)(٥٣) ڕووی دا لەنێوان ئەو دوو لایەنە كەلەئەنجامی ڕوودانی شەڕێك لەوێدا هێزەكانی تێكشكان(٥٤) .

دوای شەڕی مسكن لەساڵی ٨٣ك ئەم سەركردەیە و هاوەڵەكانی بەرەو سجستان ڕۆیشتن،حەجاج یش هێزێكی ئامادەكرد و ناردی بەرەو ڕاوەدونانی هێزەكانی ئەو تا ئەوەبوو هەردوولا لەسوس بەیەك گەیشتن، دوای ڕوودانی شەڕێكی كورت خایەن كەماوەی سەعاتێكی خایاند عەبدولرەحمان كوڕی ئەشعەس و هاوەڵەكانی شكان و لەوێدا هەڵاتن و هاتنە سابوور، لەسابوردا كوردەكانی سابور یارمەتی ئەم هێزە ڕاكردوەكەی ئەویان داو چونە پاڵ ریزەكانیان وەك جەنگاوەر دواتر (عماره بن تمیم)ی سەركردەی سوپای حەجاج جەنگێكی سەختی عبدالرحمن و هێزەكانی و كوردەكانی سابوری لە (العقبە) كرد كە لەئەنجامی ئەم شەڕەدا عمارە و هێزەكەی شكان وعمارە و زۆرێك لە هاوەڵەكانی بریندار بوون و (العقبە) یان بۆ چۆڵ كردن و دواتر عەبدولرەحان بەكرمان(٥٥)دا ڕەت بوو(٥٦).

بەم شێوەیە بۆمان دەردەكەوێت كە عەبدولرەحمان و هێزەكانی دوای زنجیرەیەك شكست لەحاڵەتی هەڵاتن و پاشەكشەكردن دابوونە تا وەكو لەیەكێ لە كشانەوەكانیاندا لە سابور گیرساونەتەوە وكوردەكانی ئەوێش یارمەتی یان داون لەو شەڕەی كە لەسابور ڕوویدا لەنێوان هێزەكانی (عمارە) سەركردەی سوپای حەجاج و ئومەوی و نێوان عەبدولرەحمان و هێزەكانی و كوردەكانی سابور كە لەئەنجام دا هێزەكانی ئەو بەیارمەتی كوردەكانی سابور لەم شەڕەدا سەركەوتنیان بەدەست هێنا، ڕەنگە یەكێ لە هۆكارە سەرەكیەكان، خراپی سیاسەتی والی ئومەوی حەجاج بووبێ بەرامبەر بە مەوالی، بەشێوەیەكی گشتی، پاڵی بە كوردەكانی سابورەوە نابێ لەپاڵ هۆكاری تر تالەپاڵ جەنگاوەرەكانی ئەو سەركردەیە ڕووبەڕوی بەرەی حەجاج ببنەوە و لە ئەنجامیشدا ڕۆڵی گرنگیان بینی لە تێكشكانی هێزەكانی بەرەی ئەوسەركردەیە.

ـەدوور نازانرێت کە کوردەکانی فارس بەشێوەیەکی گشتی یارمەتی ئەویان دابێ و بووبنـە جـەنگاوەر لـەریزەکانی ـ.، نەك تەنها هەر کوردەکانی سابور ڕەنگە ئەم ڕووداوانە کاردانەوەی نێگەتیڤی لـەلای حـەجاج دروسـت کردبێـت بەوەی کە تۆڵە لەکوردەکان بکاتەوە لەم بارەیەوە مێژوونوس (خلیفه بن خیاط) دەڵێت: ((لەسـاڵی ٨٣ك حـەجاج کاروباری ویلایەتی فارسی دا بە(محمد کوڕی قاسم) و فەرمانی پێدا بەکوشتنی کوردەکان))[٥٧].

کەواتە بەدوور نازانرێت کە کوردەکانی فارس بەشداریان لە بزوتنەوەکەی عەبدولڕەحمان کردبێت بەڵام لەبەرامبـەر ئەم هەڵوێستەیان دا، بەفەرمانی حەجاج دووچاری کوشتن و قوربانی دان هاتوون و ستەمێکی زۆر نارەوایـان لـەدژ ئەنجام دراوە.

کەواتە لێرەدا دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە حەجاج کوشتاری بەشێوەیەکی گشتی دژ بەکوردەکان ئەنجام داوە، ئەمەش ئەوە دەگەیێنێت کە کوردێکی زۆر بەشداریان لەبزووتنەوەکەی (عەبدولڕەحمان کـوڕی ئەشـعەس) کـردووە نەك تەنها کوردەکانی سابور لـەریزەکانی عەبـدولڕەحمان دا جـەنگابن دژ بـە حـەجاج و هێزەکـانی ئومـەوی، لـەم کوشتارەی کوردەکان لەلایەن حەجاج جگەلەوەی کە ئەو بەشێوازێکی نارەوا تۆڵەی لەکوردەکان کردۆتەوە لەبـەر بەشداری کردنیان لەو بزووتنەوەیە لەهەمان کات دا خراپی سیاسەتی حەجاج لەم ڕووداوەدا دژ بەکوردەکان پـترو تۆختر سیاسەتە خراپەکانی ئەوی دژ بەمەوالی کە کوردیش لەناو چوار چێوەی مەوالی دابوو ڕوون کردەوە.

تەوەرەی سێ یەم

پێگەی هەندێ لەناوچە کوردنشینەکان لە ڕووداوەکانی کۆتایی سەردەمی ئومەویەکان

یەکـەم: پێگـەی نەهاوەنـد لـە ڕودلوی (قحطبـة بـن شـبیب الطـائی/قحطبـة کـوڕی شـبیب ئـەلتائی) دا لەسـاڵی ١٣١ك/٧٤٨ز :

ڕوداوی قحطبة لە ساڵی ١٣١ك /٧٤٨ز لە نەهاوەند ڕوویدا[٥٨]:

کاتێك بانگەوازی عەبباسی لەساڵی ١٢٩ك/٧٤٦ز لە خوڕاسان[٥٩]دەردەکەوێت و نەشونما دەکات بێگومان لە دواتـر دا ئەم بانگەوازە کاریگەری دەبێت بەسەر ناوچە کوردنشینەکان بـە هـۆی نزیکـی ناوچـە کوردنـشینەکان لـەڕووی جوگرافیەوە و بەکاریگەری هۆکاری تر کورد و هەندێ لە ناوچە کورد نشینەکان بـەم ڕووداوانـە کاریگـەر بوون،بۆ نموونـە قحطبـة کەیـەکێ بـوو لەسـەرکردە سـەربازییەکانی بانگـەوازی عەبباسـی داوای لـە خـەڵکی نەهاوەنـد و(سەربازانی خوڕاسان و شام)ی ئومەوی نێو شارەکەکرد کەلەژێر دەسەلآتداریەتی و فەرمانی ئومەویەکان دەرچن و بەڵێنی پێدان کە ئەگەرئەم دلواکاریە جێ بەجێ بکەن ئەوا دڵنیاییان دەداتێ بەڵام لە سەرەتا دا سـەربازەکانی خەڵکی خوڕاسان لەنەهاوەند بەم داوایە ڕازی نەبوون بەڵام سەربازانی خەڵکی شام لە نەهاوەند دوای ئەوەی کە سێ مانگ ئابڵوقە'دران ئینجا هاتنە ژێر باری ئەم داوایەو دڵنیایان درایێ، دواتـر (قحطبـة) بەیارمـەتی سـەربازانی شام شاری نەهاوەندی فەتح کرد، ئینجا دوای ئەوە سەربازانی خوڕاسانیش هاتنە ژێر دەسـەلآتی (قحطبـة) و ئـیتر

بەم شێوەیە (قحطبة) نەهاوەندی کۆنترۆڵ کرد لەبەرژەوەندی بانگەوازی عەبباسی ولەدواتردا (حەلوان) یشیان گرت[٦٠].

کەواتەنەهاوەند وەك شارێکی کوردنشین گۆڕەپانێکی ڕاستەقینەی ئەم شەڕ و ڕووداوە بووە و (قحطبة) ووناوچەی کوردنشینی (نەهاوەند،حەلوان) ی فەتح کردوە و گرتووە لەبەرژەوەندی بانگەوازی عەبباسی و دەسەلأتی ئومەویەکانی تیادا نەهێشتون و بەهۆی ئەم شەڕەوە شارەکە کەوتۆتە ژێر دەسەلأتی هێزێکی تازەوە کە خەڵکی شارەکە ئەم باروبۆخە تازەیان پێباش بووە.

دووەم: گرتنی شەهرەزوور لەلایەن عەباسیەکان لە سا ڵی ١٣١ك /٧٤٨ز:

(قحطبة) سەرکردەی عەبباسیەکان دوولە سەرکردە سەربازیەکانی بەناوەکانی (أبوعون عبدالملك بن یزید الخراسانی/ئەبو عون عەبدولمەلیك کوڕی یەزید ئەلخوڕاسانی) و (مالك بن طریف الخوراسانی) بەرە و شەهرەزوور نارد بەچوار هەزار جەنگاوەرەوە، لەم کاتەش دا (عوسمانی کوڕی سوفیان)کە یەکێ بوو لەسەرکردەکانی پێشرەوی عبدالله کوڕی مەڕوانی ئومەوی لەشەهرەزووردا دەسەلأت دار بوو، ئیتر بەم چەشنە هێزەکانی بانگەوازی عەبباسی بەرەو پێشەوە چوون بۆ گرتنی شەهرەزوور لەئەنجامی ڕوودانی شەڕێك دا لەگەڵ هێزەکانی عوسمانی کوڕی سوفیانی ئومەوی ،هێزەکانی بانگەوازی عەبباسی بەسەرکردایەتی أبوعون سەرکەوتن و هێزەکانی ئومەوی شکان و ژمارەیەکی زۆری سەربازەکانیان کوژراو شەهرەزوور کەوتە ژێر دەسەلأتی هێزە بانگەوازکەرەکانی عەبباسی[٦١].

کاتێ هەواڵی شکستی ئومەویەکان لەشەهرەزوور بەمەڕوانی خەلیفە گەیشت ئەو لە شاری (حران) بوو، ئەوشارەی جێهێشت و ئومەویەکان بەسەرکردایەتی مەڕوان جەنگاوەری زۆریان لەخەڵکی شام و جەزیرە و ناوچەی تریش کۆکردەوە و هاتنە(موصل) و خۆیان ئامادە و قایم کردو مەڕوان وهێزەکانیشی لەزێی گەورە دابەزین بەمەبەستی ڕووبەڕوبونەوە و بەرپەچ دانەوەی هەڕەشە و مەترسیەکانی ئەو و بانگەوازکارانی عەبباسی ،لەبەرامبەریشدا ئەو سەرکردەیە لەشەهرەزوور نیشتەجێ بوو و بەپێنج هەزار جەنگاوەر کۆنترۆڵی کردبوو[٦٢].

کەواتە شەهرەزوور لەم ڕووداوەدا وەك ناوچەیەکی کوردی دەبێتە گۆڕەپانی شەڕێکی گرنگ لەنێوان بانگەوازکەرەکانی عەبباسی بەسەرکردایەتی ئەبوعون و هێزەکانی ئومەوی بەسەرکردایەتی عوسمان کوڕی سوفیان کە لەدەرئەنجامدا هێزەکانی عەبباسی سەرکەوتن و شکستیان بەهێزەکانی ئەوان هێناوە لەشەهرەزوور لە ئەنجامدا ئەو شارە کە ناوچەیەکی کوردنشینە کەوتۆتە ژێر دەسەلأت و فەرمانڕەوایی کردنێکی تازە کە ئەوانیش عەبباسیەکان بوون و دەسەلأتی ئومەوییەکان لەم ناوچە کوردنشینە کۆتایی پێ دێت، کەئەمەش بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لەبەرژەوەندی کوردی شەهرەزوور بووە چونکە، کوردەکانی شەهرەزوور لە چوار چێوەی مەواڵی دا حسابیان بۆکراوە، واتە دووچاری جیاکاری و پەراوێز خستن هاتوون لەلایەن ئومەویەکانەوە، و

ئەم شەڕە و دەرئەنجامەکەشی بەشەڕێکی گرنگ و بایەخدار دەژمێردرێت بەلای عەبباسیەکانەوە،چونکە مۆژدەو دەستپێك و سەرەتایی هەرەس و لەناوچونی ئومەویەکان بوو.

هەرلەم ڕووداوەدا شەهرەزوور، پێگەیەکی ستراتیژی و سیاسی و سەربازی و بایەخ داری هەبوو لەیەك لایی کردنەوە و بەدیهێنان و هێنانەکایەی سەرەتایی گۆڕانێکی گەورە و چارەنووس ساز لەبەرژەوەندی عەباسیەکان.

قحطبة سەرکردەی عەبباسی لەساڵی(١٣١ك /٧٤٨ز) زنجیرەیەك سەرکەوتنی بەدەست هێناو دەستی بەسەر چەند شارێك داگرت لەبەرژەوەندی بانگەوازی عەبباسی وەکو (قرماسین–کرمانشاه) و حەلوان و خانەقین[٦٣].

کەواتە ئەم ناوچە کوردنشینانەی کە ئاماژەمان پێدان لەبەرژەوەندی هێزەکانی بانگەوازی عەبباسی دەستیان بەسەردا دەگیرێت، ئەم جموجۆڵە سەربازی و سیاسیانەلەکاتێکی گرنگ ئەنجام دراون کە ئەویش ساڵی (١٣١ك) بووە. چونکە لەم ساڵەدا هێزەکانی بانگەوازکەرانی عەبباسی سەرکەوتنی گرنگیان لەزۆربەی ناوچەکانی ڕۆژهەلاتی جیهانی ئیسلامی ئەو کاتە بەدەست دەهێنا کە لەنێویشیاندا کۆمەڵێك شار و ناوچەی کوردنشین هەبوون و ناوچە کوردنشینەکان جموجۆڵ و سەرەتایی گۆڕانێکی سیاسی وسەربازی تازەیان تیادا بەدی دەکرا لەبەرژەوەندی بانگەوازی عەبباسی و دژ بەدەوڵەتی ئومەوی، بۆیە ئەم شارە کوردنشینانە گرنگیەکی دیاری سیاسی و سەربازیان هەبوو لەیەکلایی کردنەوەی ڕووداوەکانی ناوچەکە و لەگۆڕانە چاوەڕوانکراوەکەدا چ وەکو پانتایەکی جوگرافی و مەیدانی جەنگەکان یاخود وەکو پاڵپشتیەکی مرۆیی بۆ سوپای عەباسیەکان.

سێ یەم: شەڕی الزاب (١٣٢ك/٧٤٩ز )[٦٤]:

دوای ئەوەی کە عەبباسیەکان دەستیان بەسەر شەهرەزوور داگرت وسەرکەتن بەسەر هێزەکانی ئومەوی لەوێدا، بۆیەهەوڵیان دا پارێزگاری لەم دەسکەوتانە بکەن و دەست بەسەر ناوچەی تازەش دا بگرن و هەوڵی لەناو بردنی دەوڵەتی ئومەوی بدەن بۆ ئەم مەبەستە، (ئەبوعون) دوای سەرکەوتنی لە شەهرەزوور لەدەوروبەری موصل نیشتە جێ بوو، لە بەرامبەریش دا ئومەویەکانیش لە ئامادە باشی دابوون بەمەبەستی بەرپەچ دانەوە و ڕووبەڕووبونەوەی ئەم هەڕەشەیە بە تایبەتی کاتێ کە هەواڵی شکستی هێزەکانی ئومەوی لە شەهرەزوور بەخەلیفە مەروان گەیشت مەروانیش لە (حران) ەوە هاتە (رأس العین) دواتر هاتە موصل و لەسەر ڕووباری دیجلە دابەزی وخەندەقێکی هەڵکەند و ئەبوعون یش بەرەو ڕووی هات و لە سەر ڕوباری (الزاب) دابەزی[٦٥].

ئیتر بەم چەشنە ئەبو عەبباس السفاح هێزێکی نارد بۆ جەنگانی مەروانی کوڕی محمد لە ساڵی ١٣٢ك، لەبەرامبەریشدا مەروانی کوڕی محمد و هێزەکانی لەئامادەباشی دا بوون بەخەڵکی شام و جەزیرەشەوە، و بنەماڵەی ئومەویش بەخۆیان و لایەنگریان لەگەڵی دا کۆبونەوە[٦٦].

ئیتر دوای ئەنجام دانی شەڕێکی توند و تیژ، هێزەکانی مەروانی کوڕی محمد و ئومەویەکان شکان و هێزەکانی بانگەوازکەرانی عەبباسی سەرکەوتن[٦٧].

هەرلەئەنجامی شەڕەکەدا ژمارەیەکی زۆر سەربازی ئومەوی کوژران و خنکان ئیتر بەم چەشنە (عبدالله کوڕی علی) مامی خەلیفە ئەبو ئەلعەباس ئەلسەفاح و هێزەکانی عەبباسی سەرکەوتن و مەڕوانی کوڕی محمد هەلات،ئیتر ناوبراو نووسراوی فەتح وسەرکەوتنی بۆ ئەبو عەبباسی (السفاح) نوسی و دەست بەسەر چەك ومالّ وسامانێکی زۆری ئومەویەکان داگیرا[٦٨].

دوای ئەوەی کەمەڕوانی کوڕی محمد و هێزەکانی لە (الزاب) دا شکان دواتر مەڕوان وهێزەدۆڕاوەکەی بەرە و موصل ڕۆیشتن و خەڵکی (موصل) یش پردەکەیان بڕی و ڕێگای پەڕینەوەیان لێگرتن بۆیە مەڕوان چووە (بلد) و دواتر (دجلە)ی بڕی و گەیشتە (حران) دواتر لەوێوە بەرە و دیمەشق چوو دواتر لەوێوە بەرە و مصر(میسر) چوو و عبدالله کوڕی علی و هێزەکانی دوای کەوتن دواترعبدالله کوڕی علی هەندێ لە هێزەکانی بەدوای مەڕوان دا نارد ئیتر ئەم هێزەی عەبباسیەکان لەگوندێ لەگوندەکانی (الصّعید) بە ناوی (بوصیر) توشی مەڕوانی کوڕی محمد دەبن و لەوێدا دەیکوژن[٦٩].

هەر لەدەرئەنجامی ئەم شەڕە یەکلایی کەرەوەیەدا پانتاییەکی بەرفراوانی جیهانی ئیسلامی ئەو کاتە بەناوچە کوردنشینەکانیشەوە کەوتە ژێر دەسەلآتداریەتێکی نوێ کەئەوانیش عەبباسیەکان بوون.

ئەوەی کە لەم ڕووداوەدا پەیوەندی بەکورد و وولآتەکەیەوە هەبێ ئەوەیە کە (الزاب) وەکو گۆڕەپانی شەڕەکە مەیدانێکی گرنگی شەڕە یەکلایی کەرەوەکەبووە کەئاڕاستە و ڕەوڕەوەی مێژووی ناوچەکەی گۆڕی، بێگومان بەدوور نازانرێ کەخەڵکی کوردی جەزیرە لەڕیزەکانی سوپای مەڕوان دا هەبووبن وبەشداریان لەگەڵدا کردبێ لەم شەڕەدا جا ژمارەی بەشداریەکە کەم یان مام ناوەند یان زۆر بوبێ.

ئەو بەشدار بوونەش لەبەر چەند هۆکاریکە یەکێکیان ڕەنگە بەهۆی بوونی بەرژەوەندی ودەسەلآتی مەڕوانەوە بووبێ لەناوچەکەدا، چونکە ئەو پیاوە تەنانەت لە پێش بوونیشی بە خەلیفە سالآنێکی زۆر والی بووە لەوێدا و لایەنگری لەوێدا هەبووە ئەمەجگەلەوەی کە دایکی کوردبووە ئەوەی ئەم بۆچونەش زیاتر دەسەلمێنێت، ئەوەیە کە مەڕوان لەدوای تێکشکانی سوپاکەی لەشەڕی (الزاب الأعلى) پەنا دەباتەبەر ناوچە کوردنشینەکانی وەکو (البلد و حران) وپێیدا تێدەپەڕێ کەواپێدەچێ لەوێدا لایەنگری هەبووبن و بەجێگایەکی ئەمینی زانیبێ بۆخۆی و سوپاکەی بۆیە بەدوور نازانرێت کەویستبێتی لەوێدا سوپا کۆبکاتەوە و جارێکی تر بەگژ عەبباسیەکان دا بچێتەوە ،هەرچەندە سەرچاوەکان ئاماژە بەمە نادەن.

هەروەها لەبەرامبەریشدا بەدوور نازانرێت کە کورد ئەگەرچی بەژمارەیەکی کەمیش بوبێت بەشداریان لەڕیزەکانی سوپای عەبباسی دا کردبێت دژ بەهێزەکانی مەڕوان، چونکە ماوەیەك بوو بەشێکی بەرچاوی ناوچە کوردنشینەکانی ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان بووبوونە قەڵەم ڕەوی عەبباسیەکان.

کەواتە بەشێوەیەکی گشتی کورد ئەگەرچی بە ژمارەیەکی جەنگاوەری کەمیش بوبێت بەلآم بەڕێژەی جیاواز بەشداری لە هەردوو لایەنی شەڕەکە کردووە.

تەوەرەی چوارەم

ڕووداوە وردو لاوەکیەکانی پەیوەندیدار بەکورد و وولآتەکەی لەسالآنی(٤١-١٣٢ك/٦٦١-٧٤٩ز) لەلای الطبري

١- (طبري) لەیەکێك لەڕووداوەکانی سالٰی( ٤٣ك/٦٦٣ز) دا ڕووداوێکی پەیوەندیدار بە کورد دەنووسێت کە لەسەرەت دا گفتوگۆی نێوان دووکەس، دوودەسەلآتدارەو دەلٰێت: یەکێکیان بەئەوی تریان دەلٰێت: ئایا پێت گەیشتووە کە کوردەکان یاخی بوون لە چیاکانی فارس؟[٧٠] -ووتی ئەوەم پێگەیشتووە- ووتی پیلانمان داناوە و فەرمانمان دا کە ئامادەبین و بڕۆین لەگەلٰت دا تا ولآتی خەلٰکی کوفە بپارێزین وجەنگی دوژمنانیان بکەین، وولآتمان جێبهێلٰین، دواتر پێ ی ووت کوردەکان کێن ،چین ؟ ئێوە دەستەیەکتان لەخۆتان بەسە، دواتر ئەویتر پێ ی ووت: ئەم دوژمنە (کوردەکان) دەستەیەکی لەخەلٰکی کوفە بەسە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەیان[٧١].

ئەنجامی شیکردنەوەمان بۆ ئەم دەقەی طبري بۆمان دەردەکەوێت کە کوردەکان یاخی بوونە لە چیاکانی فارس ئەمەش ئەوە دەردەخات کە کوردەکان لەچیاکانی فارس دا ژیاون هەروەك لەم دەقەش دا دەردەکەوێت کە دەسەلآتدارانی کوفە کوردەکانیان بەهەڕەشەزانیووە بۆ سەر کوفە، بەلآم نەك هەڕەشەکەرێکی بەهێز. هەروەها نیشانەوە لەم دەقەدا دەردەکەوێت کەکوردەکان پەلاماردەر نەبوونە بەلٰکو بە مەترسی زانراون بۆسەر کوفە بۆیە هەولٰی ڕووبەڕووبوونەوەیاندراوە.

-لەسالٰی(٧٧ك/٦٩٧ز) دا(مطرف کوڕی المغیرە) لەدەسەلآتی حەجاج وخەلیفە عبدالملك دەرچوو.

لەسەرەتادا (مگرف) بەفەرمانی حەجاج لەسەر شاری مەدائن[٧٢] کرایە کاربەدەست، بەلآم دواتر (مطرف) بووە هاوپەیمانی(شبیب خارجي) و کەوتە بەرەی نەیار و دژ بە حەجاج و دەولٰەتی ئومەوی[٧٣].

لەیەکێك لەجموجۆلٰە سەربازیەکانی مطرف دا خۆی و هێزەکەی لەناوچەی الدسکرەوە دەرچوون بەرە و حەلوان، هەروەها لەسالٰی ٧٧ك حەجاج (سوید کوڕی عبدالرحمن السعدی) بۆسەر حەلوان و ماسبذان نارد، کاتێ کە سوید هەوالٰی ئەوەی پێگەیشت کە ئەو پیاوە بەرەو خاکی ژێر دەسەلآتی ئەودێت،خەلٰکی ناوچەکەوکوردەکان لەگەلٰ سوید کۆبوونەوە بەمەبەستی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو، بەلآم کوردەکان دەستیان بەسەر ناوچەی (ثنیە حلوان) داگرت لە بەرژەوەندی سویدی سەرکردەی سەربازی حەجاج و ئومەویەکان بە یارمەتی کوردەکان و خەلٰکی (البلد) جەنگی ئەو کەسایەتیەی کرد بەتایبەت لەوکاتەی کە ئەو دەیوویست لە مەدائینیەوە بەرەو چیا بڕوات[٧٤].

لە کاتێکدا کە ئەم پیاوە و هێزەکەی دەردەپەڕێنران لەناوچەکە لەلایەن لایەنگرانی حجاج و ئومەوی، ڕێگای هەلآتن وچوونیان دەگرتە بەر بۆ ئەم مەبەستە بە( ثنیە حلوان) دا ڕەت بوون کە کوردەکانی تێدابوون ئیتر دوای ئەنجامدانی شەڕێك لەگەلٰ کوردەکانی ئەوێدا دوای ئەوەی کەکوردەکانیان شکاند و ژمارەیەکیشیان لێکوشتن لەدەرئەنجام دا ئەو و هاوەلٰەکانی دەربازیان بوو بەرە و (هەمەذان) ڕۆیشتن[٧٥].

لەبەر رۆشنایی ئەم دەقانەی کە(الطبري) هێناویەتی دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کەژمارەیەکی بەرچاو جەنگاوەری کورد بۆ سوید کۆبونەوە لە بەرژەوەندی سوید و، بۆ رووبەڕووبونـەوەی مطـرف، جگـە لەمـەش کوردەکـان بـەهۆی ئەوەی کە خەڵکی (حەلوان) بوون بۆیە ئاسانتر دەستیان بەسەر ئەوێدا گرت لەبەرژەوەنـدی سـوید و حـەجاج کـە لەمەشدا کەوتنە بەرەی دژ بە(مطرف) و هاوەڵەکانی بەڵام کاتێك کە ناوبراو و هاوەڵانی لەلایەن هێزەکانی سوید و حـەجاج ەوە دەردەکـرێن لـەکاتی هـەڵاتن و رۆیـشتنیان دا لەگـەڵ کوردەگـانی ئەوێدا توشـی شـەڕ دەبـن و دوای ڕووداني شەڕێك کە لەبەرژەوەندیان تەواو دەبێت دەربازیان دەبێت، ئەمـە لەکاتێکدا کـە کوردەکـانی ئـەوێ جگـە لەوەی کە لایەنگری هێزەکان و بەرەی سوید و حەجاج و ئومەوی بوونە و لەبەرژەوەندی ئەوان جەنگاون لەهەمان کات دا، لەم شەڕەش دا ژمارەیەك جەنگاوەریشیان بۆتە قوربانی ، ئەمە جگە لەوەی کە حەلوان وەك ناوچـەیەکی کوردنشین بۆتە گۆرەپـانی ئـەم پـشێوی و شـەڕ و ناڕامیانـە، هـەر لـەم ڕووداوەش دا بۆمـان دەردەکـەوێت کـە کوردەکان لەلایەن بەرەی حەجاج و دەوڵـەتی ئومەویـەوە وەك ڕەگـەزێکی مرۆیـی گـرنگ بـەکارهێنراون لـەپێناوی بەدیهێنانی مەرامەکانیان.

بەمەبەسـتی ڕووبەڕووبونــەوەی(مطــرف) هێزەکــانی حــەجاج وئومەوییــەکان هێزێکــی زۆریــان کــۆکردەوە بەسەرکردایەتی(عودە بن وتاد/عودەی کوڕی وەتاد)، ئەم هێزەش پێك هاتبوو لەسـێ هـەزار جـەنگاوەری خـەڵکی ڕەی و هەزار جەنگاوەری کوفە کەحەجاج لەکوفـەوە بـۆی نـاردبوون و، حـەفت سـەد جـەنگاوەر لەخـەڵکی شـام، سـوپاکەش پێکهـاتبوو لەهـەزار جـەنگاوەر لەخـەڵکی ئەصـبهان[٧٦] و کوردەکـان، تـا بـەم چەشـنە ئـەم سـوپایە ژمارەیان بوو بەشەش هەزار جـەنگاوەر و ڕووبـەڕووی (مطـرف) و هێزەکـانی بوونـەوەو لـە دەرئـەنجامی ڕوودانـی جەنگێك دا هێزەکانی تێکدەشکێن و ئەویش دەکوژرێت[٧٧].

کەواتــە لــەم دەقــەوە بۆمــان دەردەکــەوێت کــە کوردەکــان ژمارەیــەکی دیــار و بەرچـاویان، وەکـو جـەنگاوەر بەکارهێنراون و، بەشداری پێکراون لەڕیزەکانی سوپای بەرەی عودەی و حەجاج بەمەبەستی بـەدیهێنانی ئامـانجی ئومەوییەکان ،کوردەکان هەروەك لەم دەقەش بەدیار دەکەوێ وەکو ڕەگـەزێکی مرۆیـی گـرنگ توانایـەکی جـەنگی باشـیان هـەبووە و شـان بەشـانی نەتـەوەی تـر لەلایـەن ئومەوییەکانـەوە سـوودیان لێـوەرگیراوە، هـەروەك لـەم نمونەیەش دەردەکەوێت کەبەدی هێنانی ئەم سەرکەوتنەی سوپای ئومەوی کاریگـەری کوردەکانیـشی پێـوە دیـار بووە کاتێك بەسەر هێزەکانی ناوبراو دا سەرکەوتوون.

لەڕووداوەکانی (ساڵی ٩٠ك/٦٩٠ز) (طبري) باس لەڕووداوێکی پەیوەندیدار بـە کوردەکـان دەکـات و دەنووسـێت (( لەساڵی ٩٠ك یەزیدی کوڕی المهلب و براکانی هەڵاتن لەگەڵ خەڵکی تر، کە لەبەندیخانەی حەجاج بوون و چونە لای (سلیمان بن عبدالملك) لەترسی حەجاج و (ولید کوڕی عبدالملك) هەرلەم بارەیەوە طبري دەنووسێت ((هۆکاری ئەم ڕووداوە ئەوەبوو کە : حەجاج بـۆ (رسـتقباذ) دەرچـوو بـۆ سـوپا نـاردن و گەڕانـەوە، چـونکە کوردەکـان بەسـەر

...ەوی خاکی فارس دا زاڵبوون. حەجاج لەکاتی دەرچوونی سوپاکەی دا لەگەڵ یەزید و براکانی (المفضل و عـ...) ئەم کەسایەتیانەی لەگەڵ سوپاکەی لەگەڵدابوو تاهاتنە (رستقباذ[78])).

...ەوە دەگەینە ئەودەر ئەنجامەی، کە کوردەکان بەسەر پانتاییەکی بەر فراوانی خاکی فارس دا زاڵبوون هەر لەم ...قەوە ئەم راستیە دووپات دەبێتەوە کە کوردەکان بەهەر ژمارە و ڕێژەیەك بووبێ لەخاکی فارس یاخود لە ...وچەکانی فارس دا ژیاون، بەهۆی ئەم زاڵبوونەی کوردەکان بەسەر تەواوی خاکی فارس دا کوردەکان کەوتوونەتە ...ەی نەیار و دوژمنی حەجاج و بەیاخی گەر حساب کراون وحەجاج لەم مەسەلە و هەڵوێستانە دا درێغی ...کردووە لەڕووبەڕووبونەوەی نەیار و دوژمنەکانی، بۆیە حەجاجیش سوپایەکی نارد دژ بەکوردەکان.

...ورکەکان لە ساڵی (٩٩ك/٦٩٩ن) شاڵاویان کردە سەر ئازەربیجان، لەئەنجامی ئەم شاڵاوەدا تورکەکان گورزێکی حەرگ بڕیان لەموسڵمانان وەشاند و کۆمەڵە خەڵکێکیان لە موسڵمانەکانی ئەوێ کوشت ئەم ڕووداوەش کاریگەری حرپی کردە سەر خەلیفە عومەری کوری عبدالعزیز(٩٩-١٠١ك/٧١٧-٧١٩ن)، بۆ ئەم مەبەستە سوپایەکی بەسەرکردایەتی (حاتم بن النعمان الباهلی) لەدژی تورکەکان نارد و لەئەنجام دا ژمارەیەکی زۆریان لەم تورکانە کوشت و پەنجا دیلیشیان لەتورکەکان گرت و هێنایانە لای خەلیفە عومەر[79].

...م دەقەی گێری یەوە دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە بە دووربنازانرێ ژمارەیەك لەکوردەکان کوژراین و بووبنە قوربانی لەسەردەستی تورکەکان لەم پەلامارەدا، چونکە لە هەرێمی ئازەربیجان دا ژمارەیەکی زۆر کورد دەژیان، بەلام بەفەرمانی خەلیفە عومەر تۆڵە لەم تورکانە کراوەتەوە و ژمارەیەکی زۆریان لەم بەرپەچ دانەوەیەی موسڵمانەکان کوژراون، لەهەمان کاتیش دا سنووری دەوڵەتی ئومەوی پارێزراوە، کە ئەمەش بەقازانجی موسڵمانەکان و لەنێویشیان دا کورد گەڕاوەتەوە.

تورکەکان لەساڵی ١١١ك/٧٢٩ز شاڵاویان کردە سەر ئازەربیجان، بەلام لەئەنجام دا هێزەکانی ئومەوی بەسەرکردایەتی (الحارث بن عمر) و هێزەکەی ڕووبەڕووی تورکەکان بوونەوە و تێکیان شکاندن[80].

کەواتە لە ئەنجامی ئەو سەرکەوتنەی ئومەویەکان بەسەر تورکەکان لەم شەڕەدا خەڵکی ئازەربیجان بەگشتی بەکوردیشەوە لەمەترسیەکانی ئەم پەلاماردانەداپارێزراون.

لەساڵی ١١٢ك/٧٣٠ز تورکەکان لە (اللان)ەوە شاڵاویان کردە سەر دەوڵەتی ئومەوی، ئومەویەکانیش بە سەرکردایەتی (الجراح بن عبدالله الحکمی) کە سەرپەرشتی خەڵکی شام و جەنگاوەرانی شام و ئازەربیجانی دەکرد لەم شەڕە دا ڕووبەڕووی تورکەکان بوونەوە، لە ئەنجام دا ئومەویەکان شکان و جراح و جەنگاوەرێکی زۆری موسڵمانەکان لەم شەڕە دا کوژران لە(مرج أردبیل) أردبیلیش داگیر کرا لەلایەن تورکەکانەوە[81].

کەواتە لەم ڕووداوەدا تورکەکان ناوچەیەکی کوردنشینیان(اردبیل) داگیرکرد وئومەویەکانیان لەوێدا شکاند.

بۆیە دوای ئەم ڕووداوە لە تۆڵەی شکستی موسڵمانەکان خەلیفە هشام، هێزیکی ئامادە کرد بە سەرکردایەتی (سعید بن عمرو الجرشی) و بەرە و ڕووی تورکەکانی نارد و لە دەرئەنجام دا تورکەکانی شکاند و ژمارەیەکی زۆری لێ کوشتن[82].

گبری لەیەکێ لەڕووداوەکانی ساڵی ١١٧ک/ ٧٣٥ز دەنووسێت: ((ئەسەد کوڕی عەبدوڵا کە یەکێ بوو لەکەسایەتیەکانی سەر بەخەلیفە هشام(١٠٥-١٢٥ک/٧٢٣-٧٤٢ز) بۆ ناوچەکانی خوراسان نێردرا ئەم کەسایەتیە بە چەند ناوچەیەك تێپەڕی، دواتر (ئەسەد) بەرە و (سمرقند)[83] ڕۆیشت و هەندێ کەلوپەلی دا بە خەڵکەکەی، و خواردن و کەلوپەلێکی زۆری پێبوو، ئەو کەل وپەلانەی کەکوردەکان پێویستیان پێی بوو دابەشی کرد بەسەریان دا، دواتر لەسمرقند ڕۆیشت و لەبلخ دابەزی))[84].

کەواتە ئەم دەقە بوونی کورد لە سمرقند دەسەلمێنیت بە هەر ڕێژە و ژمارەیەك بوو بێت.

مێژوونوس الطبري لە ڕووداوەکانی ساڵی ١٢٩ک باسی زاڵبوونی (عبدالله بن معاویه بن عبدالله بن جعفر بن أبو طالب) دەکات و دەبێتە واڵی بەسەر فارس.

عەبدوڵا نەیاری دەوڵەتی ئومەوی بوو، کاتێك کە لە کوفە تێکشکا بەرە و شاری مەدائن چوو، خەڵکی مەدائنیش بەیعەتیان پێدا، کۆمەڵە خەڵکێکی کوفە و هەروەها کۆیلەی خەڵکی کوفەش بەرە و لای عبدالله هاتن دواتر ئەو پیاوە لە مەدائنەوە بەرە و چیاکان ڕۆیشت و زاڵ بوو بەسەر ناوچەکانی (حەلوان وقومس[85] واصبهان و ڕەی)، کاتێك بەسەرئەم ناوچانە دا زاڵبوو لەأصبهان نیشتەجێ بوو[86]. کەواتە لەم ڕووداوە دا عەبدوڵا نەیاری دەوڵەتی ئومەوی بە سەر ناوچەی حەلوانی کوردنشین دا زاڵ بوو لەنێو ئەم ناوچانەی کە دەستی بەسەرداگرت.

الطبري لەدوای ئەم ڕووداوە ئاماژە بەوە دەکات کە ( سلیمان بن حبیب)کە کەسایەتیەکی نەیاری دەسەڵاتدارانی دەوڵەتی ئومەوی بوو، ئەم پیاوە لە یەکێك لە ڕووداوەکاندا لەئەهوازەوە هەڵات بەرە و سابور، لە ترسی ڕاوەدونانی هێزەکانی ئومەویەکان لەسابوریش دا کوردەکان تیایدا زاڵ بوون ئیتر سلێمان جەنگی کردن و کوردەکانی لە سابور دەرکردوپاشان بەیعەتی دا بە ناوبراو[87].

کەواتە سابور ناوچەیەکی کوردنشینی نێو هەرێمی فارس بووە، هەرچەندە گبری دەنووسێت کوردەکان بەهۆی ئەم شەڕەوە لەسابور دەردەکرێن بەڵام ڕەنگە تەنها جەنگاوەرە کوردەکان دەرکرابن بەهۆی ئەوەی کە لە شەڕەکە دا دەشکێن لە بەرامبەر هێزە هەڵاتوەکەی سلێمان دا بۆیە بەدور نازانرێ کە کوژراو لەکوردەکان و هێزەکەی سلێمانیش هەبووبێ بەهۆی ئەوەی کە بەشەڕ بەسەر سابوردا زاڵبوون.

## پەراوێزەکان

[1] -شەمرەزوور: ناوچەیەکی فراوانە لەهەرێمی چیاکان لەنێوان (اربیل-هەولێر) و (همدان) دایە خەڵکەکەی هەمووی کوردن، و شەمرەزوور چەند شار و گوندێك لەخۆوە دەگرێت مەڵبەندی شەمرەزوور گەورەیە خەڵکەکەی توند و پارێزراون، و لەشەمرەزوور دا ژمارەیەکی زۆر کورد دەژیان بەتایبەتی کوردەکانی جەلالیە و باسیان و حەکەمیە و سولیە.ابن حوقل:صورة الارض،ص٣١٤.

[2] فروه کوڕی نوفل الاشجعی : هاوەڵی پێغەمبەر ( د. خ ) بوو ، خەوارج بوو. (ابن سعد:م.س،ج٢،ص٣٤٩).

[3] الطبري : المصدر السابق: ج٣: ص١٨٨ " إبن الأثير : المصدر السابق : ج٣: ص٢٧٥ " أبن كثير : م.س : ج٨: ص١٩.

[4] النخيله : شوێنێك بوو لە نزیك كوفە لە عێراق لە سەر رێگای شام . ( ياقوت : الحموی : معجم البلدان : ج٥، ص٢٧٨ ).

[5] الطبري :م: س : ج٣،ص١٨٩ " إبن الأثير : م: س :ج٣: ص٢٧٥ " إبن كثير :م : س : ج٨: ص١٩.

[6] تأريخ اليعقوبي : ج٢:ص٢١٧.

(٧) اليعقوبي : المصدر السابق : ج٢: ص٢١٧ " إبن الأثير : م : س : ج٣: ص٢٧٥ " إبن كثير : م.س : ج٨،ص١٩.

[8] بریتیە لەو هەرێمەی کە دەکەوێتە نێوان رووباری دیجلە و فوراتەوە. هەروەها هەرێمی جەزیرە پێك دێت لە (دیار ربیعە و دیار مضر و دیار بکر ).

(دیار ربیعه) مەڵبەندەکەی موسڵ بوو و لە شارەکانی (الحديثة) و معلپای و (الحسينيه،زاخو) و تلعفر و نصيبين و دارا و (رأس العين) و جەزیرەی (إبن عمر) و زوزان پێك دەهات، بەلاَم (دیارمضر) بنکەکەی (الرقه )بوو و لە شاروناوچەکانی (المحترقه) و (الرافقه) و باجروان و (حران )و (الرها) و ترعوز و كفرسيرين پێك دەهات، بەلاَم دیاریەکر مەڵبەندەکەی (آمد/ دیاربەکر) بوو و لە شارەکانی میافارقین و تل فافان و حصن كيفا و (الفارحانيه)پێك دەهات.

بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین کە ژمارەیەکی زۆر لەشار و ناوچە و ناوەدانیەکانی هەرێمی جەزیرە کوردین و کورد رێژەیەکی زۆری دانیشتوانی جەزیرەی پێك دەهێنا بەتایبەتی (دیار ربیعه) کەژمارەیەکی زۆر ناوچەی کوردنشینی لەخۆدەگرت ئەمە جگە لە (دیاربەکر) کە زۆرینەی هەرە زۆری کوردنشین بوو، رەنگە هەر لەبەر زۆری ژمارەی کوردبووبێت لەجەزیرەدا کە (الذهبي) ووتبێتی: (وكان أهل الجزيرة أكراداً)، واتە خەڵکی جەزیرە کوردەکان بوون و کوردن.ابو الفداو:كتاب تقويم البلدان،ص٢٧٣.

الادريسي:م.س،ص٢٢٨.

(٩) الطبري :م . س : ج٣: ص٦٠٣،٦٠٤ " بەراوردی بکە بە: خليفة بن خياط : م. س : القسم الأول : ص٣٥١ "إبن الأثير : م. س: ج٤: ص١٥١.

[10] (نصيبين) : شارێکی جەزیرە بوو لەنێو (دیار ربیعه)دا. بەلاَم (إبن جبير) دەڵێت: ناوچەکانی دەوروبەری (نصيبين)کوردێکی زۆری لێدەژیا.المقدسي:م.س،ص١٢٥،١٢٤.رحله ابن جبير(بيروت:١٩٦٤م)،ص١٧١.

[11] سنجار: شارێکی جەزیرە بوو(١٦٠کم) لەرۆژئاوای شاری موصل دوورە. دەکەوێتە ناو چوارچێوەی (دیارربیعه)وە.القزويني:م.س،ص٣٩٣.المقدسي:م.س،ص١٢٥.

(١٢) إبن الأثير :م. س : ج٤: ص١٥١،١٥٢"بەراوردی بکەیە : خليفة بن خياط : م . س : القسم الأول : ص٣٥١،٣٥٢ " إبن كثير : م. س : ج٩، ص١١ .

(١٣) الطبري : م. س ،ج٣، ص٦٠٦ " إبن الأثير : م . س ، ص١٥٢" إبن كثير : م . س : ج٩،ص١١ .

(١٤) شبيب الخارجي : ناوی شبيب کوڕی يزيد کوڕی نعيم کوڕی قيس کوڕی عمرو کوڕی الصلب ، نازناوی باوکی (الضحاك ) بوو لەساڵی ٢٦ ك لەدایك بووە لەسەردەمی خەلافەتی (عبدالملك بن مروان) دەرچوو کەلەو کاتدا (حجاج بن يوسف) والی ئومەوی بوو

لەعێراق دوای ئەوەی کە لەسەرەتادا زنجیرەیەك سەرکەوتنی بەسەر هێزەکانی حجاج دا بەدەست هێنا لەناوچەی موصل بەلآم لەدولتردا شبیب لەرووبەروو بونەوەیەك دا لەگەڵ هێزەکانی حجاج لەنێوان شاری بەصرەو کوفە تێکدەشکێت و دواتر بەهۆی رووبلوی نقوم بوون دا لەساڵی ٧٧ك دەخنکێت : (ابن خلكان : م . س : ج٢،ص٤٥٤،٤٥٥) .

(١٥) خليفة بن خياط:م.س،ص٢٥١" اليعقوبي:تاريخ اليعقوبي،ج٢،ص٢٧٥،٢٧٤" الطبري : م . س : ج٣: ص ٦٠٧.

(١٦) الدسكره: لەرووی زمانەوانیەوە بە مانای خاکی ڕاستایی دێت،گوندێکی گەورەیە لەرۆژئاوای بەغدا لە سەر رێگای خوراسان .ياقوت الحموي:معجم البلدان،ج٢،ص٤٥٥.

(١٧) حەجاج کوڕی یوسف ئەلسەقەفی:کوڕی حەکەم کوڕی ئەبو عقیل کوڕی مسعود کوڕی عامر،قەیسی،سەقەفیە،دایکی ناوی فارعە کچی هما کوڕی عروە بوو،حەجاج لە کوشتن و خوێن ڕشتن و سزا سەیرەکان بێوێنە بوو،لە ساڵی (٩٥ك)لە شاری (واسط)مرد و هەر لەوێش نێژرا.ابن خلكان:م.س،ج٢،ص٢٩،٣١،٥٣.

(١٨) نفسه: ج: ص٦٠٧،٦٠٨ .

(١٩)خليفة بن خياط:م.س،ص٢٥٢" الطبري : م . س : ج٣: ص٦٠٨ " ابن الاثير:الكامل في التاريخ،ج٤،ص١٧٣،١٧٦" ابن كثير:م.س،ج٩،ص١٢،١٣.

(٢٠) هەرێمی ئازەر بیجان:

ئەم هەرێمە لەگەڵ هەرێمەکانی (ئەرمینیە و ئاران) بەیەکەوە ناویان دێت و دەکەونە ناو چوارچێوەی هەرێمی (الرحاب)ەوە شار و ناوچەکانی هەرێمی ئازەربیجان ئەمانەن:مەراغە و میانج و ئەردەبیل و ورثان و سیسرو برزە و تبریز و خوی ومرند و موقان و برزند وشاری أبروین و جابروان و أرمیە و شاری (زردشت شیز و سلماس) و شار و ناوچەی تر.

کورد لە دانیشتوانە رەسەنەکانی ئازەربیجان بوون چونکە لەکاتی فەتح کردنی ئازەربیجان و لە رێکەوتننامەی نێوان (حذیفة بن یمان/حوزەیفە کوڕی یەمان) ومەرزەبان دا لە ساڵی (٢٢ك/٦٤٣ز) ئاماژە بە کوردەکانی (البلاسجان و سبلان و ساترودان )دەکرێت و لە یەکێك لە مەرجەکانی ڕێکەتننامەکە هاتووە کە ئەم کوردانە دووچاری کێشە نەبنەوە.

المقدسي:م.س،ص٢٨١.ابن حوقل:م.س،ص٢٨٥.البلاذري:فتوح البلدان،ص٣٠٢.

(٢١) نفسة : ج٣: ص٦١٠،٦١١،٦٢٥ .

(٢٢) اليعقوبي : تأريخ اليعقوبي : ج٢: ص٢٧٥ .

(٢٣)الدينوري:الاخبار الطوال:ص٢٤٣" اليعقوبي:م.س،ج٢،ص٣٣٨ " الطبري : م . س : ج٤: ص٣٠٩،٣١٠ " إبن الأثير : الكامل في التأريخ : ج٥:ص١٢ " محمد جمال الدين السرور : الحياة السياسية في الدولة العربية الإسلامية :ط٥:(القاهرة:١٩٧٥)، ص١٢٦ .

(٢٤) الصفريه : ئەمانە دەستەیەك بوون لە خەوارج ولەلایەنگرانی،شوێنکەوتوانی زیادی کوڕی الأصفر بوون،( البغدادي : الفرق بين الفرق : تحقيق محمد محي الدين عبدالحميد : ( القاهره : ٢٠٠٥ م ) : ص٧٤ ). ئەم دەستەیە لە خەوارج ڕای جیاوازیان هەبوو لەگەڵ گروپەکانی تری خەوارج وەکو ( الأزارقة ) و ( النجدات ) و ( الاباضية ) لە چەند کاروبارێك دا وەك ئەوەی کە ( الصفرية) کان نەچوونیان بۆ جەنگ بەکفرو گوناە نەزانی ،بەڵکو گونجاو و سازاو بوون لەبارەی ئاین و بیرو باوەڕەوە و فەرمانیان نەکرد بە کوشتنی منداڵانی هاوبەش پەیداکەران ، تەکفیریان نەکردن ( الشهرستاني : الملل والنحل :ج١: ص١٥٣ ) .

(٢٥)البلاذري:فتوح البلدان،ص٣٣٠" الطبري : م . س : ج٤:ص٣١٠ " ابن الأثير : م . س : ج٥: ص١٢ .

(٢٦) نفس المصادر والصفحات .

(٢٧) کفرتوثا: ئەمە شارێکە لەهەرێمی جەزیرە و لەنێو (دیار ربیعە) دایە بەلآم أبو الفداو دەڵێت: کفرتوثا شارۆچکەیەکە لەنێو ویلایەتەکانی جەزیرە.المقدسي:م.س،ص١٢٥،١٢٤.ابو الفداء:م.س،ص٢٨٥.

[٢٨] الطبري :م . س : ج٤: ص٣١٧،٣٢٨"الدينوري:م.س،ص٢٤٤" اليعقوبي:تاريخ اليعقوبي،ج٢،ص٣٣٩،٣٣٨"ابن الأثير : الكامل في التأريخ :ج٥: ص١٢.

[٢٩] الطبري : م. س : ج٣ : ص٤٧٣ "ابن الأثير : الكامل في التأريخ : ج٤:ص٢٧ " الذهبي : العبر : ج١: ص٧٣ " ابن الوردي : تأريخ أبن الوردي : ج١: ص١٦٧ .

٣٠) الأخبار الطوال : ص٢٦٤ .

٣١) الطبري:م.س،ج٣،ص٤٨١. .

٣٢) الطبري :م. س : ج٣: ص٤٩٠ " ابن الأثير :م . س : ج٤: ص٣٧.

[٣٣] خازر : ڕوبارێکە لەنێوان أربل(هەولێر) و موصل یاخود لەنێوان زێی گەورە و موصل ،ئەمەش ئەو شوێنەبوو کە شەڕی (خازر)ی تیادا ڕوویدا. یاقوت الحموی : معجم البلدان : ج٢:ص٣٣٧ .

[٣٤] ابراهيم کوڕی الأشتر : إبراهيم کوڕی الأشترالنخعي کەسێکی ئازا و خانەدان بوو ، شیعەبوو و عبیداللەی کوڕی زیادی لەڕووداوی خازردا کوشت، دواتر ئەو یەکێ بوو لەپێشەواکانی مصعب کوڕی زبێر بوو و لەگەڵی دا کوژرا لەساڵی ٧٢ ك. ( الذهبي : سير أعلام النبلاء : ج٤: ص٣٥ .

[٣٥] عبيدالله کوڕی زیاد : پێشەوای عێراق بوو نازناوی (باوکی حفص) بوو،کاروبار و والێتی بەسرای وەرگرت لە ساڵی (٥٥)ك و والێتی خوراسانیشی وەرگرت ، یەکەم کەسایەتی موسڵمان بوو کە جیحونی بڕی و بیکند و ناوچەی تریشی فەتح کرد . دایکی ناوی مرجانە بوو لە کچەکانی پادشا فارسەکان بوو . (عبیداللەکوڕی زیاد)سەرکردەی سوپای ئومەوی بوو لەشەڕی خازر و هەر لەم شەڕەدا کوژرا. الذهبي : سير أعلام النبلاء : ج٣ : ص٥٤٧-٥٤٨ .

[٣٦] الطبري : م. س : ج٣: ص٥٢٣،٥٢٥" بەراوردی بکە بە: خليفة بن خياط :م . س : القسم الأول : ص٣٣٢ "الدينوري : الأخبار الطوال :ص ٢٧٠"إبن الأثير : م . س : ج٤: ص٦٠ " أبو الفداء : م . س : ج١: ص٢٧١" الذهبي : العبر في خبر من غبر : ج١: ص٧٣" إبن الوردي : م. س : ج١: ص١٦٧ " الحنبلي : م.س : ج١: ص٧٤.

(٣٧) الأخبار الطوال : ص٢٧٠،٢٧١ .

(٣٨) تاريخ الطبري :م.س، ج٣: ص٥٢٦.

[٣٩] نفسه : ج٣: ص٥٢٧"إبن خلدون :م.س، ج٣ : ص٣٥ .

(٤٠) الأخبار الطوال : ص٢٧٠,٢٧١،٢٧٢.

(٤١) ابن الأثير: الكامل في التأريخ: ج٤: ص٦٣.

(٤٢) الطبري : م . س : ج٣: ص٥٢٨ " إبن الأثير : م . س : ج٤: ص٧٢ " إبن كثير :م . س : ج٨:ص٢٤٢"الشيخ محمد الخضري :م . س : ج١،٢ : ص٣٣٧ .

[٤٣] اليعقوبي:تاريخ اليعقوبي،ج٢،ص٢٧٧"الگبري : م. س: ج٣: ص٥٣٩ "بەراوردی بکە بە : اليعقوبي : م . س : ج٢: ص٢٦٤،٢٦٥ " إبن الأثير : م . س : ج٤: ص٦٩ "إبن كثير : م . س : ج٨ : ص٢٤٧.

[٤٤] عبدالرحمن کوڕی الاشعپ:ناوی عبدالرحمن کوڕی محمد کوڕی الاشعپ کوڕی قيس الكنديە،لە ساڵی(٨٤)ك کوژرا،هەندێکیش دەڵێن بە نەخۆشی (سیل) مرد.(الذهبي:سير اعلام النبلاء:ص١٨٣،١٨٤).

[٤٥] سجستان: وڵاتێکی فراوانە،کەوتۆتە باشوری(هراه)ەوە و دووری نێوانیان دە ڕۆژە،خاکەکەی خۆڵەمێشی و دەشتاییە ، خورما و قەسپی زۆرە،زانا و فەقیهی ئایینی لێیە. ياقوت الحموي:معجم البلدان،ج٥،ص١٩٠،١٩١.

(٤٦) الطبري :م . س : ج٣: ص٦٧٤.

(٤٧) نفسه : ج٣: ص٦٧٤،٦٧٥ .

(٤٨) تأريخ اليعقوبي : ج٢: ص٢٧٧،٢٧٨ .

(٤٩) تأريخ الطبري :م.ن:ج٣، ص٦٧٩،٦٨٠.

(٥٠) نفسه : ج٣: ص٦٨٢ " بەراوردی بکە بە :اليعقوبي : م.س : ج٢ :ص٢٧٧،٢٧٨ .

(٥١) دير الجماجم : ئەمە دێرێك بوو لەبەرامبەر كوفە لەسەر رێگای و شكانی ئەو رێیەی كە دەچێتە بەسرە. الشابشتي : الديارات : تحقيق : جليل العكيه : ك١ : ١٩٩١ :(لندن:١٩٩١م):ص٦٤،٦٥ .

(٥٢) الطبري : م . ن : ج٣: ص٦٩٢" الذهبي : العبر : ج: ص٩٩.

(٥٣) مسكن: لەڕووی زمانەوانیەوە واتە ئەو شوێنەی کە مرۆڤ لێی نیشتەجێ دەبێت، شوێنێکە نزیکە لە ڕووباری دجیل ی ئەهواز.ياقوت الحموى :معجم البلدان،ج٥،ص١٢٧،١٢٨.

(٥٤) خليفه بن خياط:م.س،ج١،ص٣٦٦" الطبري : م . س : ج٣:ص٦٩٣ " لبن الأثير : م. س:ج٤: ٢١٥ .

(٥٥) كرمان: وولآتێکی،هەرێمێکی بەناوبانگ و گەورە و ئاوەدانە، چەندین شار و گوندی بەرفراوان لەخۆوە دەگرێت،دەکەوێتە نێوان فارس و مکران و سەجستان و خوراسان، مكران کەوتۆتە ڕۆژهەلآتیەوە،لە ڕۆژئاواشیدا خاکی فارسە، خوراسان کەوتۆتە باکوریەوە،باشوریشی دەریای فارسە، وولآتێکی زۆر بە خێر و بێرە و کشتوکالکردن و مەڕومالآت و دار و درەختە و بەرووبومی زۆرە. ياقوت الحموى:معجم البلدان،ج٤،ص٤٥٤.

(٥٦) الكبرى : م . س : ج٣ :ص٦٩٩ .

(٥٧) تأريخ خليفة بن خياط : القسم الأول : ص٣٧٥ .

(٥٨) اليعقوبي:تاريخ اليعقوبي،ج٢،ص٢٤٣" الطبري : م . س : ج٤: ص٢٢٤،٢٢٥،٢٦٨ " إبن الأثير : م.س : ج٥: ص٥٧ .

(٥٩) خوراسان:وولآتێکی فراوانە و دەکەوێتە نێوان هند و طخارستان و غزنە و سجستان و کرمان و عێراق و چەندین شاری جیا جیا لە خۆوە دەگرێت لە سالی(٣١ك)لە سەردەمی خەلافەتی(عوسمان کوڕی عەفان) فەتح کرا،خوراسان لە ڕووی زانستیەوە چەندین زانا و پیاوی گەورەی تیادا هەلکەوتووە لە بوارەکانی (فەرموودەناسی و فیقهی ئیسلامی و ئەدەبی) کە خزمەتێکی گەورەیان بە لایەنی ڕۆشنبیری و زانستی کردووە بۆ سەردەمەکەی خۆیان و دواتریش.ياقوت الحموى: معجم البلدان،ج٢،ص٣٥٢.

(٦٠) الكبرى :م .ن : ج٤: ص٣٦٨،٣٦٩.

(٦١) الدينوري :الاخبار الكوال :ص٣٣٤ "اليعقوبي : تأريخ اليعقوبي : ج٢:ص٢٤٣ " الكبرى : ج٤، ص٣٦٩"إبن الثير : الكامل ف تأريخ : ج٥، ص٥٨ " إبن كثير : م.س : ج١٠،ص٣١ .

(٦٢)الدينوري : م.س : ص٣٣٤ " اليعقوبي : تأريخ اليعقوبي : ج٢:ص٢٤٣ " الطبري : ج٤: ص٣٦٩،٣٧٠إبن الأثير : الكامل في التأريخ : ج٥: ص٥٨ " إبن كثير : م.س : ج١٠: ص٣١ .

(٦٣)خليفة بن خياط :تأريخ خليفة بن خياط : ج٢: ص٤٢٠،٤٢١ "اليعقوبي :تاريخ اليعقوبي :ج٢:ص٢٤٣" الطبري : ج٤: ص٣٧٠ " إبن الأثير: الكامل في تأريخ : ج٥: ص٥٨ " إبن كثير : م.س : ج١٠: ص٣٢ .

(٦٤) الزاب الأعلى -زێی گەورە : ڕووبارێکە لەنێوان موصل و إربل (هەولێر) . (ياقوت الحموي : معجم البلدان : ج٣،ص١٢٣ ).

(٦٥)اليعقوبي:تاريخ اليعقوبي،ج٢،ص٣٥٦"الطبريُ : تأريخ الطبري : ج٤: ص٣٨٤ " ابن خلدون : م.س : ج٣: ص١٥٩،١٦٠.

(٦٦) خليفة بن خياط: تأريخ خليفة بن خياط: ج٢: ص٤٢٧ " إبن الأثير : م.س: ج٥:ص٦٩ .

(٦٧) الطبري : م.س : ج٤ : ص٣٨٤ " بڕوانە: المسعودي : التنبيه و الأشراف : ص٢٨٣ "ياسين العمري:منية الاد باء في تأريخ الموصل الحدباء:تحقيق : سعيد الديوجي : (الموصل : ١٩٥٥م ) : ص٣٨ " ابن الأثير : م.س : ج٥: ص٦٩ " العبري : تأريخ مختصر الدول : ط٢ : (بيروت : ١٩٥٦ م )،ص١٢٠"بۆزیاتر زانیاری لەم بارەیەوە بڕوانە ئەم سەرچاوانە : ابن منظور:(مختصر تأريخ دمشق لابن عساكر) تحقيق :ابراهيم صالح:ج٢٤:ط١:(دمشق :١٩٨٨م):ص٢٢٣ .

٢-J – J Saunders: A history of Medieval Islam-first published :( London: ١٩٧٨: p: ١٠٢

(٦٨) الطبري : ج٤: ص٣٨٥" المسعودي : مروج الذهب ومعادن الجوهر : ج٢:ص٢٢٧.

(٦٩) خليفة بن خياط : تأريخ خليفة بن خياط : ج٢: ص٤٢٨ " الذهبي : العبر في خبر من غبر : ج١: ص١٧٨"ابن الوردي : م.س : ج١: ص١٨٢ " ابن خلدون : م.س : (بيروت : ١٩٩٩ م ) :ج٣: ص١٦٠،١٦١" فاروق عمر : الخليفة المقاتل مروان بن محمد : ( بغداد : ١٩٨٥م ) : ص١١٥،١١٦ .

(٧٠) لەهەرێمی فارس دا کوردێکی زۆر دەژیان لەئاوەدانی و شوێنەکانی خۆیان کە پێیان دەوترا (زموم ) لەم بارەیەوە ابن خردانبة دەنووسێت : هەرێمی فارس چەند ( زموم) ێکی کوردەکانی لێبوو وەکو ( زموم الحسن کوڕی جیلویە کەپێ ی دەوترا ( البازنجان ) و ( زموم أردام کوڕی جولنا ) و ( زموم القاسم کوڕی شهر براز کەپێ دەووترا ( الکوریان ) و ( زموم الحسن کوڕی صالح کە پێ ی دەوترا (السوران ) : (ابن خردانبة : المسالك و الممالك : ص٥١).بەڵام(الأصطخري) گەڕەکە کوردەکان لەهەرێمی فارس بەژمارەیەکی زیاتر لەمە دەهێنێت و لەم بارەیەوە دەنووسێت : گەڕەکە کوردەکان لە هەرێمی فارس دا ئەمانە بوون : ( الرمانیە و الزامانیە و مدبروحی محمد بن بشر وحی محمد بن اسحاق القبلیە والبنداد مهریە والصباحیە والاسحاقیە والردمانیە و الزنجیە والصقریە و المبارکیە والعجیبیە و الجلیلیە . (الاصطخري : كتاب الأقاليم : د . م : د . ت ) : ص٥٩ .

(٧١) الطبري : تأريخ: ج٣: ص٢١٠ .

(٧٢)مەدائن: ئەم شارە لەلایەن(انوشروان کوڕی قباذ) کە یەکێك بوو لە پادشاکانی فارس بنیاد نرا و کردیە کۆشکی پادشایی خۆی،لە ساڵی(١٦ك) لەلایەن(سەعد کوڕی ئەبو وەقاص) فەتح کرا،فارسەکان پێیان دەوت(توسفون)بەڵام عەرەبەکان پێیان دەووت(الطیسفون).یاقوت الحموی:معجم البلدان،ج٥،ص٧٥.

(٧٣) نفسه: ج٣: ص ٦٤٥ ،٦٤٦،٦٤٧" ابن الأثير: م.س : ج٤: ص١٧٨،١٧٩ .

(٧٤) الطبري : م.س : ج٣: ص٦٥٠ " ابن الأثير :م.س : ج٤:ص١٧٩،١٨٠ .

(٧٥) الطبري :م.س : ج٣ : ص٦٥٠،٦٥١ .

(٧٦) ئەصبهان: شارێکی گەورە و بەناوبانگە ، وە ناوی هەرێمێکیشە بە تەواوەتی، لەو شارەدا زانا و ئیمامی زۆر دەرکەوتن بەتایبەتی لەبواری سەنەدی فەرموودەی پێغەمبەر(د.خ) ، خەڵکی لەبەرکەری فەرموودەیان زۆر بوو، لە ساڵی(١٩ك) فەتح کراوە. یاقوت الحموی:معجم البلدان،ج١،ص٢٠٩.

(٧٧) الطبري : م.س : ج٣ : ص٦٥٢،٦٥٥ .

(٧٨) نفسه:ج٣: ص٧٤٨.

(٧٩) خليفة بن خياط : م.س : القسم الأول ، ص٤٣٢،٤٣٣ " الطبري :م. س :ج٤ ، ص٦٥" ابن الأثير : م.س : ج٤ ، ص٣١٥" ابن كثير : م.س : ج٩ ، ص١٥٢ .

(٨٠) الطبري : ج٤، ص١٤٧ " ابن الأثير : الكامل: ج٤،ص٣٩١ .

(٨١)اليعقوبي : تأريخ اليعقوبي : ج٢،ص٣٢٩" الطبري : ج٤، ص١٤٨.

(٨٢) الطبری:م.س،ج٤،ص١٤٨-١٤٩.

(٨٣) سمرقند: وولاتێکی ناسراو و بەناوبانگە، لەسەر باشوری دۆڵی(الصغد) بنیادنراوە،شورا و باخ و کێلگە و بورج و دار و درەختی زۆرە، کۆشکی سولتان و مزگەوت و بازاری لێیە،رووباریش بەناو شارەکەدا تێدەپەڕێت.یاقوت الحموی:معجم البلدان،ج٣،ص٢٤٨،٢٤٧.

(٨٤) نفسه : ج٤:ص١٧٢،١٧٣،١٦٧.

(٨٥) قومس: هەرێمێکی گەورە و بەرفراوانە زۆر شارو گوند لەخۆوە دەگرێت،کەوتوتە لاپاڵی کلکەی چیاکانی (گبرستان) وە ناوەندەکەی (دامغان)ە،کە لە نێوان رەی و نیسابوردایە. یاقوت الحموی:معجم البلدان،ج٤،ص٤١٥،٤١٤.

(٨٦) الطبري : م . س : ج٤،ص٣٤٦،٣٤٥.

(٨٧) نفسه : ج٤:ص٣٤٦.

لیستی سەرچاوەکان

**یەکەم: سەرچاوە ڕەسەنەکان:**

**بەزمانی عەرەبی:**

إبن الأثير: عزالدين ابي الحسن علي بن ابي الكرم محمد بن محمد بن عبدالكريم بن عبد الواحد الشيباني (ت: ٦٣٠ه/١٢٣٢م).

- الكامل في التأريخ: دار صادر، ط٤، (بيروت: ٢٠٠٣م)

- الادريسي: محمد بن محمد بن عبدالله(ت: ٥٦٠ه/١١٦٤م)

- كتاب نزهة المشتاق في ذكر الامصار والاقطار والبلدان والجزر والمدائن والافاق، (د.م: د.ت).

الأصطخري: ابواسحاق ابراهيم بن محمد الفارسي (ت: ٣٤٠ه/٩٥١م)

- كتاب الاقاليم: مكتبة المثنى (بغداد: د،ت).

البسوي: ابو يوسف يعقوب بن سوفيان (ت: ٢٧٧ه/٨٩٠م).

- كتاب المعرفة والتأريخ، المطبعة الأرشاد، ط٢، (بغداد: ١٩٧٤م).

البلخي: أبو زيد أحمد بن سهل (ت: ٣٢٢ه/٩٣٣م).

- البدء و التأريخ، دار الكتب العلمية، ط١ (بيروت: ١٩٩٧م).

الحنبلي: أبو الفلاح عبدالحي بن العماد (ت: ١٠٨٩ه/١٦٧٨م)

- شذرات الذهب في اخبار من ذهب، دار الكتب العلمية، ط١، (بيروت: د.ت).

ابن حوقل: أبو القاسم محمد بن علي النصيبي (ت: ٣٦٧ه/٩٧٧م).

- كتاب صورة الأرض، منشورات دار مكتبة الحياة (بيروت: ١٩٧٩م).

ابن خلكان: أبو العباس شمس الدين أحمد بن محمد بن أبي بكر (ت: ٦٨١ه/١٢٨٢م).

- وفيات الاعيان و أنباء أبناء الزمان، تحقيق: د.إحسان عباس، دار صادر، ط٤، (بيروت:٢٠٠٥م).

خليفة بن خياط: أبو عمر وخليفة بن خياط بن أبي هبيرة (ت: ٢٤٠ ه/ ٨٥٤م).

- تأريخ خليفة بن خياط، تحقيق: سهيل زكار: منشورات وزارة الثقافة و السياحة والارشاد القومي، ط٢، (دمشق: ١٩٦٨م).

الدينوري: ابو حنيفة احمد بن داود (ت: ٢٨٢ه/٨٩٥م)
– الاخبار الطوال: تحقيق: عبدالمنعم عامر: منشورات وزارة الثقافة والارشاد القومي، ط١، (القاهرة: د.ت).
الذهبي: شمس الدين محمد بن أحمد بن عثمان بن قايماز التركماني (ت: ٧٤٨ه/١٣٤٧م).
– تأريخ الاسلام ووفيات المشاهير والاعلام: تحقيق :عمر عبدالسلام تدمري ،دار الكتاب العربي،ط٣ (بيروت:٢٠٠٢م).
– سير أعلام النبلاء: ج١:تحقيق: حسين الأسد، مؤسسة الرسالة، ط١ (بيروت: ١٩٨١م)، ج٢: تحقيق: شعيب الأرنؤوط: مؤسسة الرسالة، ط١ (بيروت: ١٩٨١م)،ج٣: تحقيق: محمد نعيم العرقسوسي ومأمون صاغرجي: مؤسسة الرسالة، ط١ (د.م: ١٩٨١م)،ج٩:تحقيق: كامل الخراط: مؤسسة الرسالة، ط١ (بيروت :١٩٨١م) .
(ابن سعد: محمد بن سعد الزهري: (ت: ٢٣٠ه/٨٤٤م).
– الطبقات الكبرى: تحقيق: إحسان عباس، دار صادر للطباعة والنشر، ط١، (بيروت: ١٩٨٠م).
الشهرستاني: ابو الفتح محمد بن عبدالكريم: (ت: ٥٤٨ ه/١٠٥٣م).
–الملل والنحل: تحقيق: د.صلاح الدين الهواري: دار الهلال: ط١ (بيروت: ١٩٨٨م).
الصفدي: صلاح الدين خليل بن ابيك: (ت: ٧٦٤ه/١٣٦٢م).
– الوافي بالوفيات: تحقيق: أحمد الأرنؤوط و تركي مصطفى: دار أحياء التراث العربي: ط١، (بيروت: ٢٠٠٠م).
الطبري: ابو جعفر محمد بن جرير: (ت: ٣١٠ ه /٩٢٢ م).
– تأريخ الأمم والملوك: تحقيق: مصطفى السيد وطارق سالم، مطبعة التوفيقية: (القاهرة: د.ت).
إبن الطقطقي: محمد بن علي بن طباطبا (ت: ٧٠٩ ه /١٣٠٩م).
– الفخري في الاداب السلطانية والدول الاسلامية: مطبعة المعارف: ط٢ (القاهرة: د.ت ).
ابو الفداء: الملك المؤيد عمادالدين ابو الفداء إسماعيل بن علي بن محمود إبن عمر بن شاهنشاه بن أيوب (ت:٧٣٢ ه/١٣٣١م).
– المختصر في أخبار البشر: دار الكتب العلمية: ط١ (بيروت: ١٩٩٧م).
– تقويم البلدان،بأعتناء:رينوماك كولين ديسلان، دار الطباعة السلطانية، (باريس:١٨٤٠م).
القزويني: إبو عبدالله زكريا بن محمد (ت: ٦٨٢ه/١٢٨٣م).
– أثار البلاد وأخبار العباد، دار صادر،( بيروت: ١٩٦٠م).
إبن كثير: عمادالدين أبو الفداء إسماعيل بن كثير الدمشقي (ت: ٧٧٤ ه/١٣٧٢م).
– البداية والنهاية: دار البيان الحديثة: ط١،(القاهرة: ٢٠٠٣م).
الكازروني : الشيخ ظهرالدين علي بن محمد البغدادي،(ت: ٦٩٧ه/١٢٩٧م).
–مختصر التأريخ: من أول إلى منتهى دولة بني العباس: تحقيق: مصطفى جواد،مطبعة الحكومة،(بغداد: ١٩٧٠م).
المسعودي: ابو الحسن علي بن الحسين (ت:٣٤٦ ه/٩٥٧م).
– مروج الذهب ومعادن الجوهر: شركة العالمية لكتاب، ط٢ (بيروت: ١٩٨٩م).
– التنبيه والاشراف، دار ومكتبة الهلال (بيروت: ١٩٨١م).
–مختصر تأريخ دمشق لإبن عساكر: تحقيق: إبراهيم صالح: دار الفكر،ط١ ،(دمشق: ١٩٨٨م).
ابن الوردى: زين عمر بن مظفرات (ت: ٧٤٩ه/١٣٤٨م).
– تاريخ ابن الوردى: دار الكتب العلمية: ط١(بيروت :١٩٩٦م) .
ياسين العمري: إبن خيرالله، (ت:١٢٣٢ه/١٨١٦م).

- منية الأبناء في تأريخ الموصل الحدباء: تحقيق: سعيد الديوجي: مطبعة الهدف،(الموصل: ١٩٥٥م).
اليافعي: ابو عبدالله بن اسعد بن على بن سليمان اليافعي اليمني المكي (ت:٧٦٨هـ/١٣٦٦م).
-مراة الجنان وعبرة اليقظان في معرفة مايعتبر من حوادث الزمان،منشورات محمد علي بيضون،دار الكتب العلمية،ط١(بيروت: ١٩٩٧م).
ياقوت الحموي: شهاب الدين ابو عبدالله الحموي الرومي البغدادي (ت:٦٢٦هـ/١٢٢٩م) .
- معجم البلدان ،دار صادر، ط٢(بيروت: د.ت).
اليعقوبي: احمد بن ابي يعقوب بن جعفر بن وهب ابن واضح (ت: ٢٩٢هـ/٩٠٥م).
- كتاب البلدان، دار احياء التراث العربي،ط١(بيروت:١٩٨٨م).
- تاريخ اليعقوبي، دار صادر (بيروت: ١٩٦٠م).
سەرچاوە نوێیەکان :
* بەزمانی عەرەبی:
حسن ابراهيم حسن: الدكتور
- تاريخ الاسلام: دار احياء التراث العربي: ط٧(بيروت:١٩٦٤م).
فاروق عمر فوزي: الدكتور
- الخليفة المقاتل مروان بن محمد :دار العربية :(بغداد :١٩٨٥م).
قصي الحسين: الدكتور
- موسوعة الحضارة العربية (العصر الأموي) دار البحار (بيروت: ٢٠٠٤م).
محمد جمال الدين سرور: الدكتور
- الحياة السياسية في الدولة العربية الاسلامية خلال القرنين الأول والثاني بعد الهجرة: دار الفكر العربي: ط٥ (القاهرة: ١٩٧٥م ).
الشيخ محمد الخضري:
- الدولة الاموية: دار المعرفة، ط٨ (بيروت: ٢٠٠٥م).
*بەزمانی ئینگلیزی:
first published (London: ١٩٧٨)..J-J Sannders: A History of Medieval Islam -

# شاندنێن كاسوليكى و كاريگەريا وان يا رموشەنبيرى و جڤاكى لسەر جڤاكێ كوردستانێ

د.فرست مرعى
كوليژا پەروەردە – زانكۆيا دهۆك

پێشەكى:

دەمێ سولتانێ ئوسمانى (محمد الفاتح)ى (١٤٥١ – ١٤٨١) ل سالا (١٤٥٣) بارژێرێ قەسەنتينيە پايتەختێ ئيمبرلتوريەتا بيزەنتى و بنگەهێ كەنيسا رۆژهەلاتيا جيهانى (ئەرسوزكسى) ڤەكرى، ئەركەكێ ب زەحمەت كەتە سەر ملێن وى ئەوژى موكومكرنا پەيوەنديێن بهێن بوو هەر ل دەسپێكێ دناڤبەرا موسلمانێن قەستەنتينيە ڤەكرى و ديڤچوويێن كەنيسا رۆژهەلاتى ئەوێن ژلايێ ئايينى و زمان و داب و نەريتان ڤە ژ نوسمانيان د جودا ئەوژى پشتبەستن ل سەر راسپاردێن قورئانا پيرۆز و سنەتا پێغەمبەرى (سلاڤێن خودێ ل سەر بن) ئەوێن وەسيەت ل موسلمانان كرى ئازاديا ئايينى بدەنە خودان پەرتووكان (جهى و مەسيحيان) ئانكو ئەوێن پەرتووكا پيرۆز هەى، و كەل و پەل و سامانێ وان ب پارێزن ب مەرجەكى ئەوژى وەلاتا خۆ بدەنە دەولەتا ئيسلامى ئەڤە ژلايەكى ڤە و دانا جزيێ ژلايەكێ ديڤە. و دڤى بوارى دا رۆژهەلاتناسێ ناڤدارێ بريتانى (هاملتون جيب) ئاماژێ پێ ددەت و دبێژيت: (دەربارەى هەلويستێ ئوسمانيێن دەسپێكێ ل گەل نەموسلمانان ژ ئاكنجيێن وەلاتێن ب كوتەكى ڤەكرين، وەكى ديار ژ هەلويستێ ئيسلامێ يێ بەرنياس يێ دويربوو، و وەكى هەلويستى موسلمانێن دەسپێكێ نەبوو ئەوێن وەلاتێ شامێ ڤەكرى دەمێ ب هزرەكا ڤەكرى رەفتار لگەل گاورێن خەلكى وەلاتێن هاتينە ڤەكرن كرى...)(1).

ئەرسوزكسى بەترياركيەكا سەرەكى يا جيهانى بوو ل پايتەختێ نوسمانيان ئەستەنبولێ هەبوو و سێ بەترياركيێن دى هەبوون كو تێدا رێ و رەسم ب زمانێ سلاڤى د هاتنە ئەنجامدان و چ ناكوكيێن بيرو و باوەران دناڤبەرا وان بەترياركان و يێن ئورسوزكسيێن يونانى دا نەبوون، لێ ژ ئەنجامێ هندەك بزاڤێن نەتەوەيى و هندەكێن دى يێن خێزانى ناكوكى پەيدابوون لەورا بوونە مەلبەندێن هەستێ نەتەوەى، و ژ بەر ڤێ چەندێ دەمێ دەليڤە ژبۆ بريار دانا سياسەتا جێگير بەرامبەر كەنيسا ئەرسوزكسى ب شێوەكێ گشتى بۆ

سولتان (محمد الفاتح) هەلکەفتی، هەمی ژێردەستێن خو بێ جوداهی دانانە ژێر دەستهەلاتا بەتریارکیا جیهانی ل ئەستەنبولێ. و دهەمان دەمدا سولتانی (جینادیوس سکولاریوس) بو پلا بەتریارکێ کەنیسا ئەرسوزکسی دانا ئەو پلا بو ماوەکێ درێژ مایە ڤالا، و سولتانی ب دەستێ خو گوپال و ژینگەهـ و گوستێرك پێشکێشی بەتریارکی کرن و بڤێ چەندێ سولتانێ موسلمانان پێگیری ب هەمی رێ و رەسمێن ل سەردەمێ بەتریارکێن بیزەنتی ل بارێن هوسا کر، و بەتریارك (جینادیوس) بوو پاشایێ خودانێ سێ ریشیان و ناسناڤێ (ملت باشی) ئانکو سەرۆکێ تائیفێ پێ هاتە بەخشین و (بەراتە: ئەوژی بەلگەنامەکا سولتانی یە حوکمێ هەمی مەسیحیان تا رادەکی بێ زێرەڤانی دهێتە راسپاردن) ژێ وەرگرت[٢].

سولتانێ ئوسمانی ئەو ناکوکی و هەڤرکیێن بیر و باوەران و لاهوتیێن دناڤبەرا تائیفە و کەنیسێن مەسیحی دا روی ددان نە دزانین، لەورا ل دەسپێکێ وی دڤیا هەمی مەسیحیێن ئوسمانی بێ جوداهی بکەڤنە ژێر سەرکێشیا بەتریارکێ ئەرسوزکسیێ یونانی، و مەترانێ ئەرمەنی (یواکیم) ئێکەم کەس بوو ژ ڤی دەستووری دەرکەتی، و ل دەمێ هەبوونا خو لگەل (محمد الفاتح) ل بـاژێرێ (بورصە) پشتی ڤەگوهاستنا وی لگەل دەستەکا سولتانی بو پایتەختی (ئەستەنبولێ) شیا ڤیانا سولتانی بدەست خو ڤەبینیت، و سەرۆکێ تائیفا ئەرمەنی شیا دانپێدانێ ژسولتانی وەربگریت و ئەو لگەل بەتریارکێ یونانی ل ئاستەکی بیت، و بەتریارکێ یونانی ب ناسناڤێ (ملت باشی) یان سەرۆکێ هەمی مەسیحیێن نەسلاڤی هاتە بناڤکرن.

هەر وەسا تائڤا یەهودی ئەوا لگەل مەسیحیێن نەسلاڤی لژێر دەستێ بەتریارکێ ئەرمەنی هاتە دانان (و شیا خو ژ وێ ژێردەستیێ رزگاربکەن، و (موشێ کاسپالی) ب پلا (حاخام باشی) هاتە دامەزراندن و سولتانی دەستهەلاتا وەکی دەستهەلاتا بەتریارکێ ئەرسوزکسی لسەر کورێن ئایینێ وی د دەولەتێ دا پێ بەخشی، و د رێ و رەسمان دا دەسپێکێ بو حاخامێ مەزن د هاتە بەخشین نەکو بو بەتریارکی، و د هندەك ڤەگێرانان دا ئەو ل پلا خو ئێکسەر پشتی سەرۆکێ زانایێن (موسلمانان) دهات[٣].

کەنیسا رۆما و کەنیسێن رۆژهەلاتی:

ئەورۆپا هەر ژ شەرێ سەلیبی یان هەوێن فرەنسی وەکی هندەکان دڤێت پێ ب ناڤ بکەن (هەر وەکی ناڤکرنا وێ ژ جورێ وێ دهێتە گوهورین) ئێکەم جار پەیوەندی ب موسلمانان کر[٤]. لێ ئەو پەیوەندی د راستیا خودا ژ ئاشتیێ د دویربوون، و ئێك ژ ڤەکولەرێن روسی دڤی دەربارەی دا دبێژیت: "جیهانا مەسیحی راهاتبوو لسەر بەرێخودانا موسلمانان ب بەرێخودانەکا بو دژوارترین دوژمنێن خو، و پاپایان خو ژ هەمی رێکێن هەی نەددا پاش ژبو ئاگر خوشکرنا وێ کەربێ و دوو دل ژی نەدبوون هەتا ژ وەرگرتنا پێرابوونێن وەکی

قەدەغەکرنا هەر پەیوەندییەکا بازرگانی ل گەل موسلمانان و گەف لێکرنا سەر پێچەکەران ژ بێ بارکرنا ژ کەنیسێ و سەپاندنا غەرامەکێ لسەر وان هندی بهایێ وان تشتێن بەرەڤ وەلاتێن موسلمانان ڤە ببرن[٥].

و ژیانا ئایینی و پێشکەفتنا ئابووری ل دەڤ تائیفێن مەسیحیێن رۆژهەلاتی دێ ئێکسەر ب مێژوویا ئایینی یا رۆژئاڤایا مەسیحی ڤە بهێنە گرێدان ئەوژی ژبەر گرێدانا بەرژەوەندیێن کەنیسا کاسولیکیی یا رۆمانی ل گەل کەنسێن بروتستانتی و پاشی ل گەل تائیفێن مەسیحیێن رۆژهەلاتی، ب ولتایەکا دی دێ چارەنڤیسێ کەنیسێن رۆژهەلاتی سوبەهی ل هندەك بواران پەیوەندیدار بیت ب پەیوەندیەکا ئێکسەر و موکوم ب وی کارێ فریکەرێن کەنیسێن رۆژئاڤا (مبشرون – منصرون) لسەر ئەردێ رۆژهەلاتی پێ رابوون.

ئێکگرتنا کەنیسان لژێر دەستهەلاتا پاپای و بگورەی باوەریا کەنیسا رومانی و رێ و رەسمێن وێ، کارێ بەردەوامێ پاپای بوو، دەربارەی مەسیحیێن رۆژهەلاتی[٦]. و ئەڤە ئەو بوو یا کو دووپاتی لێ هاتیەکرن د بریارێن کۆرێ فیراری – فلورەنسا (١٤٣٨٠ –١٤٤١ز) و هژمارتنا وێ وەك مەرجیەعیەتا بنەمای د پێکئینانا پەیوەندیان دا دناڤبەرا هەردوو لایەنان دا. لێ کاودانێن سیاسی ئەوێن ل وی دەمی بەربەلاڤ نەدباش بوون، ئەورا ئەو پەیوەندی زێدەتر بەرەڤ خرابیێ ڤەچوون و ڤی کۆری ل سالا (١٤٨٤) ل قەستەنتینیە کۆمبونەك گرێدا و تێدا بریاردا کو کۆرێ فلورەنسا بێ ژ کار کەفتی بیت، و هەرسێ بەتریارکیێن دی (اورشلیم القدس و الاسکندریە و قەستەنتینیە و هەروەسا کەنیسا روسی چ زەحمەت د رێکەفتنا لسەر بریاران نەدیتن، لێ دام و دەزگەهێن پاپایێن رۆمانی ژ ڤێ چەندێ بێ ئومێد نەبوون و ژ وێ پلانا بۆ دانای دویر نەکەتن[٧].

ئوسمانی و دانا (ئیمتیازان) بۆ کاسولیکان:

پشتی سولتانێ ئوسمانی سەلیمێ ئێکێ (١٥١٢ – ١٥٢٠)[٨] شیای پرانیا وەلاتێ عەرەبی بێخیتە دناڤ دەولەتا ئوسمانی دا، ئەو تووشی کەتوارکێ دژوار بوو ئەوژی هەبوونا تائیفێن مەسیحیێن دی یێن نە ئەرسوزکسی یە وەکی قوبتیان ل مسرێ، و سریانی ل شامێ، نەستوری ل ئیراقێ و کوردستانێ، لەورا ل دەستپێکێ دەسپێکر کو لسەر دەولەتێ پێدڤیە هندەك میکانزمێن نوی پەیدا بکەت ژبۆ رەفتارکرنا لگەل کەنسێن مەسیحیێن نەخەلقدونی ئەوێن ئەرسوزکسی ب کەنیسێن هرتقیە ئانکو خودانێن بدعێ د هەژمێریت، و پشتی مرنا بلەزا سولتان سلیمی کورێ وی سلێمان ئەوێ مێژوونڤیس ب گەلەك ناسناڤ و سیفەتان ب ناڤ دکەن ژ وان "العظيم و القانوني" جهێ وی گرت، ئەوە بێ کو بێی دوو دلی لسەر سوزناڤا هەڤپەیمانا بەرگری و هێرشی لگەل شاهێ فرەنسی (فرانسوێ ئێکێ) رێکەفتی و هەژی یە بێژین کو (فرانسوێ ئێکێ) چوو بوو

دناڤ هەڤرکیەکا نەوەکهەڤ دا لگەل شاهێ ئەسپانی (شارکێ پێنجێ) ئەوێ شیایی نیڤا ئەورۆپا لـژێر کـۆنترولا خۆ بکەتە ئێك و شیا هەڤرکێ خۆ (فرانسوی ئێکێ) ل شەرێ (بافیـام) تووشـی شکەسـتنێ بکـەت و ئێخـسیر کەت و بهاڤێتە د زێدانێ دا[9].

و ئەڤ هەڤپەیمانییە لژێر ناڤێ (هەڤپەیمانا زینبەقی یا تێکهەل ل گـەل هـیلالی) چـوو دنـاڤ مێـژوویێ دا وەکـی هەڤرکێن سیاسیێن فرانسویێ ئێکێ بناڤ دکەت، و ڤێ چەندێ باهوزەکا توند ژ کەریێ ل ئەورۆپا ئازراند، لەورا لژێر ڤێ فشارا هێرش و تومەتان، فرانسوێ ئێکێ بریاردا خۆ ل بەرامبەر جیهانا ئیـسلامی پـاك بکـەت و رۆلێ بەرگریکەرێ ژ مەسیحیان وەرگریت[10]. هوسا فریکەرێ فەرمیێ شاهێ فرەنسی ل سـالا (١٥٣٥) شـیا ئێکـەم بەلگەناما نڤیسی بدەست خۆڤە بینیت و ئەڤە ب دەسپێکا ئیمتیـازان (captulation) دهاتـە هـژمارتن، مـەزنی و دفـن بلنـدی یـا سـولتانی ئوسمـانی ئـەوێن هینگـێ د گوپیتکـا هێـزا خـۆدا لـدویڤ دەربرینـا ئێـك ژ مێژوونڤیسێن ئەورۆپی نەدهێلا ئەو خـۆ ب پێگیریـێن دوولایـەنی لگـەل گـاوران گرێـدەن لـەورا ئـەڤ بەلگـەناما نـاڤبری نـەوەکی پەیمانـەکێ بـوو، بـەلکی وەکـو مەرسـومەکێ سـولتانی بـوو هنـدەك مـاف و باشـیێن دەستنیشانکری د ئیمپراتوریا ئوسمانی دا ب فرەنسا بەخشین و ژ وان مافان:

١- دانانا دادگەهێن نەتەوەیی.

٢- ئازادیا بازرگانی.

٣- ئازادیا ئایینی و پێرابوونا ب رێ و رەسمێن ئایینی و دڤێت ئەڤ مافە هەمی زەلامێن ئایینی ئەوێن باوەری ب مەزهەبێ (فرەنسی) هەی بخۆڤە بگریت ئەو نەتەوا ئەو ژێ بیت هەر چ بیت.

٤- ئازادیا بازرگانی بۆ نەتەوێن دی یێن ئەورۆپی لێ لژێر ئالایێ فرەنسی بتنێ[11].

و ئەگەر فرەنسا ل دەسپێکا وان دەولەتان بیت یێن ئەڤ ئیمتیازە پـێ هاتیـە بەخـشین، ئـەو دەولـەتێن مـای ژی نەخاسمە یێن مەزن و د ماوێن جودا جودا ئیمتیازێن وەك ئێك بدەست خـۆ ڤـە ئینـان و ئـەڤ ئیمتیـازە ل ماوێ داکەفتنا دەولەتا ئوسمانی جهێ لاوازیا ئوسمانیان بوون و بوونـە ژێـدەرێ دەسـتهەلاتێ بـۆ دەولـەتێن رۆژئاڤا یێن تەماعی بۆ دەولـەتا ئوسمـانی هـەی، و ئەگـەرێ دژواربوونـا کـەتنا دەولـەتا ئوسمـانی، و هوسـا فرەنسا ما پارێزەرێ ئێکێ بۆ ژێردەستێن کاسولیکی یێن ئوسمـانی تـا کـونگرێ پـاریس (١٨٥٦) ئـەوێ بـۆ ئێکـەم جـار کێـشەك پێشکێـشکری ئـەوژی مایتێکرنـا دەولـەتان بـوو ب شـێوەکێ گـشتی بـۆ بەرژەوەنـدیا ژێردەسـتێن مەسـیحی ل دەولـەتا ئوسمـانی، و پاشـی ل دومـاهیێ ئـەڤ پرەنـسیپە کەتـە د پێرابـوونێن نیڤدەولەتی دا ئەوژی ب رێکـا کـونگرێ بـەرلین (١٨٧٨) ئـەوێ دەولـەتێن کاسـولیك و پروتـستانت د مـافێن پاراستنا ئایینی دا وەکی ئێك لێکرین[12].

گەهشتنا شاندێن کاسولیکی بۆ کوردستانێ:

بریارێن کۆری تریدانیستی (١٥٤٥– ١٥٦٣) و هێزا کەسایەتی یا هندەك پاپایان، وەکی پاپا کریکوریێ هەشتێ ١٥٧٢– ١٥٨٥) و دامەزراندنا رەهبانیا یەسوعی ل سالا (١٥٤٠ ز) و دامەزراندنا پاپا کریکوری بۆ کۆمەلگەها تەبشیرا ب باوەریێ (The collge for the propggation of he faith) ئەوێ ل سالا (١٦٢٢) ژلایێ کەنیسێ ڤە هاتیە دامەزراندن و د مێژوویا کەنیسێ دا بناڤێ (Propaganda) یێ ناڤدار بووی، زێدەباری ئیمتیازێن دەولەتا ئوسمانی داینە فرەنسا، و دامەزراندنا قوتابخانێن تایبەتمەند ل رۆما بۆ قوتابیێن رۆژهەلاتی، و نڤیسینا پەرتووکێن ئایینێن کاسولیکی و وەرگێرانا وان بۆ زمانێن ملەتێن مەسیحی ل دەڤەرێن جودا جودا وەکی (یونانی و عەرەبی و قوبتی و سریانی و ئەرمەنی و کوردی بۆ فێرکرن و تەبشیر و تەنصیرێ)، زێدەباری شێوازێن جۆراوجۆر وەکی پیلان گێران و فەسادی، مایتێکرنا دکاروبارێن کەنیسێ یێن ناڤخۆی دا و بکارئینانا دەستهەلاتا بیانی یان ئوسمانی، ئەڤ رویدانە هەمی بوونە ئەگەرێ وەرگەریانا کاودانان نە دبەرژەوەندا مەزنە حبرێن خراب دا لدویڤ دەربرینا ڤەکولەرێ کەنیسێ یێ فرەنسی (استیرویوس لرجیریو). لێ ژلایەکێ دیڤە ئەڤ کارە (فرێکرنا فرێکریان بۆ رۆژهەلاتی) یێ ب مفا بوو بۆ تائیفێن مەسیحی یێن ژێردەستێ ئوسمانیان و ئەوێن هەزار ژ رێکێن پێدڤی بۆ دابینکرنا رەوشەنبیری و ئایینی و گیانی، دەستویردانا فرێکەران ب رێکا خۆ پشکداریێ د باوەریا مەسیحی ل دەڤ مەسیحیان و بلندکرنا ئایینێ گیانی ل دەڤ وان کر و پێشکەفتنا رەوشەنبیری ژی بخۆ ڤە دیتبوو و بەرامبەری ڤی کارێ وان سوپاسداری و منەتداری هەبوو هەردەمێ ب نەرمی و چاڤ ڤەکری بهێتەکرن و ب گەلەك ژ دوژمنکاری و کاردانەڤەیێن توند و هەلویستێن هشیارکەر و تومەتبارێن ژێکڤەکرنا ئێکەتیا کەنیسێ و مایتێکرنا دکاروبارێن وێ دا ئەگەر لڤینا وان فرێکەران یا سەرکەفتی بیت لسەر تەعەسوب و ڤیانا تەبشیرا کورە ژلایەکێ دیڤە [13].

لەورا شاندێن کاسولیکی هاتنە دەڤەرا رۆژهەلاتا ناڤین و ژ وان ژی کوردستانێ، یەسوعی و فرنسیکان و ئوغسگینیون و کەپوشی و لوعازری و دومینیکی گەهشتن و دەربارەی کوردستانێ ئێك ژ ڤەکولەرێن دومینیکان دیار دکەت و دبێژیت: ل سالا (١٥٥١ ز) کاردانەڤەیەك رابوو لسەر عەدەتەکێ کرێت و ل سالا (١٤٨٠) ل دەڤ نەستوری یا رێکا خۆ ڤەکر ئەوژی دانە دەستا بەتریرکیا میراتگری ژ مامی بۆ پسمامی بوو، سێ ئوسقوفا و هندەك خودان باوەران بەتریارکێ میراتگرێ دەستنیشانکری رەدکر، و ل مویسل کۆمبوون و ل جهێ وی سەروکێ دێرێ رۆبان هرمز (سولاقا) هەلبژارت، ئەوێ بەرەڤ ئێکەتیا لگەل رۆما دچوو. و بەتریارکێ نوی و لگەل شاندەکێ لایەنگیر چوونە قودسێ و پاشی چوونە رۆما ل ١٥ تشرینا دووێ سالا (١٥٥٢) [14] بدویماهی هاتن. و ل ٢٠ شواتێ ژ سالا پشتی وێ (سولاقا)ی باوەریا خۆ یا کاسولیکی راگەهاند و

پاپا (جولیانێ سییێ) بەتریارکی دا دەستێ وی ل ٢٨ نیسانا (١٥٥٣)، و ئێکەم بەتریارکێ کلدان ڤەگەریا رۆژهەلاتی لگەل دوو روهبانێن دومینیکی یێن مالتایی (امبروسیوس بودجاج)، (انگو نیوس زهرە) ئەوێ پشتی هینگی بوویە مەتران. و بەتریارکی ناڤێ (شمعون) وەرگرت و ئامەد (دیاربەکر) کرە بنگەهێ خۆ و ل ١٢ تشرینا دووێ (١٥٥٣) گەهشتە وێرێ. نێزکبوو بەتریارکێ نوی پێنج مەترانان دانیت[١٥].

دنخا (١٥٥١– ١٥٥٨ ز) بەتریارکێ ئەلقوش یێ نەستوری، و پاشی پاشایێ ئامێدی ماوەکی ئەو کرە دزیندانێ دا، و پاشی ل کانوینا دووێ سالا (١٥٥٥) ل ئێك ژ دەریاچێن دکەڤنە باشووریێ رۆژهەلاتا ئامێدیێ نێزیك دێرمارساوە (ل گوندێ دێرشك) کوشت. لێ ڤەکولەرەکێ دی ب دیتنەکا دی دهێت و تێدا کەنیسا کاسولیکی ب سەرکێشیا رۆما تومەتبار دکەت کو یا هەولدای کەنیسا رۆژهەلاتی ل ناڤەراستا چەرخێ شازدێ لگەل دەسپێکا پەیدابوونا هەوێن ئیستعماری یێن کەڤن ژێکڤەکەت، ب دەربرینەکا دی ئانکو تەبشیرا مەسیحی ب ئیستعمارێ ڤە گرێدەت کو پشتبەستنێ لسەر ئاخفتنا کاردینیا (کاسولیکی) اوجین تیسران دکەت ئەوێ دبێژیت (دەسپێکێن شاندێن تەبشیری لگەل ئیستعمارا پورتگالی و ئەسپانی بوون) و دەربارەی رویدانا مەتران سولاقای ئەو ئێکسەر رۆما تومەتبار دکەت کو یا بڤی کاری رابووی، داکو پرۆژێ دابەشکرنا کەنیسا رۆژهەلاتی تمام بکەت و دەسپێکێن وێ ژ موبەشرێ فرەنیسکانن و رۆما شیا راهبێ ناڤبری (سولاقا) دسەردا ببەت سەرەرای زانینا وان کو بەتریارکێ کەنیسا رۆژهەلاتی یێ ساخە و کەنیسا رۆژهەلاتی یا تووشی لاوازیەکا مەزن بووی پشتی وان کوشتارێن لسەر دەستێ مەغولی (تیمورلنك) تووشی وان بووین، لەورا موبەشرێن کاسولیك بخۆ هەست ب لاوازیا وێ کر دەمێ نەشیا یێن مەترانێن ناڤخۆی ببینن بۆ پلەدارکرنا سولاقا بەتریارکی ژێردەستێ وان و ئەو ڤەگوهاستە رۆما، سەرەرای دامەزراندنا وی ژلایێ پاپای ڤە لێ رۆما هەول دا وی لاواز و بێچارە بکەت و وەکی چریسکەکێ بدویماهی هات. و جهێ ئاماژە پێدانێ یە کو شاندێن لاتینی شیان پشکەکا سریانیێن رۆژهەلاتی نەستوریێن کوچبەری گزیرتا قوبرس بووین ب ئێکەتیا لگەل کەنیسا کاسولیکی قایل بکەت، ئەسقوفێ وان (گیمپاوس) بریارا باوەریا خۆ یا کاسولیکی دا دناڤ دەستێن (اندراوس)ێ سەروکێ ئەسقوفێن رودسێ دومینیکی، و لژێر کاریگەریا ڤێ چەندێ پاپا (ئوجینێ چوارێ (١٤٣٩– ١٤٤٧) دان ب تیما نوی دا، و ئەو ب کلدان بناڤکرن وەك بیرهاتن ب کلدوێ کەڤن ئەوی کورسیا (مارماری) دانای لدویڤ دەربرینەکێ[١٦].

شاندێن کەبوشی:

ئێك:– ل سالا (١٦٣٦ز) ناما کەبوش ل موصل هاتە دامەزراندن، ژبۆ کێشانا نەستوریا بۆ کەنیسا رۆما، و ئەڤ نامە شیا کاکلکا کوسولیکی ل موصل دروست بکەت کو وێنێ باوەریا خۆ بۆ پاپا (ئەنوجینوسێ دەهێ (١٦٤٤– ١٦٦٠) ل سالا ١٦٥٧ فرێکەت و داخوازا ئێکگرتنێ ژ قەداسەتا وی بکەت لگەل مانا لسەر تقوس و نڤێژێن کەنیسێ، و داخوازا تائیفا وی بکەت کەنیسەکێ ل رۆما دانن[١٧].

و ژلایەكێ دیڤە كۆیێ پروبگندا (كۆرێ تەبشیرا باوەریێ) ل سالا (١٦٦٣) فرێكەر ژلایێ خۆڤە بۆ رەهبانییێن جودا ل وەلاتێن رۆژهەلاتی فرێكرن، و ژ وان ژی ناما كەبوش بۆ ئامد (دیاربەكر) و ماردین. و (الاباتی شموئیل جمیل التلكیفی) سەروكێ رەهبانیا هورمزدی دپەرتووكا خۆ لـژێر ناڤێ (العلاقات بین الكرسی الرسولی والسریان المشارقە ای الكنیسە الكلدانیە) دا پشكەك ژ وان نامێن دناڤبەرا رۆما و فرێكەر و جەسالیقێن كەنیسا رۆژئاڤای دا دهاتن و دچوون بەلاڤكرن و تشتەكێ سەرنج راكێش یێ هەی ئەوژی كو (الاباتی شموئیل جمیل التلكیفی) دئێك ژ نامێن بەلاڤكرین دا ئەوا ژ بارەكێ كولیژا (پروبگندا) هاتیە ڤەگوهاستن هندەك پێزانینێن گرنگ لسەر (بگرس جیس) یێ ب فارسی دهێتە بناڤكرن یێن دیاركرین كو ئەو كوردە و ژلایێ ئایینی ڤە موسلمان بوو و خەلكێ ئامێدیێ بوو و چوو بو دناڤ مەسیحیێ دا، و د تومارا كولیژا برویاگندا د بەرگێ ئێكێ یێ كۆما دكیومنتێن سالا (١٩٢٣- ١٧٥٣) د بەرپەرێ (٥١) دا هاتیە دیاركرن كو (بگرس جیسێ) فارس ژ باژێرێ ئامێدیێ یە ل كولیژا (بروبگندا) ل ١٧ ئابا (١٦٤٧) هاتیە وەرگرتن و هینگێ ژیێ وی نێزیكی ٢٤ سالان بوو و ب بریارا كۆمەلگەهێ ل ٣ حزیرانا ژ هەمان سال، ژلایێ كردنیال بریرینو هاتبوو بەریژێركرن و ئەو ژلایێ ئایینی ڤە موسلمان بوو و دهاتە گۆتن كو ژلایێ خودێ ڤە یێ هاتیە داخوازكرن بۆ رۆما داكو ببیتە مەسیحی ل سالا (١٦٤١) و ل ٧ ئەیلولێ (١٦٤٢) تافیل كر و برازاڤاییێ وی چاڤ ب كونت جیسییێ فرەنسی كورێ شاهێ (فرەنسی) ل قەستەنتینیە (ئەستەنبول) كەت(١٨).

پشتی (الاب بطرس جیسی) كەهنوتی نەخشەكری ڤەگەریا وەلاتێ خۆ كوردستانێ و گەلەك دنامە و شیرەتان دا كاركر و ب تایبەت ل باژێرێ ئامەد (دیاربەكر)، دیارە هاتنا وی بۆ جهێ ژ دایكبوونا وی ل ئامێدیێ رەنگە ئامازێ ب هندەك گرفتاریان ددەت، هەر چەوا بیت ئەو یێ ب خیرەت بوو بۆ بەلاڤكرنا باوەریا كاسولیكی و بەرگریا ژی بدژی (نەستوریا) ئەوێن وی دەمی هێشتا ژمارا پتر بوون دناڤ دیڤچوویێن كەنیسا رۆژهەلاتی دا(١٩).

(الاب بطرس جیسی) هندەك سالان ل ئامەدێ ما و پاشی چوو گوندێ ئەلقوش دا چاڤ ب بەتریارك (مار ئیلیایێ هەشتێ ١٦١٧- ١٦٦٠). بكەڤیت ئەوێ كەیف ب هاتنا وی هاتی و دیتی كو یێ ب خیرەتە بۆ باوەریێ و ڤیانەكا كویر یا بۆ كەنیسێ و ئێككرتنا وێ لگەل هەمی كەنیسان ب تایبەت كەنیسا رۆما هەی، ئەوا كو ماوەكی لێ ژیای و فێری زمانێ ئیتالی بوو و بەرپرسێن ل دام و دەزگایێن رۆمانی نیاسین، لەورا ئەو هەلبژارت كو لگەل دوو زەلامێن ئایینی (مرقس و الشماس طیمثاوس) بچیتە رۆما داكو بەرپرسێن رۆما لسەر بارێ مەسیحیان ل وەلاتێ رۆژهەلاتی ئاگەهدار بكەن و دەربارەی ڤێ چەندێ بتریركی نامەك بۆ كۆرێ تەبشیرا ب باوەریێ فرێكر و تێدا هاتبوو (ئەز ڤوتابیێ هەوە (الاب بطرس جیسی) فرێدكەمە دەڤ هەوە ل رۆما، مەیێ

حەز ژێ کری چونکی قوتابیێ هەوەیە ئەم هیڤی دکەین دناڤبەرا مە و هەودا ناڤبژیڤان بیت و ئەو ل سەر پەرتووکێن مە بێ ئاگەهدارە و تقوسێن ئەم رۆژانە پێ رادبین دزانیت، هیڤی ژ هەوە دکەین مێن بشتبەستنێ ل سەر هەر کەسێ بێژیت ئەزێ ژ دەڤ وان هاتیم نەکەن چونکی دراستی دا نەوەسایە) و (الاب بگا لکبوش بەرپرسێ پەیاما کەبوشیان ل کوردستانێ دناما خۆیا بۆ کۆمەلگەها پرۆبگندا دا دبێژیت بەتریارك (الاب بطرس جیسی) لگەل دوو کەسێن دی یێن فرێکرین و ئەو زمانی دزانیت داکو ببینن چ دشیاندایە هەیە بۆ پیرۆزیا خودێ و قورتالبوونا گەلەك دەروونان بهێتەکرن[٢٠].

دەربارەی ژیانا (بطرس جیسی الفارسی)یێ ئامێدی تومارێن پرۆپاگندا تەنها ئاماژێ ب هندێ دکەت کو ژ پێخەمەت باوەریا کاسولیکی ل سالا (١٦٨٠) ل حەبەشە یێ هاتیە شەهیدکرن، و وەسا دیارە (بطرس جیسی) یێ ئامێدی بوو قوربانێ بەلاڤکرنا کاسولیکیێ ل وەلاتێ حەبەشە ئەوێن لدویڤ تەقسێ سریانی یێ ئەرسوزکی د چوون. ل سالا (١٦٢٢) رەهبانێ یەسوعیان د هەلگرتنا بارێ مەسیحیرکرنا ئیمبراتورێ حەبەشێ (سوسانیوس)ی بسەر کەفت و بریارا دامەزراندنا بەتریارکەکێ لاتینی بۆ حەبەشێ بدەستڤەئینا، لێ ئەو رەنجێن زێدەیێن ژبۆ لاتینیکرنا حەبەشێ هاتینە کرن پشتی دەه سالان بوونە ئەگەرێ کاردانەڤەیێن توند و (سوسیانوس)ی جهێ وی گرت[٢١].

(فاسیلادوس)ی (١٦٣٢ – ١٦٦٧) بریارا کوشتن و دەرئێخستنا هەمی فرێکریان و برینا پەیوەندیێن لگەل رۆما دا، و هوسا (الاب البطرس)ێ کورد یێ ئامێدیێ ئەوێ ل دەسپێکێ موسلمان بوو قوربانێ کاسولیکیێ ل حەبەشا گەلەك ژ وەلاتێ وێ کوردستانێ دویر[٢٢].

دوو: ناما دومینیکی

دەمێ مەسیحیێن موسل ژ کاسولیکان بۆ دووبارە ڤەکرنا شاندخانا کەبووشی ئەوا ل سالا (١٧٢٤) بجە هێلای بسەرنەکەتین، قەس (خچر)ێ کلدانیێ موسلی ئەوێ وی دەمی ژبەر بەتریکی نەستوریا پاپا (بندکتسێ چواردێ) رەڤی مالەك بۆ کلدانان لڤی بازێری ڤەکر، و پشتی دوو دلیا پاپای بۆ داخوازا نویکرنا بزاڤا وان ل وەلاتێ دناڤبەرا هەردوو رووباران دا و کوردستانێ ، ل سالا (١٧٤٨) شاندخانەك هاتە ڤەکرن و ل (١٧) کانوینا دووێ سالا (١٧٥٠) هەردوو فرێکریێن ئیتالی (فرنسیس گوریانی (Tarri ani) و عبدالاحد کودیلجینی) و بۆ ماوەکی بەرەوەخت (الکرملی لیانورو) بۆ قەدیسی یا سیسلیا زێدەکر ژبەرکو ناڤبری زمانێ عەرەبی دزانی و ل جهێن وەلاتێ دناڤبەرا دوو رووباران دا یێ شارەزا بوو، و ئەڤێ نامێ دکاودانێن ژێکجوودا دا هەتا سالا (١٨١٥) کارکر، و بۆ ماوەکی هاتە هێلان و پاشی ل سالا (١٨٤٠) ز هاتە ڤەگەراندن، و ل سالا (١٨٥٩) فرێکری ژ ئیتالیان بۆ فرەنسیان هاتنە گوهورین.

ـحەـ هەربوو فرێکریان بشبەستن لسەر ئەرکێ خۆییێ نوژداری کر و سەرکەفتن د ئەرکێ خۆ یێ ئاینی ژی دا ـیـ. ئەخاسمە وان لایەنگیریا کاسولیکێ مویسل بدەستخوڤە ئینا، و دەمێ دەنگ و باس گەهشتینە گوهێن میرێ بادینان (بهرام پاشایێ ئێکێ کورێ سعید خان بەگ دووی (١٧١٤ – ١٧٦٨) و وی دەمی یێ نەساخ بوو، ـمیـ هندەك فرێکرن داکو داخوازێ ژ (الاب فرنسیس گوریانی) یێ نوژدار بکەن بهێت چارەسەریا میری بکەت، ـچـنی نوژدار د ئەرکێ خۆدا بسەرکەتی (میر بهرام)ی دەرفەت دای لقەکا شاندخانا دومینکی ل ئامیدیێ ڤەکەت و ئەوا کو (الاب دونیك کلودیلیو) بوویە ئێکەم سەروکێ وێ[٢٣] و پشتی مرنا (الاب عبدالاحد کونیلیو)، کارکەتنە ددەستێ (الاب ایبولدو صولدینی) ئەوێ شەهرەزا د کارێن ئەندازیاری دا زێدەباری ـوژدلریی و میر بهرام پاشای رێز لێ دگرت، و دومینیکان دێرا (کنیسە عبد یشوع)ی ل گوندێ دێری ئەوێ ـکەڤیتە دویراتیا چەند کیلومەتران ژ باکورێ رۆژهەلاتا ئامێدیێ پێ بەخشی، هەر وەسا باوەریا میری ـنەستوری) ئاکنجیێن رەسەنێن دەڤەرێ هان ددان باوەرییێ ب مەزهەبێ کاسولیکی بینن، و (الاب ایبولدو) ل سالا (١٧٧٥) ل زاخۆ مر و ل وێرێ هاتە ڤەشارتن، و ئەو فرێکەرێ ئێکێ بوو بۆ ئامێدیێ هاتیە فرێکرن، و ل سالا (١٨٤٠)ز پشتی زڤرینا شاندخانا دومینکی بۆ کوردستانێ، (الاب اسکا فهوسر) و هەڤالێ وی (اوغسطین) رابوون ب ڤەکرنا لقەکا شاندخانێ ل دێرماریاقو ئەوا دکەڤیتە رۆژئاڤاییێ دهۆکێ، ل سالا (١٨٤١) و کەنیسەك تێدا ئاڤاکر[٢٤]، و ل سالا (١٩٤٢) قوتابخانەك تێدا ئاڤاکر و ئەوا بوویە مەلبەندێ تیرۆژکا هزری ل هەمی دەڤەرێ و قوتابی ژ گوندێن مەسیحی وەکی ئەرەدنا و مانگێشك و بێرسڤێ و ئاشیتا و فیشخابور و بێدارێ دهاتنێ، و هەر وەسا بەشەکێ ناڤخۆی تێدا هاتە ئاڤاکرن ژ بۆ ڤەحەواندنا قوتابیێن ژ گوندێن دویر دهاتن، و دێرێ کتێبخانەکا مەزن هەبوو و ب هزارەها پەرتووك لێ هەبوون. و زێدەباری ڤێ چەندێ دێرێ پێشوازیا نەساخێن کورێن دەڤەرێ ژ هەمی ئایینان دکر ب هەروەچارەساریا وان دکر و ئەڤ شاندخانە سالا (١٩٦١) پشتی بەرپابوونا شورەشا کوردی ب سەرکێشیا پێشەوا مەلا مصگفی بارزانی هاتە دائێخستن[٢٥].

**کاریگەریا (ئاما) دومینکی لسەر ژێرخانا جڤاکی و هزری یا جڤاکێ کوردستانێ:**

ڤێ نامێ گەلەك پشکداری د پێدانەنیاسینا کوردستانێ و خەلکێ وێ دا کر، ژبەرکو فرێکریێن ل وێرێ کاردکر پەرتووکێن مفایەکێ مەزن تێدا دانان.

و ژوان فرێکریێن دیار (الاباء لانزا، کارتزوزتی، و کمبانیلی) ئەوێ ئێکەم دەستوور و نەخشە ب زمانێ کوردی ل سالا (١٧٨٧)ز ل رۆما دانای و بۆ ئێکەم جار لسەر بنەمایەکی زانستی دانپێدان ب زمانەوانیا زمانێ کوردی هاتە دان، و هەژی یە بێژین کو دانەرێ وێ هەژی ناسناڤێ (بابێ کوردیێ) بوو The pipher Kurdish

ڤەکۆلەرێ ئیتالی (بریداری Predari) دبینیت کو garm moran padredella courd ologia دناڤبەرا زانایێن ئەوروپییێن رۆژهەلاتناس بەری وی کەسێ هزر د زمانێ کوردی دا نەکریە. ئەو فەرهەنگا وی ل سالا (١٧٦٤ – ١٧٧٥) نڤیسی ٤٦٠٠ بێژەیان بخوڤە دگریت و تا رادەکی رەگەزێن ریزمانا زمانێ کوردی تێدا هەبوون[٢٦].

و دانەر دزمانێ کوردی دا پێنج دیالێکتان بگورەی میرگەهێن کوردی دیاردکەت: کاراجولان (قەلاجولان – ئامێدی، جولەمێرگ – جزیرێ (جزیرا بۆتان)، تبلیس، و ئەو د فەرهەنگا خۆدا دیالێکتا ئامێدێی بکاردئینیت چونکی ماوەکێ درێژ لێ ژیابوو و ئەو پشتی (صولدینی) فرێکرییێ دووێ بوو، زێدەباری ڤێ چەندێ ئەو دیالێکتا ئامێدیێ ژ هەمیان پاقژتر د هەژمێریت[٢٧].

هەر وەسا دشیاندا نینە پەرتووکێن (کمبانیل companil) و بێن دی بهێنە ژبیرکرن ئەوێن د پەرتووکێن خۆدا ب شێوەکێ دیار زمانێ جڤاکێ کوردی و ژێرخانا جڤاکی و سیاسی یا وی وەسفکرین، و وان دکیومێنتێن پر بها بۆ تێگەهشتنا جڤاکێ کوردی بێن هێلاین، زێدەباری تیبینی و دیتنێن لدور داب و نەریتێن ئاینیێن بەربەلاڤ ل کوردستانێ وەکی ئیسلامی و مەسیحی و یەهودی و ئیزدی و هتد.

و ڤەکولەرێ کەنیسێ یێ ئیراقی یوسف حبی بۆچوونا خۆ لدۆر دیتنێن وان گەرۆکێن ئیتالی دیاردکەت و دبێژیت (ئەوان رەهبانان پرانیا جاران لایەنێن نێگەتیف و نامۆ ژ جڤاکێ کوردی نەخشەدکرن، وەکی د چاڤێن وان دا دیار، لێ گەرۆکێن عەلمانی و خودانێن هزرێن ئازادی خوازێن وەکی فالی و دی بیانکی Dellavall De Biachi لایەنێن پۆزەتیف و تایبەتیێن گرنگ هەلدسەنگاندن ئەوژی ب هەمی گرنگی ڤە و لگەل پەسندکرنا ئەو تشتێن ل دەڤ کوردان بێی هەولدان گوهورینێ یان لەکەدارکرنا پێڤاژویا ژیانا وان یان دەستێوەردانا بنەمایێن بەگراوەندی و رەوشەنبیری بێن وێ دەستەکا ئەو حەز ژێ دکەن[٢٨].

و لسەر مە پێدڤی یە ئەم دناڤ فرێکریان دا و دناما دومینکی دا ل شێخ منصوری بگەرین، هەژی یە بێژین کو ئەو کەسەکێ ئیتالی بوو و کاریگەریەکا مەزن ل دویماهیکێن چەرخێ هەشتێ هەبوو. و ب ناڤێ (شێخ) هاتیە نیاسین پشتی باوەری ب ئیسلامێ ئینای، و سەرکردایەتیا دەه هزار کوردان کر د ماوێ دناڤبەرا (١٧٨٥ و ١٧٩٠) دەستێ خۆ دانابوو سەر بدلیس و سعرد و ئەرزەرۆمێ، و چوو هەتا گەهشتی یە قەوقاز، و گەلەك نەتەوە ئێخستینە ژێر کونترۆلا خۆ، و روسی هێزێن مەزن بۆ شەرکرنا لگەل لەشکەری و نەهێلانا بزاڤا وی فرێکرن، سەرەرای ڤێ چەندێ ئەو شیا هندەك سەرکەفتنان ب هێزێن خۆ بێن کوردی لسەر لەشکەرێ روسی بجە بینیت لێ ل دویماهیێ روسی شیان وی بشکێنن و زێدەباری هندێ د دێرا (ارکانجیل) ڤە زیندان کر و هەتا کو پشتی بیست سالێن زیندانێ چوو بەردلوڤانیا خودێ[٢٩].

لێ شاندێن ئیتالی ئەوێن ل باژێرێ دی بێن کوردستانێ وەکی دیاربەکر و وان کارکرین، چ پشکداریێن گرنگ لسەر ئاستێ ئەدەبی پێشکێش نەکرن[٣٠].

ژێدەر و پەراوێز

١-المجتمع الاسلامي و الغرب، ترجمة عبدالمجيد القيسى. دار المدى، دمشق، الطبعة الاولى ١٩٩٧، ج ص ٢٤٣ - ٢٤٤.

٢- الكسندر اداموف: ولاية البصرة في ماضيها و حاخرها. ترجمة الدكتور هاشم صالح التكريتى، منشورات مركز دراسات الخليج العربى بجامعة البصرة، الطبعة الاولى - ١٤٢٠ه، ١٩٨٢م ص ١٨٥ - ١٨٦.

٣- هاملتون جيب و هارولدبوين: المجتمع الاسلامي و الغرب ج ٢ص ٢٥١.

٤- نقولا زيادة: المسيحية و العرب، قدس للنشر و التوزيع دمشق، الطبعة الثانية ٢٠٠م - ص ٢١٠.

٥- الكسندر دامون: المرجع السابق ص ١٨٧.

٦- استيريوس ارجيريو: المسيحيون في العصر العثماني الاول (١٥١٧ - ١٦٥٠)، ضمن كتاب المسيحية عبر تاريخها في الشرق، مجلس كنائس الشرق الاوسط، بيروت الطبعة الثانية ٢٠٠٢، ص ٦١٨.

٧- برنار هيبر جيه: تطور الكثلكة في الشرق، ضمن كتاب المسيحية عبر تاريخها فى الشرق، مجلس كنائس الشرق الاوسط بيروت الطبعة الثانية ٢٠٠٢، ص ٦٤٩.

٨- هاملتون جب: المرجع السابق، ص ٢٦٣.

٩- عبدالعزيز نوار: تاريخ العراق الحديث/ ص ٢٨٣.

١٠- الكنسدراداموف: المرجع السابق ص ١٨٩ - ١٩٠.

١١- عبدالعزيز نوار: تاريخ العراق الحديث/ ص ٢٨٣.

١٢- استيريوس ارجيريو: المسيحيون في العصر العثماني الاول، ص ٦١٩ - ٦٢٠.

١٣- ژێدەریّ بەریّ، ل ٦٢٠.

١٤- جان موريس فييه: الكنيسة السريانية الشرقية، نقله الى العربية الاب كميل حشيمه اليسوعى، دار المشرق بيروت، ص ٣٠ - ٣١.

١٥- هرمز ابونا: الاشوريون بعد سقوط نينوى -- صفحات من تاريخ الكنيسة الكلدانية، كاليفورنيا، ص ٧٦ - ٧٨، و الغريب ان الكاردينال تيسران لم يشر الى الاستعمار فى الصفحة التي اشار اليها السيد ابونا.

١٦- الكنيسة السريانية الشرقية، ص ٣٠.

١٧- القس بطرس نصري الكلداني: كتاب ذخيرة الاذهان، الموصل دجير الاباء الدومنيكيين ١٩١٣، ج٢ ص ٣٤.

١٨- المطران عمانوئيل دلى: مبادرات الاتحاد بين بطاركة بابل ورد في القرن السابع عشر، مجلة نجم لمشرق العدد ٢٧، ٢٠٠١، ص ٣٤٩ نقلا عن وثائق مجمع البروبغندا لسنة ١٦٧٢.

١٩- ژێدەرێ بەرێ، ل ٣٤٩ - ٣٥٠.

٢٠- ژێدەرێ بەرێ، ل ٣٥٠.

٢١- استيريوس ارجيريو: المرجع السابق، ص ٦٢١ - ٦٢٢.

٢٢- تيسران: خلاصة تاريخية للكنسية الكلدانية نقلها الى العربية القس سليمان الضائغ، الموصل ١٩٣٩، ص ١٨٠ - ١٨٧.

٢٣- م. ابراهيم: الدومنيكون - نشأتهم - ارسالياتهم و دورهم الانساني و الثقافي و العلمي، البلاد، مجلة الصوت الكلداني العدد ٤ سنة ١٩٩٩، ص ٤٥ - ٤٦.

٢٤- ژێدەرێ بەرێ، ل ٤٦ - ٤٧.

٢٥- جميل برنادوس: دير قرية مارقو، مجلة الصوت الكلداني العدد ٢ سنة ١٩٩٨، ص ١٢ - ١٣.

٢٦- يوسف حبي: التراث الكردي في مؤلفات الايطاليين، مجلة المجمع العلمي العراقي الهيئة الكردية العدد الثامن سنة ١٩٨١، ص ٢٤٠، ٢٧٤.

٢٧- ژێدەرێ بەرێ، ل ٢٦٧ - ٢٧٧.

٢٨- ژێدەرێ بەرێ، ل ٢٤٠ - ٢٤١.

٢٩- ژێدەرێ بەرێ، ل ٢٤١.

٣٠- ژێدەرێ بەرێ، ل ٢٤١.

# راپەرینی ٦ ئەیلولی ١٩٣٠ بەردەرگی سەرای سلێمانی هۆکار و دەرئەنجامەکانی

اسماعیل عبدالله اسماعیل

تەوەرەی یەکەم:

بارودۆخی کوردستانی باشوور بەر لە راپەرین:

لەدوای شەڕی یەکەمی جیهانی و نەمانی دەسەڵاتی عوسمانی لەکوردستانی باشوورو داگیرکردنی لەلایەن بەریتانیاوە بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی لەو بەشەی کوردستان لەساڵانی (١٩١٨-١٩١٩) زۆر خێرا چووە پێشەوەو کوردەکانی ناوچەی سلێمانی بەسەرۆکایەتی (شێخ مەحمودی بەرزنجی) سەربەخۆیی خۆیان راگەیاند[١]. (شێخ مەحمود) پەیوەندی کرد بەئینگلیزەکان کەبەپێ ی چەند مەرجێك بێنە سلێمانی، ئەوەبوو ویلسونی حاکمی گشتی ئینگلیز لەبەغدا (مێجەر نوئیل)ی.[٢] وەك نوێنەری خۆی ناردە سلێمانی، ئەوەبوو لەتشرینی دووەمی ١٩١٨دا لەکۆبونەوەیەکی گشتی دا مێجەر نوئیل وتارێکی خوێندەوە لە وتارەکەیدا لەبەردەم جەماوەرێکی زۆری شاری سلێمانی حوکمداری (شێخ مەحمود)ی راگەیاند.[٣]

ئەم بارودۆخە بەم شێوەیە بەردەوام نەبوو لەبەرئەوەی بەریتانیا (شێخ مەحمود)ی بۆئەوە دەویست کەدژایەتی حکومەتی تورکیای پێ بکات، چونکە هێزەکانی لەمەڵبەندی موصل دامابوون، هەروەها دژایەتی کاربەدەستانی عەرەبی عێراقیشی پێ بکات بۆئەوەی لەقسەی بەریتانیا دەرنەچن، بەڵام ئەوەی بۆ (شێخ مەحمود) گرنگ بوو سەربەخۆیی گەلی کورد بوو.[٤] بۆیە زۆری پێ نەچوو کەنێوانی لەگەڵ ئینگلیزەکان تێکچوو ئەوەبوو شەڕێکی سەخت لەنێوان هەردوو لادا هەڵگیرسا لە(١٨)ی حوزەیرانی ساڵی ١٩١٩ لەدەربەندی بازیان کە (دەکەوێتە سەر رێگای نێوان سلێمانی وکەرکوك).[٥] لە ئاکامدا بووە هۆی بەدیل گرتنی (شێخ مەحمود) بەبرینداری و پاشان لەدادگای بەغداد بەمەرگ سزادرا، دوایی بۆیان هێنایە خوارەوەو کردیان بە (١٠)ساڵ زیندانی و بەگیراوی دوور خرایەوە بۆ هیندستان.[٦]

لەلایەکی تر کۆمەڵە سیاسیەکانی کورد[٧] کەوتنە کارو وەکالەت نامەیان نارد بۆ (شەریف پاشا)[٨] ئەو کاتە لەپاریس بوو، کردیانە نوێنەری خۆیان لەکۆنگرەی ئاشتی لەپاریس.[٩] ئینجا شەریف پاشا دەربارەی داواکانی گەلی کورد دوو یاداشت و نەخشەیەکی پێشکەش بەکۆنگرە کردو لەگەڵ نوێنەری ئەرمەنەکان رێکەوتننامەیەکی مۆرکرد بۆئەوەی یەك بگرن و بەیەکەوە قسە لەکاروباری کوردو ئەرمەن بکەن.[١٠]

لەکۆتایی لە ١٠ی ئابی ساڵی ١٩٢٠دا پەیماننامەی سیڤەر مۆرکراو بەهۆی هەوڵی شەریف پاشاوە باسی کورد کرا بەپێ ی برگەکانی (٦٢،٦٣،٦٤)، لەفەسڵی سێیەم کەفەسڵێکی تایبەتە بەناوی (کوردستان)ەوە تۆمارکراوە تیایدا بریاری ئۆتۆنۆمی بۆ کورد درابوو لە هەمان کاتدا ئەگەری وەرگرتنی سەربەخۆیی درا ئەگەر گەلی کورد بتوانێت خۆی بەرێوەببات.[١١] لەدوای بەجێ هێنانی پەیمانەکە داخوازی کوردەکان بگەرێتەوە (کۆمەڵەی گەلان) [١٢] هەروەها دیاربێت زۆربەی کوردەکان نیازی جیابوونەوەیان هەیە لەتورکیا بەمەرجێك کوردەکان توانای ئیدارەی خۆیان هەبێت سەربەخۆی خۆیان وەربگرن.[١٣] دەشێت بڵێین ئەم پەیمانە جێ بەجێ نەکراو ئەو بەڵێنانەی کەدایان لەبارەی مافی گەلی کورد تەنها بەشێوەیەکی تیۆری بوو، بەڵکو لەرووی پراکتیکەوە نەهاتە بواری جێبەجێ کردن.

بارودۆخی کوردستانی باشوور بەگشتی و سلێمانی بەتایبەتی تەواو تێکچوو بوو لەهەمان کاتدا رۆژ بەرۆژ دژایەتی ئینگلیز لەپەرەسەندن دا بوو.[١٤]

ئەمەش بووە هۆکارێك بۆ سەرهەلدانی چەندین راپەرین لەگرنگترین ئەو راپەرینانەش راپەرینی ئاکرێ بوو کە هەردوو هۆزی زێبار و بارزان پێ ی هەڵسان، بزوتنەوەی بارزان بەسەرۆکایەتی (شێخ ئەحمد بارزان)ی راپەرین، هەرچەندە شۆرشگێران سەرکەوتوو بوون لەدەست گرتن بەسەر ئاکرێ و کوشتنی ژمارەیەك لەئەفسەرانی ئینگلیز، بەڵام ئینگلیزەگان بەناردنی هێز بۆ ئاکرێ سنوورێکیان بۆ شۆرشەکە دانا.[١٥]

لەهەمان کاتدا راپەرین لەئامێدی و رەواندزو بادینان لەدژی ئینگلیز بەرپابوو.[١٦]

راپەرینانەکان زیاتر پەرەیان سەند بەتایبەتی کاتێك حکومەتی ئەنقەرە بەشێك لەسەربازەکانیان لەژێر فەرماندەی ئۆزدەمیر پاشادا(١٧) ناردە کوردستانی باشوور لەساڵی ١٩٢٢ بەیارمەتی هەندێك لەکوردەکانی سەر سنوور توانیان رەواندز بگرن و لەهەمان کاتدا ئۆزدەمیر رۆڵێکی کاریگەری گێرا لەبلاوکردنەوەی پروپاگەندە لەبەرژەوەندی تورکەکان لەناو هۆزە کوردیەکان.[١٨]

هەروەها هۆزەکانی زەنگەنەو هەمەوەندو گەورەکانی بنەماڵەی پشدەر و رانیە بەشداریان لەشۆرش کرد لەسەرووی هەمووشیانەوە یەکێك لەپیاوانی (شێخ مەحمود) بەرزنجی کە(کەریم بەگی فەتاح بەگ)ی سەرۆکی هەمەوەندەکان بوو، ئەوانە توانیان زیانێکی زۆر بەهێزەکانی بەریتانیا بگەێنن بەتایبەتی دوای کوشتنی (کاپتن بوند وکاپتن ماکانت) لەسەر دەستی کەریم بەگی فەتاح بەگ.[١٩]

هەر ئەو سەردەمە تادەهات نۆزدەمیر زیاتر لەنێو هۆزە کوردیەکان دەسەڵاتی پەیدا دەکردو کێشەی بۆ ئینگلیز دەنایەوە، ئەوەبوو شەڕو پێکدادان لەنێوانیان دەستی پێکرد، بەڵام هێزەکانی ئینگلیز نەیانتوانی بەر بەچەکداری عەشایری کورد بگرن و لەئاکامدا لە ٢٣ی ئابی ١٩٢٢دا هێزەکانی ئینگلیز خراپ شکان هەر ئەم شکستە وای لێکردن چاوێك بەبارودۆخی خۆیان بخشێننەوە.[٢٠]

بەم جۆرە ئینگلیزەکان بەنیازی بەرهەڵستی کردنی تورکەکان و لەناوبردنی ئەو بنکەیەی کە لەڕەواندز دلیان نابوو، بڕیاری گەڕانەوەی (شێخ مەحمود)یاندا(٢١)، و لەگەڵی ڕێکەوتن لەڕۆژی ١٢ی ئەیلولی ١٩٢٢ هێنایانەوە بەغدلو لەوێوە بەرێکەوت بۆ سلێمانی.[٢٢]

دوای ئەوەی (شێخ مەحمود) گەڕایەوە سلێمانی ئینگلیزەکان کۆنگرەیەکی کوردیان لە ١٤ی ئەیلولی ١٩٢٢ بەست. کەبەم پێ یە لەسلێمانی پایتەختی کوردستان ئەنجومەنێکی هەشت وەزیری پێك هێنرا بەسەرۆکایەتی شێخ قادری حەفید برای (شێخ مەحمود). لەتشرینی دووەمی هەمانساڵیشدا (شێخ مەحمود) خۆی بە پاشای کوردستان ڕاگەیاند وئاڵای کوردستان هەڵکرا بەم جۆرە حکومەتی کوردستان دامەزرا.[٢٣]

ئەم حکومەتە تەنها ناوچەی سلێمانی دەگرتەوە و (شێخ مەحمود) ئارەزووی سەربەخۆی هەموو کوردستانی دەکرد، بۆیە دەستی کرد بەداواکردنی هەموو شارەکانی تری عێراق.[٢٤] بۆ ئەم مەبەستە پەیوەندی لەگەڵ (نۆزدەمیر)دا بەست بۆئەوەی بەیارمەتی تورك دۆستەکان هەوڵ بدات هێرش بکاتە سەر ناوچەکانی تری کوردستان.[٢٥]

لەم کاتەدا (ئیسماعیل ئاغا)ی سمکۆ هات بۆ سلێمانی، ئینگلیزەکان هەوڵیاندا سوود لەو وەربگرن بۆ تێکدانی پەیوەندی نێوان (شێخ مەحمود) و تورکەکان، چونکە ئیسماعیل ئاغا دژایەتی لەگەڵ تورکەکان هەبوو، بەڵام ئیسماعیل ئاغا بەتوندی پشگیری لە(شێخ مەحمود) و بزوتنەوەکەی کرد، ئیتر ئینگلیزەکان بەتەواوی نائومێد بوون ناچار بوون هێرش بکەنە سەر سلێمانی.[٢٦]

ئینگلیزەکان دەستیان کرد بە بۆمبارانی شاری سلێمانی دوای ئەوەی کە (شێخ مەحمود) سلێمانی بەجێ هێشت وچووە جاسەنەو سلێمانی لەلایەن ئینگلیزەکان داگیرکرا.[٢٧] هەروەها هەر بەفرۆکەکانیشیان ڕوویان کردە ڕەواندز بۆ دەرکردنی تورکەکان ئەوەبوو توانیان لە ٢٣ی نیسانی ١٩٢٣ بەتەواوی کۆنترۆڵی ناوچەکە بکەن.[٢٨]

(شێخ مەحمود) دوای ئەوەی چووە جاسەنە بەرامبەر بەو کارەی ئینگلیزەکان دەستەوەستان نەوەستا بەڵکو بەیارمەتی هاوڕێکانی هێزێکی زۆری کۆکردەوە بەرەو سلێمانی ڕۆیشت و لە ١١ی تەموزی ١٩٢٣ سلێمانی ڕزگار کردەوە لەژێر دەستی داگیرکەرانی بەریتانیا.[٢٩]

لە ٢٤ی تەموزی ١٩٢٣ پەیمانی لۆزان بەسترا لەنێوان هاوپەیمانان و تورکیا کەلەم پەیمانە هیچ ئاماژەیەك بەناوی کورد نەکراو دان بەمافەکانی نەنرا.[٣٠]

مەسەلەی کورد تەنها هێنرایە سەر ویلایەتی موصل بەتایبەتی دوای دۆزینەوەی نەوتێکی زۆر لەم ناوچەیە کە کێشەیەکی سەرەکی بوو لەنێوان ئینگلیز و تورک.[٣١]

دواتر بەریتانیا و تورکیا بەپێ ی ئەوەی کە لەبڕگەی دووەمی ماددەی سێیەم لەپەیمانی لۆزان داهاتووە، نوێنەری بەریتانیا نەخشەیەکی دایە ئەنجومەن تاکو هێلی سنووری نێوان تورکیا و عێراق دیاری بکەن، ئەگەر نەشکرا کێشەکە بخەنە بەردەم ئەنجومەنی کۆمەڵەی گەلان، تا بڕیاری یەکجارەکیش دەدرێت هەردوو حکومەت بەڵێن بدەن هیچ جموجۆڵ و جولانەوەیەکی سەربازی یان سیاسی نەکەن کە بارودۆخی ئەو کاتەی هەرێمەکە (( ویلایەتی موصل)) بگۆڕن.[٣٢] واتا بارودۆخی کوردستانی باشوور هەروەکو خۆی هێڵرایەوە.

دوای ئەوەی (شێخ مەحمود) گەڕایەوە سلێمانی سەر لەنوێ حکومەتێکی تازەی دامەزراندەوەو ئاسایش بەرقەرار بوو، ئەوەبوو کوردەکانی هەموو لایەك و سەرۆك عەشیرەتەکان هاتوچۆی سلێمانیان دەکرد.[٣٣] ئینگلیزەکان دژ بەو کارەی (شێخ مەحمود) ڕاوەستان و لەگەڵ حکومەتی عێراق کەوەزارەتی (جعفر عسکری)[٣٤] بوو بڕیاریاندا پشگیری یەکتر بکەن بۆ لەناوبردنی (شێخ مەحمود).[٣٥]

چەندین شەڕو پێکدادان ڕوویدا کە لەهەردوو بەری چەمچەماڵ و دەربەندی بازیان دەستی پێکردو ئەم ناوچانەو سلێمانی چەندین جار بۆردمان کران لەلایەن هێزی ئینگلیزەکان، بەڵام سوپاکەی (شێخ مەحمود) هەر کۆڵیان نەداو بەردەوام بوون لە بەرگری کردن، تاوەکو دواجار نوێنەری باڵای بەریتانی بڕیاریدا بەهێزی پیادە سلێمانی داگیربکات.[٣٦]

ئەوەبوو ڕەتلێکی سوپای عێراق بەپشتیوانی هێزی پۆلیس و هێزی لێڤی[٣٧]ئاسوری و هێزی ئاسمانی بەریتانیا لە١٩ی تەموزی ١٩٢٤ توانیان سلێمانی بگرن و بەربڵاوەش بەهێزەکانی (شێخ مەحمود) بکەن بۆیە شێخ ناچار چووە سەر سنوری عێراق و ئێران.[٣٨]

دوای ئەوەی (شێخ مەحمود) لەتەموزی ١٩٢٤ سلێمانی بەجێ هێشت و چوو بۆ بەرزنجە و ئینجا بۆ پێنجوین و جاسەنە دەستی کردەوە بەچالاکیەکانی خۆی.[٣٩]

دوای ئەوەی پەیمانی لۆزان کێشەی موصل وسنووری نێوان تورکیا و عێراقی بەچارەسەر نەکراوی هێشتەوە، بۆیە لە٣٠ی ئەیلولی ١٩٢٤ کێشەکە خرایە بەردەم کۆمەڵەی گەلان بۆ لێکوڵینەوە لەکێشەکە کۆمەڵەی گەلان لێژنەیەکی پێك هێنا کەلە سێ ئەندام پێك هاتبوون.(٤٠) ئەم لێژنەیەش دوای ئەوەی کارەکەی خۆیان تەواو کرد لە١٦ی تەموزی ١٩٢٥دا ڕاپۆرتێکیاندا بە(کۆمەڵەی گەلان) لەڕاپۆرتەکەدا هاتبوو کەدەبێ بۆ ماوەی ٢٥ ساڵ بەریتانیا چاودێری بەسەر ئەو ناوچەیەدا بکات و کاروباری ئەو ناوچەیە بەکوردەکان بدرێت لەهەمان کاتدا زمانی کوردی بەزمانی ڕەسمی بزانرێت.[٤١]

کۆمەڵەی گەلانیش لە کانونی یەکەمی ١٩٢٥ بڕیاری لەسەر ئەوەدا کەخەتی بڕۆکسیل[٤٢] هێلی نێوان سنوری تورکیا و عێراق بێت و بەڕیوەبردنی عێراقیشی بۆ ماوەی ٢٥ ساڵ خستە ئەستۆی ئینگلیزەوە ئەوەی پەیوەندی بەکوردەوە هەیە کۆمەڵەی گەلان داوای لەبەریتانیا کرد کەیارمەتی کوردەکان بدات بۆ دامەزراندی

حکومـەتێکی ناوچـەیی کـوردی.[٤٣] بـەم جـۆرە کێـشەی موصـل بـەقازانجی ئینگلیزەکـان کۆتـایی هـاتوو، کوردستانی باشوور لەدەوڵەتی تورکیا جیاکرایەوەو بەدەوڵەتی عێراق لکێنرا.

حکومەتی بەغداش ڕێکەوتنی لەگەڵ ئێران بەست بۆئەوەی گەمارۆی هێزە کوردیەکان و(شێخ مـەحمود) بدات، بەڵام ئەم ڕێکەوتنە سەری نەگرت لەبەرئەوەی ئێران جـێ بـەجێی نـەکرد، ئـەوەبوو لـەمانگی تـەموزی ساڵی ١٩٢٦ شەڕ لەنێوان حکومەتی بەغدا بەیارمەتی ئینگلیزەکان لەگەڵ هێزە کوردیەکان سەری هەڵدا و لەم شەڕەدا هێزە کوردیەکان توانیان فڕۆکەوانێکی بەریتانی بگرن.[٤٤] شەڕ لەناوچەی پشدەر بەردەوام بـوو، لـەم ناوچەیە هێزەکانی ئێرانیش پاڵپشتی حکومەتی عێراقیان کرد، بەڵام هێزەکانی کوردی توانیان بەسەریاندا زاڵ بن و زەرەرێکی زۆریان پێبگەیەنن.[٤٥]

ئـەم بارودۆخـە بـەردەوام بـوو تـاوەکو لەتـشرینی یەکـەمی سـاڵی ١٩٢٦ گفتوگـۆ لـەنێوان (کینهـان کورنوالیس)[٤٦] نوێنەری مندوبی سامی بـەریتانیا لەگـەڵ (شـێخ مـەحمود) دەسـتی پێکـرد لـەنزیك سـلێمانی بۆئەوەی (شێخ مەحمود) خۆی بەدەستەوە بدات بەرامبەر بەمەش حکومەتی عێراقی هەندێك شـتی تایبـەتی بۆ بکات.[٤٧]

بەڵام (شێخ مەحمود) خۆبەدەستەوەدانی ڕەتکـردەوە ئەمـەش وای لەحکومـەتی عێراقـی کـرد کـەتیپێك سەرباز بنێرێتە پێنجوین ئەو گوندەی کە(شێخ مەحمود)ی لێبوو، لە٢٠ی نیسانی ١٩٢٧ داگیری بکات، لێرەدا (شێخ مەحمود) هیچ چارەیەکی نـەماو ناچاربوو لەناوەڕاسـتی حوزەیرانی هـەمان سـاڵدا ڕێککەوتننامەیـەك لەگـەڵ بەغـدا مۆربکـات.[٤٨] بـەپێ ی بەنـدەکانی پەیمانەکـە، پەیمانیـدا لەگونـدی پیرانـی کوردسـتانی ئێـران نیشتەجێ بێ، هەروەها داوایان لێکرد نەبـەخۆی و نەهەندێك لەخزمـەکانی بـەبێ ڕەزامەنـدی حکومـەت نـابێ بچنەوە خاکی عێراق. (شێخ مەحمود)یش بەڵێن بدات خۆی لەکاروباری حکومەت هەڵنەقورتێنێ لەم بارەیەوە چ لەسلێمانی یان لەهەر شوێنێکی تر هانی هیچ کەسێك نەدات، بابـە علـی کوڕیـشی بنێرێتـە بەغـدا بۆئـەوەی لەژێر چاودێری حکومەت بخوێنێ. مەبەستی کاربەدەسـتان لـەدانانی ئـەم مەرجانـە بنـەبڕکردنی بـزاڤی کـورد بوو.[٤٩]

بەم شێوەیە پاش دوورخرانەوی (شێخ مـەحمود) لـەپێنجوین بـاری بزوتنـەوەی ڕزگـاریخوازی کـورد لـەم ناوچەیە کپ بوو تا ساڵی ١٩٣٠.

تەوەرەی دووەم : ڕاپەڕینی بەردەرکی سەرا

أ ـ هۆکار و ئامانجی ڕاپەڕینەکە : ـ

بـەریتانیا لەسـاڵی ١٩٢٩ بڕیاریـدا ئینتـدابی خـۆی لـەعێراق کۆتـایی پـێ بهێنێـت، لەسـەر ئـەو بنەمایـەی کەعێراق گەیشتۆتە ئەو ئاستەی کەدەتوانێ خۆی بـەڕێوەببات و بـەرەو پـێش چـونێکیش ڕوویـداوە لـەبواری ڕامیاری وئابوری ومافەکانی مرۆڤ.[٥٠]

ئەمەش بووە هۆکارو بیانویەکی باش بۆ حکومەتی عێراق بۆئەوەی پشت لەبەڵێنەکانی خۆی بکات سەبارەت بەکورد کەدەبوایە بەپێ ی ڕاسپاردەکانی کۆمەڵەی گەلان مافەکانی بۆ دەستەبەر بکردایە [٥١].

لێرەدا جارێکی تر هەلومەرجێکی وا هاتە کایەوە کەگەلی کورد بەگشتی و خەڵکی سلێمانی بەتایبەتی بێ دەنگ نەبن لەئاستیداو بکەونە گەڕ، هەرچەندە لەئەنجامی ڕاوەدوونان و چاودێری بەردەوام، یەك لەدوای یەك کۆمەڵەو ڕێکخراوە کوردیەکانی سلێمانی ئاشکرا دەبوون و هەڵدەوەشێنرانەوە [٥٢].

سەبارەت بەبێ بەڵێنی حکومەتی عێراقیش، ئەوا لەکاتێکدا دەبوایە فەرمانبەران و موچەخۆرانی ناوچە کوردیەکان لەکوردەکانی ناوچەکە خۆیان بن، کەچی لەکۆی (٧٣١) فەرمانبەر تەنها (٣٢٤) یان کورد بوون، ئەوانی تر عەرەب و تورکمان و ئاسوری بوون [٥٣].

هەر ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کەنوێنەرە کوردەکان، چەند جارێك یاداشت پێشکەش بەسەرۆك وەزیرانی عێراق و نوێنەری باڵای بەریتانیا لەعێراق بکەن و تیایدا داوای جێ بەجێ کردنی ڕاسپاردەکانی (کۆمەڵەی گەلان) بکەن، بەڵام داواکەیان پشت گوێ دەخرا [٥٤].

لەشوباتی ساڵی ١٩٢٩ ( جمال بابان، حازم شمدین ئاغا، حمە بەگی جاف، ئیسماعیل ڕەواندزی، سیف الله خەندان، حمە ساڵح بەگی حمە علی بەگ ) شەش نوێنەری کورد بوون لەئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقدا هەڵسان بەپێشکەش کردنی نارەزایەك بۆ سەرۆك وەزیران کەتیاییدا سکاڵایان هەبوو دەربارەی نەڕۆیشتنی کاروبارەکانی نێوان ناوچە کوردیەکان و حکومەتی ناوەندی بەپێ ی ڕاسپاردەکانی (کۆمەڵەی گەلان)، کەداواکاریەکانیان بریتی بوو لە:

١- زیادکردنی داهاتەکان بۆ (ئیدارەی معارف) لەکوردستان.

٢- زیادکردنی داهات بۆ بەرژەوەندی گشتی لەناوچە کوردیەکان.

٣- دانانی یەکەیەکی ئیداری کوردی کەلیوایەکانی( سلێمانی - کەرکوك - هەولێر ) بگرێتەوە، هەروەها ویلایەتی چوارەم کەموصل دەگرێتەوە کوردێك سەرپەرشتی بکات و ببێتە ئەڵقەی بەیەك گەیاندن لەنێوان حکومەتی ناوەندی و کوردستان [٥٥].

داواکاریەکانی نوێنەرانی کورد بووە هۆی نارەزایی و گلەیی عەرەبە ناسیۆنالستەکان کە( یاسین الهاشمی)[٥٦] نوێنەرایەتی دەکردن [٥٧].

ئەم بارودۆخە وای کرد لەکۆتایی بیستەکان و سەرەتایی سیەکانەوە بزوتنەوەی کوردایەتی بەتەوژمێکی نوێ و گوڕوتینێکی زۆرەوە بێتە گۆرەپانەکە[٥٨].

کاتێك دەنگوباسی ئەوە بلاوبۆوە کەگفتوگۆ لەنێوان حکومەتی عێراق و بەریتانیا لەئارادایە بەمەبەستی مۆرکردنی پەیماننامەیەکی نوێ کەبەم پێ یە کۆتایی بەئینتداب بهێنرێ و عێراق بچێتە ناو (کۆمەڵەی گەلان) ئەوەبوو لە٣٠ی حوزەیرانی ١٩٣٠ پەیماننامەکە مۆرکرا(٥٩).

کاتێك ناوەرۆکی پەیماننامەکە بلاوبۆوە، دەرکەوت بەهیچ جۆرێك ناوی کوردو باسی مافی کورد نەخرابووە پێش چاو(٦٠).

ئەمەش بووە هۆی دڵەراوکێیەکی زۆر قووڵ لەنێو میدیاو ناوەندە کوردیەکان. کە بەهەزاران نامەی نارەزاییان رەوانە کرد بۆ رێکخراوی ( کۆمەڵەی گەلان ) دژی رێکەوتنەکە، کەهەموو نامەکان باسیان لەوە دەکرد کەهیچ مافێك بەکورد نەدراوە(٦١).

جگە لەمەش چەندین بروسکەو یاداشتی دیکە لەلایەن سەرۆك هۆزەکان و گەورە پیاوان و رووناکبیرانی کورد لەسلێمانی ئاراستەی کۆمەڵەی گەلان کردو داوای دەستەبەرکردنی مافەکانی گەلی کوردیان دەکرد، بەلام ناکرێت رۆڵی سەرۆك هۆزەکانی کوردستانی باشووریش لەیاد بکرێت، چونکە بەر لەو قۆناغە بەهیچ شێوەیەك نەگەیشتۆتە ئەو ئاستە بۆئەم مەبەستەش لەلاپەرە ١٧٢ فایلی(( کورد لەعێراق ، بەشی یەکەم )) وێنەی بروسکەیەك هەڵگیراوە کەلەلایەن ٢٤ سەرۆك هۆزی بەناوبانگ ناردراوە بۆ وەزیری موستەعمەرات لە لەندەن دژی ئەوەی ماف کورد لە پەیماننامەی نوێ ی نێوان حکومەتی عێراق و بەریتانیا خراوەتە پشتگوێ (٦٢).

کۆمەڵەی ئافرەتانی کورد لەم هەڵمەتەدا رۆڵێکی گرنگیان بینیوە بەسەرۆکایەتی (حەپسە خانی نەقیب) کە لە٢٨ ی حوزەیرانی ١٩٣٠دا پێك هات لەسلێمانیداو حەپسە خانی عیرفانە فەنی کەدەکاتە(خێزانی جمیل صائب)، سکرتێری بووەو بارەگاشیان هەبووە(٦٣).

چالاکیەکانی رووناکبیرانی سلێمانی لەو رۆژانەدا تەنها لەسلێمانیدا قەتیس نەبووە، بەڵکو لەشارەکانی دیکەش شوێن پەنجەیان دیاربوو، بۆنموونە لەساڵی١٩٢٠ لەموصل (ئیسماعیل حەقی شاوەیس، محمود جەودەت و فائق کاکە ئەمین...هتد) بەمەبەستی هاندانی کورد بۆ داواکردنی مافەکانیان کۆمەڵەیەکی نهێنیان پێك هێنا بەناوی (کۆمەڵەی پێشکەوتنی کوردان)ەوە پەیوەندیان بەرووناکبیرانی کورد لەشارەکانی تر کردوەو داوایان لێکردون لقی کۆمەڵەکە لەشارەکانی تر دابمەزرێنن(٦٤).

بەم جۆرە بارودۆخی سلێمانی زۆر نائارام بوو، لەم رۆژگارەدا حکومەتی عێراق لەرێکەوتی ١١ی مایسی ١٩٣٠دا (تۆفیق وەهبی)(٦٥) کرد بەموتەسەریفی سلێمانی لەشوێنی(ئەحمەد عوسمان هەولێری)، خەڵکی سلێمانی هاتنی( تۆفیق وەهبی )یان زۆر لاخۆش بوو، خەڵکانێکی زۆریش چون بۆ پێشوازی کردنی، ئەو ماوەیەی کەئەو موتەسەریف بوو جولانەوەی رۆشنبیری و سیاسی بۆ داواکردنی مافی نەتەوەیی کورد لەسلێمانی گەیشتە لوتکەو حکومەتی بەغداش ئەم چالاکیانەی بەهاندانی ئەوئەزانی (٦٦).

ئەوەبوو لە٢١ی ئابی١٩٣٠ واتا نۆزدە رۆژ بەر لەهەڵگیرسانی شەڕی بەردەرکی سەرا بەپێی بڕیاری ژمارە ( ٨٩ لە ٢٨ – ٨ – ١٩٣٠ ) لەسەر کار لایان بردوو بانگیان کرد بۆبەغدا، لەشوێنی ئەو (گاون)ی موفەتیشی ئینگلیز کرا بەوەکیلی موتەسەریف ئەم کارەش بووە جێی نارەزایی خەڵك و پیاوە ڕووناکبیرەکانی سلێمانی کەبارودۆخەکەی زیاتر گرژکردەوەو دلوای گەرانەوەی بۆ پۆستەکەی کراوە بەبێ دواخستن[٦٧].

پیاوە ناسراوەکان و ڕووناکبیرانی سلێمانی لەو کاتەدا بەمەبەستی خۆرێکخستن دەکەونە خۆیان و چەند جارێك لەماڵی عەزمی بەگی بابان دادەنیشتن و لەسەر دوارۆژی کورد دەدوێن بەتایبەتی دوای تەواو بوونی ئینتداب و سەربەخۆ بوونی عێراق. ئەوەبوو لەناو خۆیاندا دەستەیەك پێکدێنن بەناوی دەستەی نیشتمانی(هيئة الوطنية) و عەزمی بەگی بابان دەبێتە سەرۆکیان، ئەم هەیئەتە باوەری بە بەکارهێنانی توندو تیژی نەبووە و پەیوەندی فراوانیشی لەگەڵ سەرۆك هۆزەکان دروست کردووە[٦٨].

لەمانگی تەموزی ساڵی١٩٣٠ مەلیك غازی ( کەئەو کات وەلی عەهد ) بوو هات بۆ سلێمانی بەمەبەستی هێورکردنەوەی بارودۆخەکە، بەلام خەڵکی سلێمانی پێشوازی کردنی( غازی )یان کردە خۆپیشاندان، کەبەشێوەیەکی هێمن و ئارام لەبەردەرکی سەرا کۆبوونەوەو داوای مافی کوردیان دەکرد. لەبری جەماوەریش هەریەك لە(میرزا تۆفیق قەزاز) و (رەمزی فەتاح)داوایان لەحکومەت کرد دەنگیان بگەیێنێتە دەسەلاتداران[٦٩].

حکومەت لەم کاتەدا زۆر پەلەی بوو دەبوایە لە١٠ی ئەیلولی ١٩٣٠ پرۆسەی هەڵبژاردن کۆتایی پێ بێنێت، تاوەکو پەیماننامەکە مۆربکات[٧٠].

ئەم بارودۆخەی سلێمانی لەبەرژەوەندی حکومەتدا نەبوو، بۆئەم مەبەستە بڕیاردرا کەجێگری مندوبی سامی بەریتانی و جێگری سەرۆك وەزیرانی عێراق هەردوکیان بچنە کەرکوك و هەولێرو سلێمانی، ئەوەبوو چوونە ئەو شارانەو دانیشتوانی ئەو ناوچانەیان بینی[٧١].

هەروەها گوێیان لەبیرو بۆچونیان گرت، کەهەموویان داوای سەربەخۆییان دەکرد لەژێر سایەی بەریتانیادا. بەهەمان شێوە نوێنەری سەرۆك وەزیرانی عێراق بەڵێنی پێدان کەحکومەتی عێراق گفتەکانی خۆی لەپێش چاو دەگرێت، بەلام ئەوەشی بەئامادەبووەکان راگەیاند کەدژی هەموو ویستو داخوازیەکیشن کەمەترسی هەبێت بۆ سەر یەکێتی خاکی عێراق[٧٢].

کاتێك وەفدەکەی حکومەت زانی قسەکردن لەگەڵ خەڵکی سلێمانیدا هیچ ئاکامێکی نیە کە لەبەرژەوەندی حکومەتی عێراقیدا بێت، ئەوەبوو لە١٢ی ئابی ١٩٣٠دا وەفدەکە گەڕایەوە بۆ بەغدا[٧٣].

رۆژانی بەر لە٦ی ئەیلول قوتابیانی قوتابخانەی زانستی[٧٤] بەرچاوترین رۆڵیان هەبوو لەهاندانی جەماوەرو خۆپیشاندانیان[٧٥].

بەم جۆرە تادەهات باروبۆخی سلێمانی زیاتر ڕووی لەگرژی دەکرد. هەر لەو ڕۆژانە (ئەمین زەکی بەگ) نامەیەك دەنێرێت بۆ دۆستەکانی خۆی لەسلێمانیدا و داوایان لێدەکات کارێکی وەها نەکەن ببێتە هۆی کوشتارو خوێن ڕشتن، بەڵام عیزەت تۆپچی لەوەڵامدا، نامەیەك بۆ (ئەمین زەکی بەگ) دەنوسێتەوەو دەڵێت: (( کورد لەوە زیاتر لەوزەیدا نیە کەبێدەنگ دانیشێت بەرامبەر بێ بەڵێنی حکومەتی عێراق. کەناپەوێت بەهیچ جۆرێك لەو پەیمانەدا باسی مافی کورد بکات، لەبەرئەوە بڕیارمان داوە ڕاپەڕینێك بکەین))[٧٦]. بۆیە ڕووداوی کارەساتی ٦ی ئەیلول بەردەرکی سەرا کارەساتێکی چاوەڕوان کراو بوو.

**ب - ڕەوتی ڕوودلو پەرەسەندنەکان: -**

یەکەم جاربوو لەکوردستانی باشوور بەتایبەتی لەسلێمانی و لەمێژووی بزاڤی کوردایەتی دا خۆپیشاندان لەناو شارەکاندا ئەنجام بدرێت و خەڵك داوا کارییەکان و دروشمەکانیان لەسەر پارچە قوماش بنوسن و بەرزی بکەنەوە[٧٧].

لەهەمان کاتدا ئەو ڕاپەڕینە بەخاڵی وەرچەرخان دەژمێردرێت لەمێژووی بزوتنەوەی ڕزگاری نیشتمانی کوردستاندا، چونکە بۆ یەکەم جاربوو، قورسایی شۆڕش و خەبات لەلادێوە بگوازرێتەوە بۆشار، خەڵکی ڕووناکبیرو گەورە پیاوانی شار پێشڕەوی شۆڕش و ڕاپەڕین بکەن، ئەمەش بۆخۆی گۆڕانکارییەکی قووڵی جولانەوەی کوردایەتی پێك دەهێنا[٧٨].

ئەم ڕاپەڕینە لەلایەن دەستەی نیشتمانی(هیئـة الوطنيـة) دارێـژراوەو ئەندامانی ئەم کۆمەڵەیە بەهیچ شێوەیەك پەیوندیان بە(شێخ مەحمود) نەکردوە لەکاتی ڕێکخستنی ڕاپەڕینەکە، شێخ ڕەوف کوڕی (شێخ مەحمود) ئەم مەسەلەیەی وا لێکداوەتەوە، گوایە ئەوانەی بەڕاپەڕینەکە هەڵستاون پڕوپاگەندەیان دژی (شێخ مەحمود) کردووە،و گوتویانە ئەم جارە(شێخ مەحمود) لەناودانیەو کورد بەمافی خوی دەگات[٧٩].

هۆکاری پەیوەندی نەکردن بە(شێخ مەحمود) بۆئەوە دەگەڕێتەوە کەئەندامانی (هیئـة الوطنيـة) نەیان ویستووە ئەم مەسەلەیە تەشەنە بکات بۆ شۆڕشی چەکداری و خۆشیان بڕوایان بەتوندوتیژی نەبووە[٨٠].

حکومەت سوور بوو لەسەر ئەنجامدانی هەڵبژاردن و ئیمزاکردنی پەیمانی بەریتانی عێراقی[٨١]. هەرچی پێویست بوو بۆئەمە دەستی پیکرد بێ ئەوەی پرس یاخود دەنگی دانیشتوان وەربگرێت کەدەیان ویست هەڵبژاردن سەربەست و ئازادبێ گوێیان نەدانێ[٨٢].

ڕۆژی٦ی ئەیلول١٩٣٠ دانرا بۆ دەستنیشان کردنی لیژنەی پشکنین بۆ چاودێری هەڵبژاردنی نوێنەرانی پەرلەمان[٨٣].

(هەینەی وەطەنیە) لە٤ی ئەیلول لەماڵی عەزمی بەگی بابان دانیشتن و بڕیاریاندا لەهەڵبـژاردن بەشداری نەکەن، هەر ئەو ڕۆژەش فایەق بێکەس قوتابیەکانی زانستی لەگەڕەکی صابونکەران هێنایە خوارەوەو لەدەوری سەرا دانیشتن سرودی نیشتمانیان ئەخوێندو هوتافیان ئەکێشا[٨٤].

سەرەتا خەڵکێکی کەمیان لێ کۆبوونەوە کەژمارەیان پەنجا کەس دەبوو، بەڵام دواتر کاتێک دوکاندارەکانی بازاڕ هاتنە پاڵیان ئینجا ژمارەیان زیادی کردو گەیشتە نزیکەی ٤٠٠ کەسێك، ئەو جەماوەرەی لەبەردەرکی سەرادا کۆببوونەوە مەبەستی هەرە سەرەکیان ڕێگە نەدان بوو بەوانەی کەدەیانویست بچنە سەرا بۆ دەنگدان و بۆئەم مەبەستە بانگهێشت کرابوون[٨٥].

ئەوانەی کەدەیانویست بچن بۆ دەنگدان (٣٠) کەس دەبوون وەك (حاجی مەلا محی الدین، غالب ئاغا، فائق بەگی مارف بەگ، مەجید بەگی حاجی رسول بەگ، سەید ئەحمد بەگی دانیکە....هتد) کەئەوانە لەلایەن حکومەتەوە ڕاکێشرانە ناو سەرا بۆئەوەی بڕیاری هەڵبژاردن بدەن[٨٦].

ئینجا بەبڵاوبوونەوەی ئەم هەواڵە دوکان و بازاڕ داخران، لەهەمان کاتدا خوێندنگاکان چۆڵ کران. مەلاو فەقێیەکان لەمزگەوتەکان هاتنەدەر ، ئافرەتان پۆل پۆل هاتنەناو ڕیزی پیاوان، لەچایخانەکان بەگرامەفۆن سرودی نیشتمانی لێ ئەدراو خەڵك زۆر کۆبونەوەو هوتاف بەدەنگی بەرز لەدژی هەڵبژاردن دەدرا[٨٧].

لەبەردەرکی سەرادا دوو دروشمیان هەڵواسیبوو کە لەدروشمی یەکەم نوسرابوو ڕەوابێ مەتالیبی کورد ئەویتریشیان نوسرابوو بژی عەدالەتی کۆمەڵەی گەلان[٨٨].

ئەوەبوو زۆری پێ نەچوو جەماوەرەکە کەوتنە بەرد باران کردنی پۆلیسەکان و سەرایان دایەبەر بەردو پۆلیسەکانیش خۆیان کوتایە ناو حەوشەی سەرا لەترسی خەڵك[٨٩].

پۆلیسەکان پێشتر کەوتبونە پاڵنان بەخەڵکەکە چەند جارێك (بێکەس)یان ڕفاندو ویستیان بیگرن، بەڵام لەلایەن خەڵکەوە ڕزگار کرا[٩٠].

پۆلیسەکانی کەدەوری سەرایان دابوو نەیانتوانی بڵاوە بەخۆپیشاندەرەکان بکەن، بۆیە داوای هێزی فریاکەوتنیان کرد ئەوەبوو نزیکەی (١٠٠) سەربازی تر هاتن بۆ یارمەتیدانی پۆلیسەکان، تاکو دەهات بارودۆخەکە دژوارتر دەبوو[٩١].

ئەنجامی ئەم بارگرژیەی کەهەبوو خەڵکە خۆپیشاندەرەکە بەگژ پیاوانی پۆلیس و سەربازەکاندا چوون و بەدارو کورسی چایخانەکان بەربوونە پۆلیس و سەربازەکان، لەملاوەش سەربازانی ناو سەرا هاتن و ئەوانیش دەستیان کرد بەتەقەکردن لەخەڵکەکەو خەڵکەکەش تەقەیان لەسەربازەکان کردەوە، دوای ئەمە فەوجێك لەسەرباز بەهەموو جۆرە چەکێکەوە هاتن و خۆیان گەیاندە سەربانی سەراو لەسەربانی چایخانەکان خۆیان لێ

قایم کرد، ئینجا بەبێ ڕەحمانەو بێ دەست پاراستن خەڵکەکەیان دایەبەر ڕێژنەی گوللەو ژمارەیەك خەڵك کوژران و بریندار بوون(٩٢).

بەم جۆرە دەست درێژیکردنەی حکومەت بۆسەر هاوڵاتیان توانیان بڵاوە بەخەڵکەکە بکەن و ئەو ڕۆژە لەپۆلیس و سەرباز بترازێت کەس لەسەر شەقامەکان نەدەبینرا، لاشەی کوژراوەکان لەحەوشەی سەرادا کەڵەکە کرابوو و لەبری ژمارەی ئەوانە قسەو بۆچوونی زۆر هەیە، هەندێك سەرچاوە ژمارەیەکی خەیاڵی دادەنێن، بەڵام ئەو ناوانەی لەبەردەستدان و سەرچاوەیەکی نزیك لەکارەساتەکە ژمارەی قوربانیەکان لەنێوان (١٢-١٣) کەس دەبێت(٩٣).

بەقسەی ئەحمەد خواجە ١٤ شەهیدو ٢٣ بریندار هەبوو لەخەڵکی سلێمانی لەبەرامبەریشدا ١١کوژراو لەگەل ٣ بریندار لەپۆلیس، دوا بەدوای ڕووداوەکەش زیاتر لە٤٠٠ کەسی ناوداری سلێمانی دەسگیرو زیندانی کران(٩٤).

دواتر حکومەت کەوتە دەسگیرکردنی ئەوانەی دەستیان لەخۆپیشاندانەکە هەبوو بەشی هەرە زۆری کەسایەتیە ناودارەکانی سلێمانی دەسگیرکرد، وەك (عەزمی بەگی بابان، شێخ قادری حەفید، ئەورەحمان ئاغا، عیزەت بەگی وەسمان پاشای جاف، فایق بەگی بابان، مجید ئەفەندی کانیسکان، شێخ محمدی گوڵانی، ڕەمزی فەتاح، میرزا تۆفیق قەزاز ) کەئەمانە کەلەپچە کران و نێردران بۆ کەرکوك و پاش بردنی ئەوان (١٥٠) کەسی تریش لەناو شار دەسگیرکران(٩٥).

گیراوەکان دوانیان دران بەدادگا ئەوانیش (میرزا تۆفیق قەزاز، ڕەمزی فەتاح) بوون، دادوەرەکەش(مەعروف جیاوك) بوو، کە لەڕاستیدا ناوبراو خۆی نوێنەری (هەیئەی وەطنیە) بوو لەهەولێر، بەڵام زیندانی نەکران و ئازاد کران(٩٦).

بەم شێوەیە ئەم ڕۆژە ناونرا ڕۆژی ڕەشی ئەیلول دەکرێت بڵێین دڵسۆزانی کورد بۆ خۆیان بەهەڵە ناویان لێ ناوە ڕۆژی ڕەشی ئەیلول، بەڵکو ئەو ڕۆژە نەك هەر ڕەش نەبووە بەڵکو گوڵاڵە سوور بووە، چونکە بەخوێنی نەمرانی کورد ئاو دراوەو بووەتە مێژوو بۆ نەوەی داهاتوو(٩٧)..

**تەوەرەی سێیەم : دەرەنجامی ڕاپەڕینەکە**

**١- لایەنی سیاسی و کۆمەڵایەتی: -**

ئەم کارەساتەی ڕۆژی ڕەشی ٦ی ئەیلول لەهەموو لایەکەوە دەنگیدایەوە، لەعێراق و خانەقین هەتاکو زاخۆ، لەئێران و هەموو وڵاتی ئەردەڵان و موکری دا، لەبەغداو باشووری عێراق قسەو باسی هەموو دیوەخانێك بوو، تەنانەت سەرۆك وەزیرانی ئەوکات تەعبیری کوشتاری سلێمانی بەکارەساتەکەی (کەربەلا)دا کردووە(٩٨).

لەناو شاری سلێمانیشدا باروبۆخ بەتەواوی کرژبوو، حکومەتی عێراق هێزێکی ڕەوانەی سلێمانی کرد بەفەرماندەی (بەکر صدقی)[99] کەهەندێکیان لەچەند شوێنێکی ناوشارو دەوروبەری بنکەو پەناگەی سەربازیان دروست کردبوو، وەك(گۆڕی جولەکان و کارێزی دلیکی پاشا). بارەگای فەوجەکەش (کانی ئاسکان)بوو. تەنانەت لەترسی جەماوەر سەربانی مزگەوت و تەکیەکانیشیان کردبوو بەمۆڵگەی سەربازەکان، هەروەها سەربازەکان دلوای ناسنامەیان لەخەڵکەکە دەکردو سوکایەتیشیان پێدەکردن ئەگەر پێیان نەبوایە[100].

ئەگەر چی ئەم کارەساتە لەعێراق دەنگێکی زۆری دایەوە، بەڵام حکومەتی عێراقی گوێ ی پێنەداو بڕیاری دا هەڵبژاردن ئەنجام بدەن. ئەوەبوو لەڕۆژی١٥ی ئەیلولی١٩٣٠ بەئارەزووی خۆی هەڵبژاردنی ئەنجام داو (١٠) کەس لەکەسانی نزیکی خۆی بەئەندامی دەستەی پشکنین هەڵبژێردران[101]. ئەمانەش لەلایەن خۆیانەوە (ئەحمەد ساڵح، ئەحمەد موختار، محمد ساڵح، سەیفوڵا خەندان)یان بۆ ئەندام پەرلەمان هەڵبژارد. دواتریش نوێنەرەکانی سلێمانی هاوشانی نوێنەرانی هەولێرو کەرکوك و موصل بەشداریان کرد لەئاهەنگی کردنەوەی پەرلەمان کە لەڕێکەوتی ١ی تشرینی دووەمی ١٩٣٠ دا سازکرا[102].

دوای ئەنجامدانی هەڵبژاردن شوێنی موتەسەریفی سلێمانی چۆڵ بوو، بۆیە حکومەتی عێراق بیری لەوە کردەوە کەدووبارە موتەسەریفێك بۆ سلێمانی دەست نیشان بکات، بۆیە چەند پاڵێوراوێك دیاری کران لەوانە (محمد ئەمین زەکی، جەمال بابان، ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ)، لەئەنجامدا (ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ)[103] وەك موتەسەریفی سلێمانی دەست بەکاربوو، و (حاجی حمە صالح بەگ) کرا بەنائیب، هەروەها(رەمزی بەگ) کرا بەقائیمقام[104].

لەو کاتەدا لەسلێمانی وەفدێك ڕێکخرا بۆئەوەی بچن بۆ دیدەنی (مەلیك فەیسەڵ) دوای گەڕانەوەی لەچارەسەرکردنی نەخۆشی لە(لەندن) بۆئەوەی نیاز پاکی و گوێڕایەڵی خۆیان بۆ حکومەتی عێراق نیشان بدەن کەزۆر لەنوێنەرە کوردەکان لەم وەفدە بەشدار بوون و ئەمەش بەناوبانگە بەوەفدی کوردستان[105].

پاش ئەوەی سلێمانی دووچاری ئەم کارەساتە بوو لەنێوان خەڵکدا بەڕۆژی ڕەشی ئەیلول ناسراوە، بەڵام حکومەتی عێراق بەپاڵپشتی بەریتانیا بەردەوام بوو لەسەر مامەلەو هەڵس و کەوتی خراپی خۆی لەگەڵ خەڵکی ئەم شارە بەشێوەیەك دوو ڕۆژ دوای ڕاپەڕینەکە جەمیل مەدفەعی وەزیری ناوخۆ لەڕێگای نامەیەك بەژمارەی ( ٣٠\ ٢٩٥٢ ) ئاراستەی موتەسەریفەکانی هەریەکە لەهەولێرو موسل و کەرکوك و سلێمانی کرد کەتیایدا دەڵێت (( بەهیچ جۆرێك ڕێگا نەدەن جارێکی تر ڕووداوێکی وەك سلێمانی ڕووبدات )) ئەمەش بەڵگە بوو بۆ دەرك پێکردنی فەرمانڕەوایانی عێراقی بە لەدایك بوونی ڕاپەڕینێکی گەورەتر دوای ئەم ڕووداوە [106].

٢ـ هەڵوەشاندنەوەی پەیماننامەی ١٩ی کانوونی دووەمی ١٩٢٧: ـ

لەکاتی بەرپابوونی ڕاپەڕینی بەردەرکی سەرا (شێخ مەحمود) تا ئەو ڕۆژە لە(پیران)ی ناوچەی نێـوان پێنجوێن و مەریوان بێ دەنگ دانیشتبوو[١٠٧].

حکومەتی عێراق و بەریتانیا لەو کاتەدا مەترسی زۆریان هەبوو کە(شـێخ مـەحمود) دوای کارەساتەکەی ٦ی ئەیلول دەست بکاتەوە بەشۆرش و ڕاپەڕین، هەر بۆیە لـە ١٠ی ئـەیلولی ١٩٣٠ وەزیـری نـاوەخۆی عێـراق (جەمیل مەدفعی) نامەیەکی نارد بۆ (شێخ مەحمود)، داوای ئەوەی لێکرد کـەوا سەرپێـچی ئـەو پەیماننامەیـە نەکات کە لەگەڵ حکومەتـدا مـۆریکردووە لەڕێکـەوتی ١٩ی کـانوونی دووەمـی ١٩٢٧دا، بۆئـەوەی ئاسـایش و ئارامی نەشێوێنێت[١٠٨].

(شێخ مەحمود) دوای ئـەو ڕووداوە دەستەوەسـتان نەوەسـتا، بـەڵکو کەوتـە قـسەکردن لەگـەڵ سـەرۆک عەشیرەتەکان و دەستی کرد بە لەشکر کۆکردنـەوە لەماوەیـەکی کەمـدا لەشـکرێکی زۆری لـەدەور کۆبـۆوەو، بەنیازی تۆڵە وەرگرتنەوە، لەخەتی پێنجوێنەوە ڕووبەڕووی عێراق بۆوە[١٠٩].

لـەو سەروبەندەشـدا سـێ ئەفـسەری کـوردی سـوپای عێـراق هـەڵاتن و پەیوەنـدیان بـەهێزەکانی (شـێخ مەحمود) کرد ئەوانیش (محمود جەودەت، حامید جەودەت، ملازم کامل حەسەن) بوون[١١٠].

ئینجا (شـێخ مـەحمود) زنجیرەیـەک نامـەی نووسـی بـۆ موفەتیـشی ئیـداری سـلێمانی و مەنـدوبی سـامی بەریتانی لەبەغدا و بۆ (کۆمەڵـەی گـەلانیش) لەنامـەکەدا باسـی کوشـتارەکەی سـلێمانی و گرتنـی ڕۆشـنبیرو ئەشرافی کوردو ڕەفتاری خراپی حکومەتی عێراقی دەکا[١١١].

هەروەها داوا دەکات دام و دەزگای مەدەنی و سوپای عەرەب لە زاخۆوە تاوەکو خـانقین بکێـشرێتەوە و کاروباری ئەو ناوچەیە بدرێتە دەست حکومەتێکی کوردی لەژێر چاودێری بەریتانیا یـان هـەر ئەنـدامێکی تـری کۆمەڵەی گەلان[١١٢].

کاتێک (شێخ مەحمود) هیچ وەڵامێکی دەربـارەی ئـەو نامانـەی کـەناردبووی وەرنـەگرت، ئینجـا (شـێخ مەحمود) بڕیاری دا دەست بەهێرش بکات و لەشکری کرد بـەدوو قۆڵـەوە، قـۆڵێکی لەدەوروبـەری پێنجـوێن و قۆڵێکیشی بۆ ناوچەی پشدەر نارد[١١٣].

حکومەتی عێراق کەزانی کار گەیشتۆتە ئەو ئاستە ئەویش هێزێکی زۆری لەژێر فەرماندەی(بکر صدقی) و یارمەتیدانی (بەهادین نوری)دا بۆ قۆڵی شاربازێڕو سیوەیل ناردو، بوو بەشەڕ هێزی کورد بەتەواوی سەرکەوتن و چەک و جبەخانەی زۆریان کەوتە ژێر دەست[١١٤].

لەدواییدا حکومەتی عێراقی کەزانی بەشەڕ توانای زاڵبوونی نیە بەسەر (شێخ مەحمود)، کەوتە دڵدانەوەی عەشایرو کڕینی سەرۆکەکانی کەئەمەیان بوو بەهۆی سەرکەوتنی حکومەت و دەستبەردار بوونی (شێخ مەحمود)[115].

ئینگلیزو حکومەتی عێراقیش مەترسیەکی زۆریان لێ نیشتبوو لەوەی نەوەکو (شێخ مەحمود)و چەکدارانی کورد پەلاماری سلێمانی بدەن و ڕزگاری بکەن هەربۆیە نەخشەیەکی وردو تێرو پڕیان بۆ بەرگری و پاراستنی سلێمانی دانابوو، بەناوی (پرۆژەی بەرگری لەسلێمانی) و دەقی پرۆژەکەیان بەسەر دامودەزگا باڵاکانی حکومەت دابەش کردبوو[116].

وێڕای ئەم پرۆژە بەهێزە هێشتا دڵنیا نەبوون لەبارودۆخی سلێمانی و کاردانەوەی جەماوەرەکەی هەر بۆیە لەرێکەوتی ٢٤ی ئاداری ١٩٣١دا بەپاساوی نائارامی بارودۆخ. ئەنجومەنی وەزیرانی عێراق بەپێی بڕیارێك، حوکمی عورفی لەسلێمانیدا ڕاگەیاندو بڕیاریدا کاروباری سەربازی و مەدەنی بدەن بەفەرماندەیەکی سەربازی لێهاتوو، تاوەکو باری نائارامی لەشارەکەدا نەهێڵێت[117].

لەم حاڵەتی ترس و گومانەش ناهەقیان نەبووە، چونکە لەم کاتەدا (شێخ مەحمود) سەرقاڵی خۆئامادەکردن بووە بۆ هێرش کردنە سەر شاری کەرکوك و توانیویەتی تا دەوروبەری ئەم شارەش بکشێ، لەرۆژی ٥ی نیسانی ١٩٣١دا لەدووری تەنها (٢٠) میل لەدوزخورماتوز لەگوندی ئاوباریك شەڕیکی سەخت لەگەڵ حکومەتدا بقەومێنێت[118].

بەڵام (شێخ مەحمود) لەم شەڕەدا نەك هەر شکا، بەڵکو لەمەسەلەی کاری چەکداریش نائومێد بوو، لەبەرئەوەی هێزەکانی (شێخ مەحمود) زۆر نابەرامبەر بوون، جگە لەوەش عەشائیری هاودەنگی (شێخ مەحمود) وەکو بەڵێنیان پێ دابوو بەدەنگیەوە نەهاتن بەڵکو دژی جووڵانەکەی بوون[119].

بۆیە (شێخ مەحمود) و هێزەکەی گەرانەوە پەڕان لەسەر سنوری ئێران، بەڵام ئەمجارە هێزەکانی فارس بەرەنگاری (شێخ مەحمود) بوونەوەو نەیان هێشت لەسنووری ئەوان بپەرنەوە بۆیە (شێخ مەحمود) ناچار بوو بگەڕێتەوە پێنجوێن[120].

لە١٣ی مایسی ١٩٣١ (شێخ مەحمود) خۆی تەسلیم بەحکومەت کرد بەدوور خراوەیی هێنرایە (سەماوە) پاشان بۆ (ناسریە) و ماوەیك بۆ (عانە) و لە ١٩٣٣دا هێنرایە بەغدا، لەوێ نیشتەجێ کرا[121].

بەخۆبەدەستەوەدانی (شێخ مەحمود) ئیتر تۆماری خەباتی سیاسی چەکداری کورد لەو قۆناغە پێچرایەوەو بانگی سەربەخۆیی کوردستان و داوای دامەزراندنی حکومەتی سەربەخۆیی کپ بوو[122].

٣- لایەنی ڕۆشنبیری: -

نووسەران و ڕووناکبیرانی ئەو سەردەمەی کوردستان بەشیعر و چیرۆك و پەخشان لەم کارەساتەی ٦ی ئەیلولی بەردەرکی سەرای سلێمانی دواون، مەسەلەکە ئەوەندە گرنگ بووە ئەگەر بمانەوێ ئەو بەرهەمە کاریگەرانە کۆبکەینەوە ئەوا کتێبێکی گەورەی لێدەردەچێت. بەم جۆرە دەبینین چەندین شاعیری ناسراوی کورد تایبەت بەم ڕۆژە خوێناویە بەجۆرێك هەستی ڕوونی کوردانەی خۆیان دەربڕیووە، لەویژدانی خەڵکیش دا (شەشی ئەیلول) کە بەڕۆژی ڕەشی ئەیلول ناسراوە بووە هۆی پەرەسەندن و سوور بوونی کورد بۆ بەدیهێنانی مافەکانی، لەهەمان کاتدا ڕۆژی شەشی ئەیلول بوو بەمێژوویەکی ناسراو [١٢٣].

بۆنموونە شاعیری شۆڕشگێڕو گرنگی خۆپیشاندان (فایەق بێکەس) (١٩٠٥-١٩٤٨ن) دوای کارەساتەکە و دەستگیربوونی لەزینداندا قەسیدەیەکی ئاگرین لەم ڕووەوە کۆڵنەدان و گەشبینی پێشکەش دەکات :

ئەی وەتەن مەفتونی تۆم و شێوەتم بیرکەوتەوە
وەختی بەندی و ئەسارەت پێ بەتەوق و کۆتەوە
من لەزیکر و فکری تۆ غافل نەبوم واتێنەگەی
حەپس تێهەلدان و زیللەت تۆی لەبیر بردۆتوە [١٢٤].

ئەحمەد حمدی بەگی ساحێبقران (حمدی) (١٨٧٨-١٩٣٦ن) شاعیری شۆرشگێر و واقیع بین لەنزیکەوە بەقەسیدەیەکی تێروتەسەل لەو زوڵم و دەست وەشاندنە دەدوێ و هەناسە بۆ کڵۆلی کورد هەڵدەکێشی نەفرەت لەداگیرکەرو چەوسێنەران دەکات بەم شێوەیە:

بۆ هەوا ئالۆزە بۆچی لێل و سوورە ئاسمان؟
گێژەلووکەی نەگبەتە یا فیتنەی ئاخر زەمان
هەوری فەهری مەوجی دەریای غەزەب دێنێتەجۆش
یا فورغان و دووکەڵی ئاهی هەناسە ساردەکان [١٢٥].

هەروەها شاعیری گەورەی کورد پیرەمێرد (١٨٦٧-١٩٥٠ن) بەبۆنەی چوونی وەفدی کوردستان بۆ بەغدا و بەخێر هاتنەوەی مەلیك فەیسەڵ دوای گەڕانەوەی لەچارەسەرکردنی نەخۆشی لە لەندەن شیعرێکی نووسیوەو دەڵێ:

قەدری میللەتتان بەجارێ شکاند
ئەحەیاتان ما نەناوو نیشان
باری تەعنەتان وا هاتە سەر شان
((وەفدی کوردستان، میللەت فرۆشان
هەرزە وەکیلی شاری خامۆشان)) [١٢٦].

لـەم بارەوەش گـۆرانی شـاعیر (١٩٠٦-١٩٥٨ن) دەربارەی ئـەم کارەسـاتە نووسیویەتی:

هەزارو نۆصەد و سی بوو، شەشی ئەیلول کە ڕۆژهەڵهات
غریوی ویسـتنی حـەق کـەوتـە نـاو شـاری سلێمانی
(هەلۆ بەگ) ئـەو جـوانەی پـڕ دڵی بـوو بۆ وەتـەن ئاوات
لە پێش جەمعێکەوە تا بەرسـەرا ڕووی هەڵمەتی هانی(١٢٧).

پەراوێزەکان :

---

(١) عبدالرحمن قاسملۆ، کوردستان و کورد(لێکۆڵینەوەیەکی سیاسی وئابوری)یە، وەرگێرانـی: عبـدالله حـسن زادە، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٦، ل٧٢.

(٢) مێجەر نوێل، ئەفسەرێکی بەریتانی بوو لەهەمان کاتدا شارەزای خاکی کوردستانیش بوو لەسەرەتا لەناو هێزی بەختیاری کاری دەکرد لە وولاتی فارس لەکاتی جەنگی جیهانی یەکەم چاودێری چـالاکیەکانی ئـەڵمانی دەکرد لەو ناوچەیە، لەناوەڕاستی تشرینی دووەمی ١٩١٨ وەکو حـاکمی سیاسـی لەکـەرکوك دامـەزرا، دواتـر وەکو ڕاوێژکار لەگەڵ (شێخ مەحمود) کاری کردوە. المس بیل، فصول من تأریخ العراق القریب، ترجمة: جعفر الخیاط، بیروت، ١٩٧١، ص ٢٠٨.

٣/ ئەحمەد تەقی، خەباتی گەلی کورد لەیاداشـتەکانی (ئەحـمـەد تـەقی)دا، ڕێکخـستن وئامـادەکردنی: جـەلال تەقی، بەغدا، ١٩٧٠، ل٢٢-٢٣ ؛ ڕەفیق حیلمی، یادداشت: چاپی سێیەم، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل٤٦-٤٧.

(٤) عبدالرحمن قاسملۆ، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٤.

(٥) عبدالرحمن ادریس صالح، الشیخ محمود الحفید البرزنجي (والنفوذ البریطاني في کردستان العراق حتی عام ١٩٢٥)، الطبعة الثانیة، السلیمانیة، ٢٠٠٧،ص١٤٢-١٤٣ ؛ ئەحمەد تەقی، سەرچاوەی پێشوو، ل٣١.

(٦) عـەلی سـەیدۆ گـەورانی، لەعەمانـەوە بـۆ ئامێـدی گەشـتێك بەکوردسـتانی باشـوور، وەرگێرانـی: تاڵیـب بەرزنجی، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠١، ل١٣٢.

(٧) کۆمەڵە سیاسییەکانی کوردی لەئەستەمبۆل کە (کۆمەڵەی بەرزی کورد)، (کۆمەڵەی جێ بەجێ کردنی کاروباری کۆمەڵایەتی)، (کۆمەڵەی سەربەخۆیی کورد) بوون، علاءالدین سجادی، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٩.

(٨) شەریف پاشا خندان: لەساڵی ١٨٦٥ لەئەستەمبۆل لەدایك بووە، لەئەسڵدا کوردەو خەڵکی سلێمانیەو چەندین پۆستی سەربازی و دیبلۆماسی وەرگرتووە لەدەوڵەتی عوسمانی، هەروەها نوێنەرایەتی گەلی کوردی لەکۆنگرەی ئاشتی کرد لەپاریس، جرجیس فتح الله، یقظة الکرد، اربیل، ٢٠٠٢، ص٩٩.

(٩) کۆنگرەی ئاشتی لەپاریس: لەدوای تەواو بوونی جەنگی یەکەمی جیهانی دەستی بەکارەکانی کرد لە (١٨ کانونی دووەمی ١٩١٩– ٢١ کانونی دووەمی١٩٢٠) بەردەوام بوو، لەمەسەلە گرنگەکانی ئەم کۆنگرەیە دابەشکردنی موستەلەکاتی هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و ئەڵمانی بوو، کوردیش وەك میللەتێکی ژێر دەستە کاوتەخۆ بۆئەوەی لەو کۆنگرەیە وەکو نەتەوەکانی تر بتوانی لەرێگای بریارەکانی کۆنگرەی پاریس مافەکانی خۆی بەدەست بهێنێت لەم بوارەشدا(شەریف پاشا) نوێنەرایەتی کوردی دەکرد. کمال مظهر احمد، کردستان فی سنوات الحرب العالمیة الأولی، ترجمة: محمد الملا عبدالکریم، الطبعة الثانیة، بغداد، ١٩٨٤.

(١٠) محمد ئەمین زەکی، خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان، بەرگی چوارەم، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل١٨٩.

(١١) عزیز شەمزینی، جولانەوەی رزگاری نیشتمانی کوردستان، وەرگێرانی: فەرید ئەسەسەرد، چاپی سێیەم، سلێمانی، ١٩٩٨، ل١٠٨؛ ولید حمدی، کوردو کوردستان لەبەڵگەنامەکانی بەریتانیادا (لێکۆڵینەوەیەکی مێژووی بەڵگەییە)، وەرگێرانی: محمد نوری توفیق، چاپی دووەم، سلێمانی، ١٩٩٩، ل١٨.

(١٢) کۆمەڵەی گەلان: وەکو رێکخراوێکی گەورەی نێودەوڵەتی لەئەنجامی داواکاری ژمارەیەك لەووڵاتان و بیرمەندان و رێکخراوەکان وەکو دەزگایەکی نێودەوڵەتی دامەزرا، تاکو رۆڵی خۆی هەبێت لەرێکخستنی پەیوەندی نێودەوڵەتی و چارەسەرکردنی کێشەکان و بەدیهێنانی ئاشتی جیهانی، لە١٠ ی کانونی دووەمی ١٩٢٠ بەشێوەیەکی فەرمی کرایەوە. کەمال مەزهەر ئەحمەد، چەند لاپەرەیەك لەمێژووی گەلی کورد، بەغدا، بەرگی یەکەم ، ١٩٨٥، ل٩٤–١٠٠.

(١٣) عبدالرزاق الحسنی، العراق فی دوری الاحتلال والانتداب، الجزء الأول، سوریة، ١٩٣٥، ص٢٩٦.

(١٤) شێخ لەتیفی حەفید، یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید، ئامادەکردنی: کمال نوری معروف، چاپی یەکەم، دهۆك، ١٩٩٥، ل٥٣.

(١٥) محسن محمد المتولی، کرد العراق، الطبعة الأولی، بیروت، ٢٠٠١، ص١٩٦.

(١٦) علاءالدین سجادی، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٣.

(١٧) ئۆزدەمیر پاشا: ئەفسەرێکی گەورەو لێهاتووی تورك و لایەنگری مستەفا کەمال بوو بەپلەی (عەقید). ئۆزدەمیر نازناوی بوو خۆی ناوی عەلی شەفیق بەگ بوو کە بەڕەکەز لە چەرکەسەکانی میسر بوو، ئۆزدەمیر لەزمانی تورکی بەمانای ئاسنی(بێ خلت) دێت. علي كمال عبدالرحمن، مذكرات علي كمال عبدالرحمن١٩٠٠–١٩٩٨، بغداد ، ٢٠٠١، ص٦٠.

(١٨) شێخ لەتیفی حەفید، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٠.

(١٩) محسن محمد المتولي، المصدر السابق، ص١٩٨ـ ١٩٩.

(٢٠) ڕەفیق حیلمی، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٠٩–٢١٠.

(٢١) محمد رسول هاوار، شێخ مەحمودی قارەمان ودەوڵەتەکەی خواروی کوردستان، بەرگی دووەم، لندن، ١٩٩١، ل٤٢٩.

(٢٢) محمد مظفر الادهمي، المجلس التأسيسي العراقي، بغداد، الجزء الثاني، الطبعة الثانية، ١٩٨٩، ص٣٠ ؛ عبدالرحمن ادريس صالح، المصدر السابق، ص٢١٦.

(٢٣) محمود الدرة، القضية الكردية، الطبعة الثانية، بيروت، ١٩٦٦، ص١٤٧ ؛ علاءالدین سجادی، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٥.

(٢٤) ڕەفیق حیلمی، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٣٢.

(٢٥) کریس کۆچیرا، کورد لەسەدەی ١٩ـ ٢٠دا، وەرگێڕانی: حەمەکریم عارف، چاپی سێیەم، هەولێر، ٢٠٠٦، ل٨٠.

(٢٦) شێخ لەتیفی حەفید، سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٨ـ ١١١.

(٢٧) علاءالدین سجادی، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٩.

(٢٨) سروه اسعد صابر، كوردستان من بداية الحرب العالمية الاولى الى نهاية مشكلة الموصل (١٩١٤–١٩٢٦)، الطبعة الأولى، أربيل، ٢٠٠١، ص٢٤٨

(٢٩) عبدالرحمن قاسملۆ، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٤.

(٣٠) هەمان سەرچاوە، ل٧٥.

(٣١) مسعود بارزانی، بارزانی و بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد، وەرگێڕانی: سەعید ناکام، چاپی یەکەم، دهۆك، ١٩٩٨، ل١٢.

(٣٢) فاضل حسين، مشكلة الموصل، الطبعة الأولى، بغداد، ١٩٥٥، ص٣٨ـ٣٩.

(٣٣) محمد رسول هاوار، (شێخ مەحمود)ی قارەمان...، بەرگی دووەم، ل٥٣١ـ ٥٣٢

(٣٤) جعفر عسكری: لەساڵی ١٨٨٥ لەگەرەكی جامع علی افندی لەبەغدا لەدایك بووە، هەروەها یەكەمین وەزیری بەرگری نویێ ی عێراق بوو كە بەڕەچەڵەك كورد بووە، ماوەیەك سەرۆك وەزیرانی عێراقی بووە. علاء جاسم محمد، جعفر العسكری ودوره السیاسی والعسكری فی تأریخ العراق حتی عام ١٩٣٦، الطبعة الثانیة، بغداد، ١٩٨٧، ص٢٤.

(٣٥) علاءالدین سجادی، سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٣.

(٣٦) ڕەفیق ساڵح، سێ ڕۆژنامەی ڕۆژگاری شێخی نەمر (١٩٢٣ ـ ١٩٢٤) لێكۆڵینەوەی: د.كەمال فوئاد و سەدیق ساڵح، سلێمانی، ٢٠٠١، ل٢٣.

(٣٧) لێڤی: لەووشەی "Levy"ی ئینگلیزییەوە وەرگیراوە كەیەكێك لەواتاكانی هێزی كۆكراوە دەگەیەنێ، دوای داگیركردنی عێراق ئینگلیزەكان بەناوی "لیڤی"یەوە هێزێكی تایبەتیان دامەزراند بۆ پاراستنی بەرژەوەندی و دەزگا تایبەتیەكانیان و لێدانی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی كورد. جی كیلبرت براون، قوات اللیفي العراقیة (١٩١٥–١٩٣٢)، ترجمة: مؤید ابراهیم الونداوي، السلیمانیة، ٢٠٠٦، ص٤٣–٤٧.

(٣٨) محسن محمد المتولی، المصدر السابق، ص٢٠٧.

(٣٩) كریس كۆچێرا، سەرچاوەی پێشوو، ل٩١.

(٤٠) كامەران أحمد محمدامین، كوردستان لەنێوان ململانێی نێودەولەتی وناوچەییدا(١٨٩٠–١٩٣٢)، چاپی یەكەم، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل١٦١.

(٤١) واسیلی نیكتین، كوردوكوردستان، وەرگێڕانی: خالیدی حسامی (هێدی)، هەولێر، ١٩٩٨، ل٥٧٤ ؛ محمد ئەمین زەكی، سەرچاوەی پێشوو، ل١٩٠–١٩١.

(٤٢) خەتی برۆكسل: هێڵی نێوان سنووری عێراق و توركیایە لەئەنجامی كۆبونەوەیەكی نائاسای بۆ ئەنجوومەنی كۆمەڵە لە(برۆكسل)ی پایتەختی بەلجیكا پێكهێنرا، ئەوەبوو نوێنەری بەریتانیا نەخشەیەكی دایە ئەنجوومەن بۆ دەست نیشانكردنی سنوری نێوان ئەم دوو دەوڵەتە، بۆ ئەم مەبەستەش هەردوولا ئەو هێڵەیان پەسەند كرد كەبەهێڵی برۆكسل ناسراوە. ستیفن همسلی لونكریك، العراق الحدیث (١٩٠٠–١٩٥٠)، ترجمة: سلیم طه، جزء الأول، الطبعة الأولى، بغداد، ١٩٨٨، ص٢٥٤.

(٤٣) كریس كۆچێرا، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٢.

(٤٤) أیوب بارزانی، المقاومة الكردیة للاحتلال ( ١٩١٤ ـ ١٩٥٨ )، الجزء الاول، فرنسا، ٢٠٠٢، ص٧٦.

(٤٥) المصدر نفسه، ص٧٧.

(٤٦) کینهان کورنوالیس: ئەفسەرێکی بەریتانی بوو لەجەنگی جیهانی یەکەم لەمەکتەبی عەرەبی قاهرە کاریکردوە، دواتر بوو بەئەفسەری پەیوەندی لەنێوان ئەمیر فەیسەڵ و سەرکردەی بەریتانی لەسوریا، پاشان کرا بەراوێژکاری وەزیری ناوخۆی عێراق و مەلیك فیسەڵی یەکەم لەبیستەکانی سەدەی ڕابردوو.عبدالرحمن ادریس صالح، المصدر السابق، ص١٩٧.

(٤٧) محسن محمد المتولی، المصدر السابق، ص٢٠٨.

(٤٨) أیوب بارزانی، المصدر السابق، ص٧٧.

(٤٩) کامەران ئەحمەد محمدامین، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٦٥ ؛ عزیز الحاج، القضیة کردیة في العشرینات، الطبعة الثانیة، بغداد، ١٩٨٥، ص١٠٨-١٠٩.

٥٠ أیوب بارزانی، المصدر السابق، ص٧٨.

٥١عبدالفتاح علی یحیی، وثائق عن الحرکة القومیة الکردیة التحرریة، الطبعة الأولی، أربیل، ٢٠٠١، ص٣٣.

٥٢ئاکۆ عبدالکریم شوانی، شاری سلێمانی (١٩١٨ـ١٩٣٢)، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل٢٣٠.

٥٣ ولید حمدی، سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٨-١٨٩.

٥٤ علاءالدین سجادی، سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٣.

٥٥ عبدالرزاق الحسنی، العراق فی دوری الاحتلال والانتداب، الجزء الأول، سوریة، ١٩٣٥، ص٣٠٩ ؛ محمود الدرة، المصدر السابق، ص١٥٥-١٥٦.

٥٦ یاسین الهاشمي: کەسایەتیەکی بەتواناو لێهاتوو بوو، لەنێو خەڵکیدا بەچاوی ڕێزەوە سەیر دەکرا، لەهەمان کاتدا بەتواناترین سیاسەتمەداری ئەو کاتەی عێراق بوو بەتایبەتی پاش مردنی (مەلیك فەیسەل)ی یەکەم لەئابی ١٩٣٣، هەروەها دوو جار پۆستی سەرۆك وەزیرانی عێراقی وەرگرتووە. محمد اسماعیل محمد، ئینقلابی بەکر صدقی لە ٢٩/١٠/١٩٣٦، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٧، ل٢٣.

٥٧عبدالفتاح علی یحیی، المصدر السابق، ص٣٣.

٥٨ کەمال مەزهەر ئەحمەد، کورد لەدروشمی ڕژێمی پاشایەتیدا، گۆڤاری (ڕەنگین)، ژمارە (١١٠)، ١٩٩٨، ل١٠.

٥٩ عبدالرزاق الحسنی، تاریخ الوزارات العراقیة، الجزء الثالث، الطبعة السابعة، بغداد، ١٩٨٨، ص٢١.

٦٠ محمد رسول هاوار، شێخ مەحمودی قارەمان ....، بەرگی دووەم، ل٧٠٩.

٦١ أیوب البارزانی، المصدر السابق، ص٧٨.

٦٢ کەمال مەزهەر ئەحمەد، کوردوکوردستان (لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حکومەتی بەریتانیادا)، ئامادەکردنی: عبدوللا زەنگەنەو شەهلا تاهیر ، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، لوبنان، ٢٠٠٨، ل١٥٨

٦٣ محمد رسول هاوار، شیخ مەحمودی قارەمان...، بەرگی دووەم، ل٦٠٣.

٦٤ ئاکۆ عبدالکریم شوانی، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢٣.

٦٥ توفیق وەهبی: یەکێك لە پیاوە ناسراوەکانی ئەو سەردەمەی سلێمانی بووە. لەسلێمانی وبەغدا و ئەستەمبۆل خوێندویەتی، لەسەرەتای بیستەکان گەڕایەوە بەغدا، دوای ئەوەی (شێخ مەحمود) لەدیلی ئازاد کرا بوو بەحوکمدار، توفیق وەهبی گەڕایەوە سلێمانی و بوو بەیاوەری، لەدوای داگیرکردنی سلێمانی لە١٩٢٢ کوردستانی جێهێشت و بووە ئەفسەر لەسوپای عێراقی، ماوەیەکیش فەرماندەی قوتابخانەی جەنگی بووە لەبەغدا. هیوا حمید شریف، توفیق وهبی (١٨٩١–١٩٨٤) حیاته ودوره السیاسی والثقافي، السلیمانیة، ٢٠٠٦، ص١٩–٣٥.

٦٦ نەوشیروان مستەفا ئەمین، کوردستانی عێراق سەردەمی قەڵەم و موراجەعات (١٩٢٨-١٩٣١)، چاپی یەکەم، سلێمانی، ١٩٩٩، ل٥٣.

٦٧ محمد رسول هاوار، شیخ مەحمودی قارەمان...، بەرگی دووەم، ل٧١٤ ؛ کەمال مەزهەر ئەحمەد، کوردو کوردستان لە بەڵگەنامە نەهێنییەکانی...، بەرگی یەکەم، ل ١٦٦ – ١٦٧.

٦٨ نەوشیروان مستەفا ئەمین، سەرچاوەی پێشوو، ل٥٣.

٦٩ مستەفا سالح کریم، یادی ٦٢ ساڵەی ڕاپەڕینی ٦ ئەیلولی ١٩٣٠، ڕۆژنامەی (کوردستانی نوێ)، ژمارە (١٨٤)، یەك شەممە ٦ی ئەیلول ١٩٩٢، ل٣.

٧٠ عبدالرزاق الحسني، تاریخ الوزارات العراقیة...، الجزء الثالث، ص٦٧.

٧١محمد رسول هاوار، شیخ مەحمودی قارەمان...، بەرگی دووەم، ل٧١٤.

٧٢ ئاکۆ عبدالکریم شوانی، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣٦ ؛ عزیز الحاج، المصدر السابق، ص١١١.

٧٣ ڕۆژنامەی ژیان، ژمارە (٢٥٨)،سلێمانی، ٢٨ی ئابی١٩٣٠.

٧٤ قوتابخانەی شەوانە کەبە (زانستی) ناودەبرا کەمەڵبەندی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری بووە لەو سەردەمە لە سلێمانیدا و مامۆستاکان بەخۆڕایی دەرسیان تیایدا دەوتەوەو چەندین ڕووناکبیرو شاعیر لەم قوتابخانەیە پێگەیشتن، ماوەیەك کەریم بەگ بەڕێوەبەری بووە. محمد رسول هاوار، شێخ مەحمودی قارەمان...، بەرگی دووەم، ل٦٠٣

٧٥ علاءالدین سجادی، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٣.

٧٦ محمد رسول هاوار، شێخ مەحمودی قارەمان...، بەرگی دووەم، ل٧٥٢.

٧٧ ئاکۆ عبدالکریم شوانی، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣٩.

٧٨جلال الطالباني، کردستان والحرکة القومیة الکردیة، الطبعة الثانیة، بیروت، ١٩٧١، ص١١٣.

٧٩ محمد رسول هاوار، شیخ مەحمودی قارەمان...، بەرگی دووەم، ل٧٤٠.

٨٠ علاءالدین سجادی، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٤.

٨١ نەوشیروان مستەفا ئەمین، سەرچاوەی پێشوو، ل٦١.

٨٢ رەشید کریم، بیرەوەری (سی ویەك سالّ لەژیانی مامۆستایەك)، سلێمانی، ١٩٦٠، ل١٩.

٨٣ سەدیق سالح– کامیل حەسەن، لاپەڕەیەکی ون، گۆڤاری (هەزارمێرد)، ژمارە (٨)،١٩٩٩، ل٢٣ ؛ محمود الدرة، المصدر السابق، ص١٥٧.

٨٤ نەوشیروان مستەفا ئەمین، سەرچاوەی پێشوو، ل٦١.

٨٥ ئاکۆ عبدالکریم شوانی، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤٠.

٨٦ میرزا محمد ئەمین مەنگوری، کوشتاری ٦ی ئەیلولی ساڵی١٩٣٠، هەفتەنامەی (سلێمانی نوێ)، ژمارە (٢)، ٢٠٠٢، ل٢٣.

٨٧ نەوشیروان مستەفا ئەمین، سەرچاوەی پێشوو، ل٦١ ؛ میرزا محمد ئەمین مەنگوری، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤.

٨٨ ئەکرەمی محمودی سالّح ڕەشە، شاری سلێمانی، پێداچونەوەی: عیزەدین مستەفا رسول، بەشی دووەم، بەغدا، ١٩٨٧، ل٣٢٧.

٨٩ مەلا عەبدوللاّی زێوەر، گەنجینەی مەردان و یادداشتی ڕۆژانی دەربەدەری، بەغدا، ١٩٨٥، ل١٢١–١٢٢.

٩٠ رشید کریم، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٨.

٩١ علاءالدین سجادي، سەرچاوەی پێشوو،١٢٥ ؛ نەوشیروان مستەفا ئەمین، سەچاوەی پێشوو، ل٦٢.

٩٢ جەمال بابان، سلێمانی شارە گەشاوەکەم، بەشی دووەم، بەغدا، ١٩٩٨، ل١٣٠ ؛ ولید حمدی، سەرچاوەی پێشوو، ل١٩٤.

٩٣ عبالرزاق الحسنی، تاریخ الوزارات العراقیة...، الجزء الثالث، ص٧١.

٩٤ ئەحمەد خواجە، چیم دی، بەرگی سێیەم، سلێمانی، ١٩٧٠، ل٨٢–٨٣.

٩٥ سروه أسعد صابر، کوردستان من بدایة الحرب العالمیة الأولی الی نهایة مشکلة الموصل (١٩١٤–١٩٢٦)، الطبعة الأولی، أربیل، ٢٠٠١ ، ص ١٦١.

٩٦ محمد رسول هاوار، شیخ مەحمودی قارەمان...، بەرگی دووەم، ل٧٢٤.

٩٧کەمال مەزهەر ئەحمەد، کوردو کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنیەکانی ...، بەرگی یەکەم، ل١٤٧.

٩٨ علاءالدین سجادي، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٧.

٩٩ بەکر صدقی: لەدایك بووی بەغدایە لەساڵی ١٨٩٠، لەدایك و باوکێکی کوردەو دەرچووی کۆلێژی سەربازی تورکی یە، هەروەها ئەفسەرێکی لێهاتووی هەردوو سوپای عێراقی و عوسمانی بوو لەکۆلێژی ئەرکان لە کمبرلی لەساڵی ١٩٣٢ خوێندوویەتی، لەساڵی ١٩٢١ پەیوەندی بە سوپای عێراق کردو باشترین سەرکردەی سوپا بوو لە سوپای عێراق. فؤاد عارف، مذکرات فؤاد عارف، الجزء الأول، الطبعة الأولى، دهۆك، ١٩٩٩، ص١١٢-١١٣.

١٠٠ ئاکۆ عبدالکریم شوانی، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤٥.

١٠١ ڕۆژنامەی ژیان، ژمارە (٢٦٠)، سلێمانی، ٤ی ئەیلولی ١٩٣٠، ل٢.

١٠٢ عبدالرزاق الحسني: تاريخ الوزارات العراقية...، الجزء الثالث، ص٦٣.

١٠٣ ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ: پیاوێکی ناودارو تێگەیشتووی ناوسلێمانی بووە، کاتێك سلێمانی بەیەکجاری لەلایەن عێراق و بەریتانیا داگیرکرا، بوو بەلیوایەك و بەسترا بەعێراقەوە، ئەو کرا بەموتەسەریفی سلێمانی لە(١٩٢٤ ـ١٩٢٧) لەم ماوەیەدا گرنگی زۆری بەلایەنی ڕۆشنبیری داوەو یەکەمین (سەرۆکی جەمعیەی کوردستان) بووە لەم کاتەدا. نەوشیروان مستەفا ئەمین، سەرچاوەی پێشوو، ل٦٣.

١٠٤ میرزا ئەمین مەنگوری، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤.

١٠٥ سروه اسعد صابر، كوردستان الجنوبية (١٩٢٦-١٩٣٩)، الطبعة الأولى، السليمانية، ٢٠٠٦، ص١٦٤.

١٠٦ نەوشیروان مستەفا ئەمین: سەرچاوەی پێشوو، ل٦٤ ؛ کەمال مەزهەر ئەحمەد، کوردو کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی ...، بەرگی یەکەم، ل.١٧٦

١٠٧ ئەکرەمی مەحموودی صالح ڕەشە، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٢٨.

١٠٨ دیوانی بێکەس، ئامادەکردنی: محمدی مەلا کریم، بەغدا، ١٩٧٠، ل٧-٨.

١٠٩ دیوانی ئەحمەد حەمدی بەگی ساحێبقران، بەغدا، ١٩٥٧، ل٦٩.

١١٠ محمد رسول هاوار، دیوانی پیرەمێردی نەمر، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل٩٣.

١١١ عبدالله گۆران، دیوانی گۆران، چاپی سێیەم، تاران، ١٣٨٦هەتاوی، ل١٩٩.

١١٢ جەمال بابان، سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٥ ؛ سروه اسعد صابر، كوردستان الجنوبية...، ص١٦٦.

١١٣ محمد رسول هاوار، شێخ مەحمودی قارەمان...، بەرگی دووەم، ل٧٥٤.

١١٤ علاءالدین سجادي، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٧.

١١٥ محمد عبدوللا کاکە سوور، ڕۆڵی سیاسی و کەلتوری ئەفسەرانی کورد لەبزاڤی کوردایەتی کوردستانی باشووردا (١٩٢١ـ١٩٤٥)، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٠، ل٦٧.

١١٦ کەمال مەزهەر ئەحمەد، چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد، ئامادەکردنی: عبداللە زەنگەنە، بەرگی دووەم، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠١، ل١٠١.

١١٧ نەوشێروان مستەفا ئەمین، سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٥.

١١٨ علاءالدین سجادی، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٩.

١١٩ جەمال بابان، سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٥.

١٢٠ علاءالدین سجادي، سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٥.

١٢١ کەمال مەزهەر ئەحمەد، چەند لاپەڕەیەك...، بەرگی دووەم، ل١٠٢ ؛ ئاکۆ عبدالکریم شوانی، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤٧.

١٢٢ محمد رسول هاوار، شێخ مەحمودی قارەمان...، بەرگی دووەم، ل٧٥٧.

١٢٣ سروه اسعد صابر، کوردستان الجنوبية...، ص١٨٣.

١٢٤ نەوشێروان مستەفا ئەمین، سەرچاوەی پێشووو، ل١٥٠.

١٢٥ محسن محمد المتولي، كرد العراق ( منذ الحرب العلمية الأولى ١٩١٤ – حتى سقوط الملكية في العراق ١٩٥٨ )، الطبعة الأولى، لبنان، ٢٠٠١ ، ص٢١٠.

١٢٦ دیفید مەکداول، مێژوی هاوچەرخی کورد، وەرگێرانی: ئەبوبەکر خۆشناو، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٥، ل٢٩٤ ؛ محمود الدره، المصدر السابق، ص١٥٨–١٥٩.

١٢٧ نەوشێروان مستەفا ئەمین، سەرچاوەی پێشووو، ل١٥٠.

## لیستی سەرچاوەکان

سەرچاوە کوردیەکان :

– ئاکۆ عبدالکریم شوانی، شاری سلێمانی (١٩١٨–١٩٣٢)، لێکۆڵینەوەیکی مێژووی سیاسی، چاپی یەکەم، چاپخانەی زانست، سلێمانی، ٢٠٠٢.

– ئەحمەد تەقی، خەباتی گەلی کورد لەیاداشتەکانی (ئەحمەد تەقی)دا، ڕێکخستن و ئامادەکردنی: جەلال تەقی، چاپخانەی (سلمان الاعظمی) بەغدا، ١٩٧٠.

- ئەکرەمی محمودی صالح ڕەشە، شاری سلێمانی پێداچونەوەی: د.عزالدین مستەفا ڕەسول، بەرگی دووەم، چاپی دووەم، چاپخانەی (دار الحریة) بەغدا، ١٩٨٩.
- ئەحمەد حەمدی بەگی ساحیبقران، دیوانی ئەحمەد حەمدی بەگی ساحیبقران، چاپخانەی ئەسعد، بەغدا، ١٩٥٧.
- ئەحمەد خواجە، چیم دی، بەرگی سێیەم، چاپخانەی ڕاپەڕین، سلێمانی،١٩٧٠.
- جەمال بابان، سلێمانی شارە گەشاوەکەم، بەرگی دووەم، دارالکتب و الوثائق، بەغدا ١٩٩٨.
- دیفید مەکداول، مێژووی هاوچەرخی کورد، وەرگێڕانی: ئەبوبەکر خۆشناو، چاپی دووەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥.
- ڕەشید کریم، بیرەوەری (سی ویەك ساڵ لەژیانی مامۆستایەك)، چاپخانەی ڕاپەڕین، سلێمانی، ١٩٦٠.
- ڕەفیق حیلمی، یادداشت:چاپی سێیەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٣.
- ڕەفیق ساڵح، سێ ڕۆژنامەگەری ڕۆژگاری شێخی نەمر( ١٩٢٣-١٩٢٤)، لێکۆڵینەوەی: د.کەمال فوئادو سەدیق سالح، چاپی یەکەم، چاپخانەی بەدرخان، سلێمانی ، ٢٠٠١.
- شێخ لەتیفی حەفید، یاداشتەکانی شێخ لەتیف، ئامادەکردنی: کەمال نوری مەعروف، چاپی یەکەم، دهۆك، ١٩٩٥.
- عبدالله گۆران، دیوانی گۆران، چاپی سێ یەم، نشر بانیذ، طهران، ١٣٨٦هەتاوی.
- عبدالرحمن قاسملۆ، کوردستان وکورد (لێکۆلینەرەیەکی سیاسی وئابوری)یە، وەرگێڕانی: عبدالله حسن زادە، چاپی دووەم، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠٠٦.
- عەزیز شەمزینی، جولانەوەی ڕزگاری نیشتمانی کوردستان، وەرگێڕانی: فەرید ئەسەسەرد، چاپی سێیەم، سەنتەری لێکۆڵینەوە ستراتیجی کوردستان، سلێمانی، ١٩٩٨.
- علاوالدین سجادی، شۆڕشەکانی کورد وە(کوردو کۆماری عێراق)، ئامادەکردنی: ئەحمەد موحەمەدی، چاپی دووەم، چاپخانەی ئەتلەس، تاران، ٢٠٠٥.
- عەلی سەیدۆ گەورانی، لەعەمانەوە بۆ ئامێدی گەشتێك بەکوردستانی باشوور وەرگێڕانی: تالیب بەرزنجی، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٠.
- فائق بێکەس، دیوانی بێکەس، ئامادەکردنی: محمدی مەلا کریم، چاپخانەی شەفەق، بەغدا،١٩٧٠.
- کەمال مەزهەر ئەحمەد، کوردوکوردستان( لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حکومەتی بەریتانیادا)، ئامادەکردنی: عبدوڵلا زەنگەنە و شەهلا تاهیر حەیدەری، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی گرین گالۆری، لوبنان، ٢٠٠٨.

- کەمال مەزهەر ئەحمەد، چەند لاپەڕەیەك لەمێژووی گەلی کورد، بەرگی یەکەم، بەغدا، ١٩٨٥.
- کەمال مەزهەر ئەحمەد، چەند لاپەڕەیەك لەمێژووی گەلی کورد، بەرگی دووەم، چاپی یەکەم، ئامادەکردنی: عبدالله زەنگەنە، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١.
- کامەران ئەحمەد محمدلمین، کوردستان لەنێوان ململانێی نێودەوڵەتی و ناوچەییدا(١٨٩٠-١٩٣٢)، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٠.
- کریس کۆچیرا، کورد لەسەدەی ١٩ـ ٢٠دا، وەرگێڕانی: حەمەکریم عارف، چاپی سێیەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٦.
- مسعود بارزانی، بارزانی و بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد، وەرگێڕانی: سەعید ناکام، چاپی یەکەم، چاپخانەی خەبات، دهۆك، ١٩٩٨.
- محمد ئەمین زەکی، خولاصەیەکی تاریخی کوردوکوردستان، بەرگی چوارەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٦.
- محمد رسول هاوار، شێخ مەحمودی قارەمان ودەوڵەتەکەی خواروی کوردستان، بەرگی دووەم، جاف پریس، لندن، ١٩٩١.
- محمد رسول هاوار، دیوانی پیرەمێردی نەمر، چاپی یەکەم، چاپخانەی شفان، سلێمانی، ٢٠٠٧.
- محمد عبدوڵلا کاکە سوور، ڕۆڵی سیاسی وکەلتوری ئەفسەرانی کورد لەبزافی کوردایەتی کوردستانی باشووردا (١٩٢١ـ١٩٤٥)، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٠.
- مەلا عبدالله زێوەر، گەنجینەی مەردان و یادداشتی ڕۆژانی دەربەدەری، چاپخانەی (الأديب البغدادي)، بەغدا، ١٩٨٥.
- نەوشیروان مستەفا ئەمین، کوردستانی عێراق، سەردەمی قەلەم ومورواجەعات (١٩٢٨ـ١٩٣١)، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ١٩٩٩.
- واسیلی نیکتین، کوردوکوردستان، وەرگێڕانی: خالیدی حسامی(هێدی)، هەولێر،١٩٩٨.
- ولید حمدی، کوردوکوردستان لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیادا(لێکۆلینەوەیەکی مێژوویی بەڵگەییە)، وەرگێڕانی: محمد نوری توفیق، چاپی دووەم، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، سلێمانی، ١٩٩٩.

سەرچاوە عەرەبیەکان :

- أيوب بارزاني، المقاومة الكردية للاحتلال (١٩١٤- ١٩٥٨ )، الجزء الأول، دار نشر حقائق المشرق، فرنسا، ٢٠٠٣.

- جلال الطالباني، كردستان و الحركة القومية الكردية، الطبعة الثانية، دار الطليعة للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٧١.

- جي كليبرت براوان، قوات الليفي العراقية(١٩١٥-١٩٣٢)، ترجمة، مؤيد ابراهيم الونداوي، مطبعة شفان، السليمانية، ٢٠٠٦.

- جرجيس فتح الله، يقظة الكرد(تأريخ سياسي ١٩٠٠-١٩٢٥)، دار ئاراس للطباعة والنشر، أربيل، ٢٠٠٢.

- ستيفن همسلي لونكريك، العراق الحديث من سنة ١٩٠٠ الى سنة ١٩٥٠، ترجمة: سليم طه التكريتي، الجزء الأول، الطبعة الأولى، مطبعة حسام، بغداد، ١٩٨٨.

- سروه أسعد صابر، كوردستان من البداية الحرب العالمية الأولى الى نهاية مشكلة الموصل، (١٩١٤-١٩٢٦ ) دراسة تأريخية سياسية و ثائقية، الطبعة الأولى، مؤسسة موكرياني للطباعة والنشر، أربيل ٢٠٠١.

- سروه أسعد صابر، كوردستان الجنوبية (١٩٢٦-١٩٣٩) الطبعة الأولى، من منشورات دار سردم للطباعة والنشر، السليمانية، ٢٠٠٦.

- عبدالرزاق الحسني، العراق في دوري الاحتلال و الانتداب، الجزء الأول، مطبعة العرفان بصيدا، سورية، ١٩٣٥.

- عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، الجزء الثالث، الطبعة السابعة، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، ١٩٨٨.

- عبدالرحمن ادريس صالح، الشيخ محمود الحفيد البرزنجي (والنفوذ البريطاني فى كردستان العراق حتى عام ١٩٢٥)، الطبعة الثانية، مطبعة شفان، السليمانية، ٢٠٠٧.

- عبدالفتاح على يحيى البوتاني، وثائق عن الحركة القومية الكردية التحررية (ملاحظات تأريخية ودراسات أولية)، الطبعة الأولى، مطبعة وزارة التربية، أربيل، ٢٠٠١.

- عزيز الحاج، القچيه الكردية في العشرينات، الطبعة الثانية، مطبعة الانتصار، بغداد، ١٩٨٥.

- علاء جاسم محمد، جعفر الغسكري و دوره السياسي والعسكري في تأريخ العراق حتى عام ١٩٣٦، الطبعة الأولى، مكتبة اليقظة العربية، بغداد، ١٩٨٧.

- فؤاد عارف، مؤكرات فؤاد عارف، تقديم و تعليق: كمال مظهر أحمد، مطبعة خبات، الجزء الأول، الطبعة الأولى، دهوك، ١٩٩٩ .

- فاضل حسين، مشكله الموصل، بغداد، الطبعة الأولى، مطبعة أسعد، بغداد، ١٩٥٥.
- كمال مظهر أحمد، كردستان في سنوات الحرب العالمية الأولي، ترجمة: محمد الملا عبدالكريم، الطبعة الثانية، دار آفاق عربية للطباعة والنشر، بغداد، ١٩٨٤.
- محسن محمد المتولى، كرد العراق ( منذ الحرب العلمية الأولى ١٩١٤ – حتى سقوط الملكية في العراق ١٩٥٨ )، الطبعة الأولى، دار موسوعات العربية، لبنان، ٢٠٠١.
- محمد مظفر الأدهمى، المجلس التأسيسي العراقي، الجزء الثاني، الطبعة الثانية، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، ١٩٨٩.
- محمود الدرة، القچيه الكردية، الطبعة الثانية، منشورات دار الطليعة، بيروت، ١٩٦٦.
- مس بيل، فصول من تأريخ العراق القريب، ترجمة: جعفر الخياط، بيروت، ١٩٧١.
- هيوا حميد شريف، توفيق وهبي (١٨٩١ –١٩٨٤) حياته و دوره السياسي و الثقافي، مطبعة شفان، السليمانية، ٢٠٠٦.

رۆژنامە و گۆڤارەکان :

- ژیان، ژمارە (٢٥٨)، سلێمانی، ٢٨ی ئابی ١٩٣٠.
- ژیان، ژمارە (٢٦٠)، سلێمانی، ٢٢ی ئەیلولی ١٩٣٠.

ووتار و لێکۆڵینەوەکان :

- سدیق سالح–کامیل حەسەن، لاپەرەیەکی ون، گۆڤاری (هەزارمێرد)، ژمارە (٨)،١٩٩٩.
- کەمال مەزهەر ئەحمەد، کورد لە دروشمی رژێمی پاشایەتیدا، گۆڤاری ( رەنگین)، ژمارە (١١٠)، ١٩٩٨.
- میرزا محمد ئەمین مەنگوری، کوشتاری ٦ی ئەیلولی ساڵی١٩٣٠، هەفتەنامەی (سلێمانی نوی)، ژمارە (٢)، ٢٠٠٢.
- مستەفا صالح کریم، یادی ٦٢ ساڵەی راپەرینی ٦ی ئەیلولی ١٩٣٠، رۆژنامەی (کوردستانی نویَ)، ژمارە (١٨٤)، یەك شەممە ٦ی ئەیلولی ١٩٩٢.

# گەشەکردنی بزوتنەوەی نیشتمانی لە ئێران لە ساڵی ١٨٩٠- ١٩٥٣

ن: حەربی محەمەد
و: د. محەمەد عەبدوڵا کاکە سور

بەشی دووەم

لە ساڵی دواتریشدا بەرەو باشوور چوو کاتێك کە ڕاوەدووی هۆزە ناسراوەکانی نا وەکو لوڕ و بەختیاری و قەشقای، کە ناخۆشی زۆریان بۆ نابووەوە. لەدوای ئەوەی جولانەوەی ئەم هۆزانەشی دامرکاندەوە، ئاوڕی لە پیلانگێڕان دژی شێخ خەزعەل محەمەرە دایەوەکە لەو کاتەدا ناوچەیەکی پاراستنی بوتیانی بوو، ئەوە و شێخ خەزعەل بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ گفتوگۆی لەگەڵ کۆمپانیای پترۆل ئەنگلۆ- فارسی کردبوو سەبارەت بە هەندێ کاروبار کە لە ئەنجامی دامەزراندنی پالاوگەیەك لە عەبادان دروست بووبوو[11]. ڕەزاخان نەیتوانی بەهێز دەست بەسەر عەرەبستاندا بگرێت بەڵکو ئەم کارەی لەڕێگای فرت و فێڵ و ڕێکەوتن لەگەڵ بەریتانیای ئیسایعماریدا ئەنجامدا، لەدوای ئەو گەشەکردنانە دوای شەڕی یەکەمی جیهانی ڕوویاندا، بەریتانیا بیری لەوە کردەوە کە گۆڕانی بنەڕەتی لە سیاسەتی لە کەنداوی عەرەبی بەگشتی ولە عێراق و عەرەبستان بەتایبەتی ئەنجام بدات.. و ڕەزا خان وەزیری بەرگری بوو لە حکومەتی ئەحمەد قاجاری و لەڕێگای باڵیۆزی بەریتانی لە تاران برسی لوین، خۆی لە حکومەتی بەریتانی هەڵدەسووی، ئەمەش بە مەبەستی لابردنی بەهێزترین میری عەرەبی لەناوچەی پترۆلی عەرەبی- عەرەبستان- وەکو تۆڵە سەندنەوەیەکیشی لەو میرە کە لە پێشتردا و لە ساڵی ١٩١٦ تووشی ناشیرینترین شکست بووبوو، لەسەر دەستی ئەو عەرەبانەی کە دژی هێرشی لە ناکاوی ئێرانی بۆ سەر وڵاتەکەیان بەخۆ کەوتبوون. لەدوای ئەوەی ڕەزاخان بێ ئومێد بوو لەوەی کە بەهێز عەرەبستان داگیربکات پەنای بردە بەر فرت و فێڵ و سێخ خەزعەلی فڕاند ، لەدوای ئەوەش هێزەکانی فارس هاتن و ناوچەی عەرەبیان داگیر کردن کردەوەی کۆمەڵکوژی دژی هەموو عەرەب لەناوبردنی بەرگرییە پاڵەوانیەکەیان پەیڕەو کرد.

لەدوای ئەوەی ڕەزاخان ئەو ئامانجەی بەدەستهێنا کە بۆ چەسپاندنی حوکمەکەی ودەسەلاتی بەسەر وڵاتدا، ڕووی کردە لەناوبردنی خێزانی فەرمانڕەوای قاجاری: "لەدوای ئەوەی ڕەزاخان دەسەلاتی بۆ تەختەکەی گەڕاندەوە بڕیاریدا کە قاجارییەکان لێ بدات، و تەخت بۆ خۆی بهێڵێتەوە، و خێزانێکی فەرمانڕەوای نوێ دابمەزرێنێ. لەساڵی ١٩٢٥ ئەحمەد شای دوا فەرمانڕەوا لە خێزانیقاجاری لەسەر کار لابردرا، ئەوەی کە لە ساڵی ١٩٠٩ لە تەمەنی ١٣ ساڵی هاتە سەرتەخت، کاتێك کە محەمەد عەلی شای باوکی لەسەر کار لابردرا، ئەوەی کە دەسەلاتی کەسی خۆی پەیڕەو نەکرد، ئەوەبوو کە لە دوو ساڵی دوایی لە ئەورووپا دەژی –ئەمەش لە ئەنجامی هەموارکردنێکی سادە لە دەستوور، لەدایکبوونی خێزانی پەهلەوی فەرمانڕەوا ڕاگەیەندرا، و ڕەزا پەهلەوی بە شاهنشا دانرا"[12].

ڕەزا شاکاری کرد بۆ نەهێشتنی هەموو شتێك کە لە بەردەمی بوەستایایە، بەو شێوەیەکەی کە خزمەتی بەرژەوەندی ئەوی دەکرد دەستووری بەکاردەهێنا، و تەنها بۆ دامەزراندنی خێزانی پەهلەوی هەموارکردنی لە دەستووردا ئەنجامدا، و دیکتاتۆریەتی خۆی بە ئاگر و ئاسن چەسپاند، بۆ جێبەجێ کردنی پلانەکانی مەرسومی دەرنەدەکرد، تاکو ئەو هەلە بۆ دوژمنەکانی فەراهەم نەکات کە بە دەسەلاتی دیکتاتۆری تۆمەتباری بکەن، بەڵکو لەپشت پەردەوە ئەنجومەنی هاندەدا بۆ جێبەجێ کردنی ئارەزووەکانی، بەخودی خۆی ئەندامەکانی ئەنجومەنی هەڵدەبژارد و بەسەر پاڵاوتنی دەسەپاند. لەدوای پتەوکردنی دەسەلاتی سەربازی، شا هەڵسا بە لەناوبردن میرە قاجارییەکان و لایەنگرەکانیان، و دەسەلاتەکانی تایفەی ئاینی شیعەی دەستنیشان کرد، ئەو تایفەی تاڕادەیەکی زۆر لایەنگیری بزوتنەوەی دەستووریان کردبوو؛ و ئەوانەی کە لە ماوەی پازدە ساڵی سەرەتای سەدەی بیستەمەوە قەڵەمڕەویانزیاتر بوو، و دژایەتی ئەو سیاسەتەیان دەکرد کە ڕەزا شا پەیڕەوی دەکرد، بەتایبەتیش ئەو ڕێوڕەسمانەی کە بۆ سەپاندنی داب و نەریتە ڕۆژئاواییەکان گرتیە بەر، ئەوەی کە کەمال ئەتاتورك پێش ئەو کردبووی. ڕەزا شا سەرسام بوو بە کەمال ئەتاتورك هەروەها بەو میسالیەتە ڕۆژئاواییانەی لەو کاتەدا جیهانی تەنیبووەوە، گرنگی نەدەدا بە لەنابردنی هەرکەسێك ئەگەر هەستی بە مەترسی ئەو بکردایە. ڕەزا شا دار و دەستەیەکی زۆری لە دەوروبەری خۆی کۆکردبۆوە کە پشتگیریان لێ دەکرد، سێ لە کەسایەتیە هەرە ناودارەکان کە لە ناوەوە و دەرەوەی وڵات ناسرابوون فیرۆز میرزا (نەسرەت ئەلدەولە)، و عەلی ئەکبەر دافار، و عەبدولحوزسەین تیمورتاش، ئەمانەش تموحیان هەبوو، و خاوەن زیرەکی و ڕۆشنبیرییەکی ەرزیش بوون. فیرۆز میرزا لەدوا ئەنجومەنی وەزیرانی ڕەزا خان وەزیری داد بوو، لەدوای ئەوەش لە سیازدەی شوباتی ساڵی ١٩٢٧ تاوەکو گیرانی لە شازدەی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٩ بووە وەزیری داد. هەرچی عەلی ئەکبەر دافارە ئەوە لە یەك وەزارەتدا وەکو وەزیری

کشتوکاڵ و بازرگانی و کاروباری گشتی کاری کردووە، ئینجا بووە وەزیری داد لە سیازدەی شوباتی ساڵی ١٩٢٧ تاوەکو چواری ئەیلولی ١٩٣٣، ئینجا کرایە وەزیری دارایی و لەو پایەدا مایەوە تاکو دەی شوباتی ١٩٣٦ کاتێك کە خۆی کوشت. کاتێك ڕەزا شا هەستی بە مەترسی ئەم سێ کەسایەتیە کرد، کاریکرد بۆ لەناوبردنیانبە هەموو شێوەیەك. ئەوەبوو هەریەکە لە فیرۆز میرزا و عەبدولحوسەین تەیمورتاشی بە تۆمەتی بەرتیل وەرگرتن گرتن و لە سێدارەی دان، هەرچی سێیەمیانە، ئەوەی خۆی کوشت، هەموو بەڵگەکانیش ئاماژە بەوە دەکەن کە ڕەزا شا ئەم کردەوەیەی ڕێك خستبوو. لەو ماوەیەی کە ڕەزا شا تیایدا سەریهەڵدا لە ساڵانی ١٩٢١– ١٩٤١ دەیەها بەڵکو سەدەها کەسایەتی بەدیارکەوتوو لە ئێران کوژرا، ئەمەش بە یەکێك لەو سیمایانە دادەنرێ کە مێژووی ئێران لەو ماوەیەدا لە فەرمانڕەوایی کردن هەیبووە.

## پاری سێیەم

## کۆمپانیای ئەنگلۆ– ئەمریکی

ڕەزا شا بە پلەی یەکەم کاری دەکرد لەپێناو لەناوبردنی بزوتنەوەی نیشتمانی ئێرانی، ئەوەی کە دژایەتی دکتاتۆریەتی خۆ سەپێنەر و هاتنەوە ناوەوەی سەرمایە وکۆمپانیا بێگانەکانی دەکرد، بەتایبەتی ئیستیغلال کردنی پەترۆڵ لەلایەن کۆمپانیای پەترۆڵی ئینگلیزی– فارسی. ئێمە ناکرێت پەرەسەندنی هۆشیاری جەماوەری و پێکهێنانی ڕشێکخراوە پارتایەتیەکان دابڕین لەو ڕووداوانەی کە لە ئەنجامی ئیستیغلال کردنی قێزەون لەلایەن کۆمپانیای ئەنگلۆ– فارسی گەڵاڵە بوون، ئەو کۆمپانیای لە ساڵی ١٩٠٩دامەزرا، دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٠٨ پترۆڵ بە بیری بازرگانی دۆزرابووەوە، وەکو زانراوە ئێران بەشداری شەڕی یەکەمی جیهانی نەکرد، ئەوەو دوای تێکدانی بۆرییەکانی پترۆڵ لە هەندێ ناوچە لەسەر دەستی هەندێ هۆزی ئێرانیدژی بەریتانیا پەیوەندییەکانی نێوان حکومەتی ئێرانی و کۆمپانیای ئەنگلۆ– فارسی بەرەو گرژی چوو، کۆمپانیاکەش بەوە ڕازی نەبوو کە وەکو لە عەقدی جیاوکەکەدا هاتبوو بە قەزییەی تەحکیمکردنی لەکێشەکە ڕازی بێت، ئینگلتەرا و ڕوسیا هەلی شەڕیانقۆستەوە لەنێوان خۆیاندا و لەسەر حسابی گەلانی ئێرانی ڕێککەوتن، ڕوسیا تەزاری ئازادی کارکردنی لە ناوچەکانی باکور لە ئێران بەدەست هێنا، لەکاتێکدا کە بەریتانیا ئەم مافەی لەناوچەی ناوەڕاستی بێ لایەن و بەشی باشوور لە وڵات بەدەست هێنا، بێگومان ئەو ڕێکەوتنەش نهێنی بوو، لەدوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەری سۆشیالیست لە ڕوسیا و لەناوبردنی تەواوی قزارییەت لە ساڵی ١٩١٧ شۆڕش دەقەکانی ڕێکەوتننامەی نهێنی بەستراوی نێوان حکومەتی تزاری و بەریتانیا ڕاگەیاند، ئەوە و توڕبوونی گەلانی ئێران و بێزارییان لەسەر بەریتانیا و کۆمپانیا پرۆتۆکۆلیەکەی زیادی کرد،

بەم شێوەیەش پەیوەندی نێوان هەردوو لایەنەکە خراپتر بوو. کاتێکیش کە شەڕ تەواوبوو ئێران داوای کرد کە نوێنەرایەتی لە کۆنگرەی ئاشتیدا هەبێ، و لەلایەن خۆیەوە شاندێکی ناردی پاریس بۆئەوەی مەسەلەی ئێران بخاتە بەردەم دەوڵەتە سەرکەوتووەکان، بەریتانیا ڕازی نەبوو بەوەی کە شاندە ئێرانیەکە ئامادەی کۆنگرەکە بێت بەو بیانووەی کە کۆنگرەکە ئەو دەوڵەتانە بەخۆ دەگرێت کە بە ڕاستی بەشداری شەڕیان کردووە، هەروەها پێی وابوو کە ئایندەی ئێران تەنها پەیوەندی بە بەریتانیاوە هەیە..! ئەم کارەش لەلایەن ئینگلیزەکانەوە شوێنەواری خراپی هەبوو، ئەوەبوو ئێرانیەکان بێزابوون لەم هەڵوێستە بەرامبەر بە شاندەکەیان، ئەم هەڵوێستەش هەستپێکردنی سووکایەتی پێکردن و بەکەم زانینی تێدایە. لەم کاتەشدا ئینگلتەرا وەزیرێکی ڕێپێدراوی لە کەسایەتی هنری کۆکس بۆ تاران نارد، ئەمەش لە لێهاتووترین دیبلۆماسییە فێڵبازە خاوەن ئەزموونە فراوانەکانە ە کاروباری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، و بەتەواوی لەلایەن لۆرد کۆرزۆن پشتگیری لێدەکرا. گفتوگۆ لنێوان کۆکس و حکومەتی تاران ئەنجام درا، و نۆ مانگی خایاندا، لە کۆتاییشدا هەردوو لایەنەکە لە ٩ی ئابی ١٩١٩ گەیشتنە ڕێکەوتننامەیەك کە گرنگترین خاڵەکانی ئەمانە بوون:

١- دان نان بە سەربەخۆیی ئێران و پاراستنی خاکەکەی.

٢- حکومەتی بەریتانیا ئەو ڕاوێژکارانە پێشکەش دەکات کە حکومەتی ئێرانی داوایان دەکات.

٣- ئینگلتەرائەو ئەفسەر و کەل و پەل و تەقەمەنیانەی سەبارەت بە ڕێکخستنی سوپا پێشکەش بە ئێراندەکات

٤- دانی قەرزێك بە بڕی دوو ملیۆن جونەیە وبە سووی ٧٪ بە ئێران بۆ ماوەی بیست ساڵ، بۆبارمەتیدانی لە تەرخانکردنی پارە بۆ پرۆژە چاکسازییەکان کە لە مادەی دووەم و سێیەمی ڕێکەوتننامەکەدا هاتبوو.

٥- هاوکاری کردنی هاوبەش لە پەرەپێدانی بازرگانی ونەهێشتنی برسیەتی ئەمەش بە بەشداریکردن لەو پرۆژانەی دەبنە مایەی بەدیهێنانی ئەوئامانجانە، وەکو دامەزراندنی هێڵی ئاسنین و هۆکارەکانی گواستنەوەی تر.

٦- ڕێکەوتنی هەردوو حکومەتەکە لەسەر پێکهێنانی لیژنەیەکی هاوبەش بۆ پشکنین و دووبارە سەیرکردنەوەی گومرگ بەمەبەستی چاککردنی بەشێوەیەك کە ببێتە مایەی دەستەبەرکردنی بەرژەوەندی مەشروعی وڵات و پترکردنی خۆشگوزەرانی[١٢].

ئەم ڕێکەوتنە ماف پێشێلکەرە کردانەوەیەکی توندی لەلای جەماوەر وهێزە نیشتمانیەکان وروژاند. ئەوەبوو ئێرانیکردە پارێزگارکراوێکی بەریتانی، ئەوەبوو وەکو لە بەندەکانی ڕێکەوتننامەکە بەدیاردەکەوێت بەریتانیا مافی دانانی ڕاوێژکارەکانی لە هەموو فەرمانگە و وەزارەتەکان لەئێران و بەدەستڕۆیشتنی فراوانەوە

دبەدەستهێنا. لەدوای ئەمەش نێردەیەکی دارایی بەریتانیا بە سەرۆکایەتی ی. سمس کە پایەی چاودێری دارایی گشتی ئێرانی هەبوو، گەیشت، ئینجا لەدوای فشار لەسەر ئێران ئینگلیز بانکی ڕۆژهەڵاتی و کۆمپانیای پەترۆڵی باکوریان پێك هێنا. بەم شێوەیەش ئینگلیز کۆنترۆڵێکی تەواویان بەسەر بازاڕی ئێراندا پەیدا کرد، و پتر ئێران بۆ کۆلۆنیەکی بەریتانی گۆڕدرا.

گەچی کەشەکردنی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی نیشتمانی بەتایبەتی لە باکور هەوڵی کردنی ئێرانی بە کۆلۆنیەکی بەریتانی شکست پێهێنا. ئەوەبوو لەماوەی ساڵی ١٩٢٠ لە شاری تەورێز کە شاری سەرەکیە لە ئازەربایجانی ئێران دەستکرا بە ڕاپەڕینە دیموکراتیە ئازەربایجانیەکان بەسەرکردایەتی محەمەد خیابانی دەستی پێکرد، ئەوەی کە بە توندی دژلیەتی خۆی بۆ چەوساندنەوەی ئێرانیەکان لەلایەن ئینگلیزەوە ڕاگەیاند، ئەوەولە ئەنجامی وەستانی کۆمپانیاکە لە دانی ئەو ئەرکە داراییە کەمانەش کە لەسەری بوو، بارودۆخیئابووری لە سەرانسەری ئێران لە ساڵێ ١٩١٩دا خراپتر بوو. لە ساڵێ ١٩٢٢ کرێکارانی ئێرانی لە کۆمپانیاکەمانیان گرت، و کرێکارانی هیندیش لە کۆمپانیاکە پشتگیریان کرد، داوای زیادکردنی سەداسەدی کرێکانیان دەکرد. ئەوە وهێزەکانی بەریتانیا دەستیان لە بارودۆخەکە وەردا و زۆر لە سەرکردەکانیمانگرتنەکەی گرت، و ٢٠٠٠ فەرمانبەری هیندی لە کار دەرکرد. کۆمپانیاکەش وەکو ڕازیکردنێکی کرێکارە مانگرتووەکان بەوە ڕازی بوو کە کرێکان بە ڕادەی ٧٥٪ زیاد بکات. وەکو لە پێشتریش ووتمان پەشێوی لە وڵاتدا بڵاو بوو، ڕەزاخانیش بارودۆخەکەی قۆستەو و سەرکردایەتی کودەتاکەی کرد.

ساڵی نوێ ساڵی یەکەمینەکانی فەرمانڕەواییەکەی بۆ سەپاندنی دەسەڵاتە مەرکەزییەکەی بەسەر هەموو بەشەکانی وڵات، و گۆڕینی بۆ وڵاتێکی یەکگرتووی بەهێز تەرخان کرد، بەرنامە چاکسازییەکەش لێکچووبوو لەگەڵ بەرنامەی کەمال ئەتاتورك لە تورکیا وەکو لە پێشتریش ئاماژەمان پێدا. ڕەزاشا ناچار بوو لەژێر فشاری بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی نیشتمانی ئێرانی سەرووتر بوو، ژمارەی ڕاوێژکارە بێگانەکان بەتایبەتی بەریتانیەکان لە سەنتەرەکانی دەسەڵات کەم بکاتەوە، ئەمەش یەکەمین بەرکەوتن بوو لەنێوان شای نوێ و بەریتانیادا، وەکو زانراویشە کە شای نوێ هەوڵیدەدا کە متمانەی گەل و پشتگیریکردنی بدەست بهێنێت دوایئەوەی کە شایەکانی پێشووتر ئەم شتەیان لەدەستدابوو. کەچی ئەو پێکدادانە ڕاستیەی کە لەنێوان شا و بەرژەوەندییە بەریتانیەکاندا ڕوویدا لە بواری پەترۆڵ بوو، و لە ساڵێ ١٩٢٥دا شا سەردانی دام و دەزگاکانی کۆمپانیاکەی لە باشووری ئێراندا کرد، و داواکارییەکانی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی ئێرانی گرتەبەر کە ئەمانە بوون:

- کۆمپانیاکە ژمارەیەکی زۆر لە هاوڵاتیانی بێگانەی بەکار دەهێنا، ئەوەبوو لە کۆی (٢٩) هەزار فەرمانبەر و کرێکار بێگانەکان ژمارەیان گەیشتە شەش هەزار فەرمانبەر.

- کۆمپانیاکە هیچ کۆششێکی نەکرد بۆ مەشق پێکردنی ئێرانیەکان بۆ پڕکردنەوەی پایە هەستیارەکان.
- فەرمانبەر ە بەریتانیەکان لە کۆمپانیاکەدا جیاوکی تایبەتیان هەبوو، لە کاتێکدا فەرمانبەر و کرێکارانی ئێرانی لێی بێ بەشکرابوون.
- سەرەڕای بوونی پیشەسازی قەبەی پەترۆڵی لە ناوچەکەدا، ئەوە هەرگیز کۆمپانیاکە هەوڵی نەدا لە ڕووی ئاوەدانکردنەوەوە ناوچەکە پەرەپێبدا.
- لەڕێگای کرێکار و فەرمانبەرە ئێرانیە نیشتمانپەروەرەکان بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی نیشتمانی چەندین دەکۆمێنتی ئاشکرا کرد کە دەستێوەردنی کۆمپانیاکە و فەرمانبەرە بەریتانیەکانی لە کاروباری وڵات و دژی بەرژەوەندی وڵات دەسەلماند.
- سەرەڕای ئەو قازانجە قەبانەی کە کۆمپانیاکە بەدەستی دەهێنێ لەڕێگای ئیستیغلال کردنی سامانی پەترۆڵی کەچی وڵات تەنها کەمێك لەم قازانجە بەدەست دەهێنێت.

لەکۆتایی ساڵی ١٩٢٨ گفتوگۆیەکی نوێ لەنێوان کۆمپانیاکە و حکومەتی ئێرانی دەستی پێکردن، وەکو دابی کۆمپانیا مۆنۆپۆلۆکانیش لە جیهاندا بەبەردەوامی فرت و فیڵی دەکرد و خۆی لە مافەکانی گەل دەدزییەوە، گفتوگۆیەکەش هیچ ئەنجامێکی نەبوو، بزوتنەوەی جەماوەری دژ بە کارەکانی کۆمپاکە فراوان بوو و حکومەتی ئێرانی ناچار بوو کە بڕیارەکانی ساڵی ١٩٣٢ دەربکا، کە دەبوایە بە گوێرەی بڕیارەکە ئەو جیاوکە پترۆڵیە هەڵبوەشێنێتەوە کە لە ساڵی ١٩٠١ بە کۆمپانیاکە درابوو، لە وتاری وەزیری دارایی ئێرانی بۆ نوێنەری کۆمپانیاکە ئەمەی خوارەوە هاتبوو:

"میللەتی ئێرانی وایدەبینێ کە ئەو جیاوکەی بە کۆمپانیاکە دراوە ئێستا ئەو ماف و بەرژەوەندییە مەشروعانە بۆ ئێران بەدی نەهێنێت، و حکومەتی ئێران خۆی بە ناچار نازانێ کە پابەندی ڕێکەوتننامەیەك بێت کە لە ژێر سایەی بارودۆخی ڕۆژانی خێزانی قاجاری لەسەر تەخت لابراو بەسترابوو، لەکاتێکدا هێشتا ڕژێمی سیاسی ئێستا لە وڵاتدا نەبوو. کۆمپانیاکە ڕێگای بە حکومەت نەدا کە دەفتەر و حساباتی کۆمپانیاکە بپشکنێ و بە سەریاندا بچێتەوە، ئەودەفتەر و حساباتانەی کە حکومەتی ئێرانی پێی وایە ڕاست نین، و بەشێ،یەکئامادە کراون کە قازانجە ڕاستەقینەکان بشارنەوە و پشکی حکومەت کەم بکاتەوە، کۆمپانیاکە هیچ بەشێك لەو قازانجانەی لە دەرەوەی ئێران بە دەستی دەهێنێ لە کارەکانی لە کارەکانی بونیاتنراوی لەسەر پترۆڵی ئێرانی بەتایبەتی کردەوەکانی گواستنەوە بە بارهەڵگرەکان، نەداوە بە حکومەتی ئێرانی، بەدەستهێنانی زۆربەی پشکەکانی کومپانیاکە لە لایەن حکومەتی بەریتانی بریتی بوو لە گواستنەوەی موڵکیەتی کۆمپانیاکە بەبێ ڕازیبوونی حکومەتی ئێرانی، هەروەکو لە ڕێکەوتننامەی جیاوکەکەدا هاتبوو،

هەروەها ناکرێت ڕازی بن لەسەر ئەوەی کە کۆمپانیاکە پێی هەڵدەستێت لەوەی کە باجی زۆر دەدات بە حکومەتی بەریتانی سەبارەت بە کردەوەکانی پەیوەست بە پەرۆڵی ئێرانی لەو کاتەی کە حکومەتی ئێرانی هیچ باجی لێوە دەست ناکەوێت، کۆمپانیاکەش بەوە هەڵنەستاوە کە ژمارەی پێویست لە ئێرانیەکان لە وەزیفە هونەرییەکان و گەورەکان لە کۆمپانیاکە دایمەزرێنێ بەمەش کۆمپانیاکە ئەرکی خۆی لە گەشەپێدانی جیاوکەکە وەکو پێویست بەجێ نەهێناوە. لەبەر هەموو ئەمانە حکومەت بڕیاریدا کە ڕێکەتننامەی جیاوکەکە هەڵبوەشتێنێتەوە، بەڵام ئامادەی خۆی پیشاندا بەستنی ڕێکەوتننامەیەکی نوێ لەسەر بنەمای ڕەزامەندی هەردوو لا و دادوەرانە"[١٤].

بابەتی ناکۆکیەکە لە کۆمەڵەی گەلاندا خرایە بەردەم گفتوگۆ، لە بیست و نۆی مانگی نیسانی ١٩٣٣ ڕێکەوتننامەی جیاوکێکی نوێ بەسترا کە ماوەی جیاوکی تاکو ١٩٩٣ دەستنیشان کرد، واتە ماوەی جیاوکی نوێ (٣٢) ساڵ پتر بوو، و کۆمپانیای ئەنگلۆ- فارسی مافی خۆی لە وەبەرهێنانی پترۆڵ لە ڕووبەرێکی گەورەدا پاراست، مافی کڕینی زەوی و دامەزراندنی هێڵی ئاسنی و بوندەری نوێ وهێڵەکانی تەلەفۆن و تەلەگراف و فرۆکەخانەکان و ئێزگەی ڕادیۆی بەدەست هێنا. هەروەها ئەو مافەی هەبوو کە پۆلیسی تایبەتی خۆی قوتابخانەی شتی تری هەبێت، ئەم ڕێکەوتننامە نوێیە لەوەی پێشووتری هەڵ،ەشاوە باشتر نەبوو، و هەندێ لە نوسەران وایدەبینن "کە ئەم ڕێکەوتننامە نوێیە سەبارەت بە ئێران لە رشێکەوتننامەکەی پێشووتر باشترە، ئەمەش لە چەند لایەکەوە: ئەوەبوو ڕووبەری جیاوکەکەی بۆ نیوەی ڕووبەری جیاوکەکەی پێشوو کەم کردەوە..."[١٥]. ئینجا دکتۆر عاتف سلێمان دەڵێ "ئەم ڕێکەوتننامە نوێیە هەندێ خاڵی باشتری بۆ ئێران بەدەست هێنا ئەگەر لەگەڵ ڕێکەوتننامە کۆنەکە سەیر بکرێت...".

لە ڕاستیدا وەکو ووتمان نابەرامبەر و نا هەقیانەی سەبارەت بە گەلانی ئێران تێدا بوو، گەلانی ئێران لەوکاتەدا هێرشیانکردە سەری و وەکو خۆی بەدەستەوەدانێکیان بۆ کۆمپانیەکە دانا، ئەمەش سەبارەت بە گەلانی ئێران شتێکی ناکاو بوو لەکاتێکدا کەچاوەڕوانی ڕزگاربوونی کۆتایی لەم کۆمپانیا مۆنۆپۆلیە و خۆسەپاندنیان دەکرد، و وای بینی سەردانەواندنی حکومەتی ئێرانی و ڕازیبوونی لەسەر ڕێکەوتننامەکە هێورکردنەوەی باروودۆخەکە و خیانەت کردنە لە هیوا و ئاواتەکانی. لەوکاتەدا پارتی شیوعی ئێرانی ڕایگەیاند: "ئەو خەباتەی ئێران لەپێناو پە ترۆڵ دەیکات خەباتێکی نیشتمانی پێشمەوتنخوازییە. بەڵام هەندێ بەڵگە هەن ئاماژە بەوە دەکەن کە لە کۆتاییدا حکومەتی ئێرانیخۆی بەدەست ئیستیعمارەوە دەدات. ئامانجی حکومەتی ئێرانی لەم ململانێیە گەڕاندنەوەی سامانە سروشتیەکانی وڵات نیە بۆ خاوەنە سەرعیەکانی، بەڵکو بازرگانی پێکردنە بۆئەوەی هەرچەندە بکرێ بڕێ پارەی زیاتر بەدەست بهێنێت. حکومەتی ئێرانی بەرامبەر

بە پەترۆڵی گەلەکەمان قەڵەمڕەوی زیاتری دەوێ، لە کاتێکدا کە پارتی شیوعی ئێرانی داوای خۆماڵیکردنی سامانە سورشتیەکان دەکات"[16]. لەڕاستیدا لەو کاتەدا حکومەتی ئێرانی و ڕەزاشا حەزیان نەدەکرد ڕووبەڕووی کۆمپانیای ئەنگلۆ- فارسی مۆنۆپۆڵی ببنەوە، لەپێشتریشدا ڕوونمان کردەوە کە ڕەزاشا هەموو ئامرازەکانی گرتەبەر بۆ لەناوبردنی ئەو کەسانەی دژایەتیان دەکرد لەسەر کردە کرێکارییەکان و بزوتنەوەی نیشتمانی ئێرانی.

"ئەو ڕەزاشایەی کە هەوڵیدا خۆی وەکو بەرگریکەرێك لە بەرژەوەندییە نیشتمانیەکان لەم ناکۆکیەدا پیشان بدات، لە جەوهەردا بەتەووی لە بەرژەوەندی ئیستیعماری بەریتانی کاری دەکرد، بەڵگەی ئەمەش تەنها تۆقاندنی خوێناوییانەی دژی دژی هێزە پێشکەوتنخوازەکان لە وڵاتدا نەبوو، بەڵکو تەنانەت حورمەتی ئەو فەرمانبەرە ئێرانیانەشی نەدەگرت کە هەوڵیاندا بەرگری لە بەرژەوەندی ئێران بکەن، و ڕادەیەك دابنێن بۆ قەڵەمڕەوی کۆمپانیاکە وجێگای کارکردنی کەم بکەنەوە. یەکێك لەمانە بە فەرمانی شا گیرا، و ڕەوانەی بەندیخانە کرا، ئەویش وەزیری وڵات تەیمورتاش بوو کە بەرگری لە بەرژەوەندییەکانی ئێران کرد لەو گفتوگۆیانەی لەگەڵ کۆمپانیای پەترۆڵی ئەنگلۆ- فارسی ئەنجام درا، ئەوەبوو داوای پترکردنی پشکی ئێرانی لە قازانجی خاوێنی کۆمپانیاکە کرد.."[17].

شا چەندین ڕێ و ڕەسمی گرتە بەر بە مەبەستی واژووکردن لەسەر ڕێکەوتننامەکە، لەوە دەترسا کە ڕێکەوتننامەکە بخاتە بەردەم ئەنجومەنی نوێنەرانی هەڵبژێردراو، ئەو ئەنجومەنەی هەڵوەشاندەوە و ئەنجومەنێکی نوێی هێنایە گۆڕێ کە خۆی ئەندامەکانی هەڵبژارد، هەروەکو شا دەیویست ئەنجومەنە نوێیەکە ڕێکەوتننامەکەی واژۆ کرد. لە سەرەتای شەڕی دووەمی جیهانیدا شا بێ لایەنی خۆی ڕاگەیاند، لەڕاستیشدا ئەم بێ لایەنە تەنها چاوەڕوانکردن بوو ئەوەبوو کە پێشبینی ئەوەی نەدەکرد کە قەڵەمڕەوی ئەڵمانی هیتلەری لە جیهاندا سەرکەوێت، بەم شێوەیەش عەقدی لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە پسپۆرانی ئەڵمان بەست بۆ بە پیشەسازیکردنی وڵات، هەروەها ئەڵمانیای هیتلەری بووە سەرچاوەیەکی سەرەکی هاوردەکردنی ئامێر و کەل و پەل. لە هەردوو ساڵی ١٩٤٠- ١٩٤١، ٤٥٪ بازرگانی ئێرانی دەرەکی لەگەڵ ئەڵمانیادا بوو. کاتێك کە ڕوسیاش هاتە شەڕەکەوە بەهای ستراتیجی ئێران پتر بوو ، ئەوەبوو ئێران تاکە ڕێگای مسۆگەر بوو بۆ گەیاندنی ناردراوەکانی هاوپەیمانان بۆ ڕوسیا، هەر دەشبوایە پارێزگاری لم ڕێگایە بکرایە، هەروەها دەبوایە پارێزگاری بۆ پالاوگەی عەبادان فەراهەم بکرێت ئەوەبوو کە بووبووە تاکە سەرچاوەی سەرەکی بۆ بەنزینی فڕۆکەکان کە بۆ کردەوەکانی هاوپەیمانان لە بەرەی ئاسیاوی پێویست بوو. بەریتانیا و ڕوسیاش داوایان لە شا کرد کە دوو هەزار ئەڵکانی کە لە ئێراندا بوون دەربکات، و سانسۆرێکی پۆلیسیش بخاتە سەر ئەو

قوتابیانەی کە زۆربەیان لە ئەڵمانیا خوێندبوویان. کاتێک شا بەم داواکارییە ڕازی نەبوو، بەریتانیا ئاگادارکردنەوەیەکی کۆتایی ئاراستە کرد، و لە بیست و پێنجی ئابی ١٩٤١ دە هەزار سەربازی بەریتانی لە سنوری عێراقەوە هاتنە ناو خاکی عێراقەوە لەو کاتەی کە هێزەکانی ڕوسی سنووری باکوریان بڕیبوو، بە چەند ڕۆژێك وڵاتەکە داگیرکرا، ڕەزا شا ناچار بوو کە بۆ کوڕەکەی محەمەدە عەلی پەعلەوی دەست لە تەختی ئێران هەڵبگرێت.

## پاری چوارەم

## ڕێکخستنە سیاسیەکان

ئێستا هەر دەبێت چاوێك بەو ڕێکخستنە سیاسیانەدا بخشێنین کە لەو ماوەیەی باسمان لێو گرد لە گۆڕەپانی ئێراندا سەریان هەڵدا. لە سەرەتای سەدەی بیستەم بزوتنەوەی ئاینی سەریانهەڵدا، کە کاریگەری گەورەیان بەسەر جەماوەرەوە و کۆکردنەوەی هاوڵاتیان بۆ داواکردنی دەستوورو ڕادەدانان بۆ دەسەڵاتی شا هەبوو، و لەنێ، ئەو بزوتنەوانەشدا موجتەهیدەکان و مەلایەکان و بزوتنەوەی بابی هەبوو. پرۆفیسۆر بروان دەڵێ: "جیاوازی ڕاستەقینە لەنێوان زاناکانی سونە و شیعە لە چەمکی بنەمای ئیجتیهاد یان دۆزینەوە یان ڕاگەیاندنی لە دایکبوونی ڕاستەقینە ئاینە نوێیەکانە کە لەسەر زانینی تەواوی نووسینەکان و نەریتەکان وەستاوە، و لەڕێگای کۆشش و هەوڵدانی بەرژەوەندی دەکرێ پێی بگەی.." ئەو جۆرە کەسەی ئەم ئامانجە بەدەست دەهێنێت پێی دەوترێت موجتەهید لەکاتێکدا لەکاتێکدا شتی ئاوەها لەناو زاناکانی سونەدا نیە. ئەو سەرکەوتنەی موجتەهیدەکان بەدەستیان هێنا لە دژایەتی کردنی هەستانی ناسرەدین شا بە بەخشینیجیاوکی مۆنپۆلکردنی توتن بەیەکێك لە کۆمپانیا ئینگلیزییەکان، هەروەها ماندەر بوو لەسەر توندڕەوی ئەو کەسەی لەدوای ئەو هات. هەرچی بزوتنەوەی بابییە ئەوە دامەزرێنە ـەکەی سەید عەلی لەدایکبووی ساڵی ١٨١٩ی شیرازە. لە کەربەلا خوێندوویەتی، لە بیست و چوار ساڵی خۆی بە باب داناوە واتە ئەو دەرگایەی دەکرێ لە ڕێگایەو مرۆڤ ئیمامی دوانزە یان مەهدیبناسێ، ئەوەی لە هەزار ساڵەوە لە چاوان بزربووە. پلانێك ئاشکرا کرا سەبارەت بە کوشتنی وزیری ئەعزەم و سێ لە لایەنگرانی باب لە ساڵێ ١٨٥٢ هەوڵی کوشتنی شایاندا، بەڵام ئەو قوتار بوو. ئەنجامەکەشی سەپاندی تۆقاندن و تیرۆر بوو. ئەوەبوو چوار هەزار کەس لە لایەنگرانی باب کوژران، ئەمەش بەشداریکرد لە پتربوونی ژمارەی ئەوانەی دژایەتی حکومەتیان دەکرد[١٨]. کەچی ئەو بزوتنەو سیاسیەی گرنگی زیاتری هەبوو پەیدابوونی پارتی شیوعی ئێرانی بوو. ئەوەبوو سۆشیالیزمەکان و دیموکراتیەکان بەشداری بزوتنەوەی دەستووریان کرد، کە لە ساڵی ١٩٠٦ بە شۆڕشی دەستوری کۆتایی هات. بزوتنوەی شیوعی ئێرانی لە باکۆ دەستی پێکرد، کاتێك کە لە ساڵی ١٩١٦

پارتی دادگەری سۆشیالیستی دامەزرا ئەوەی کە پەیوەندی سۆشیالیستە دیمەکراتییەکان لە قفقاودا هەبوو. و لەساڵی ١٩٢٠ پارتەکە کۆنگرەیەکی گرێدا و بڕیاری دامەزراندنی پارتی شیوعی ئێرانیدا، و سوڵتان زادە سەرکردایەتی کرد ئەوەی کە بۆماوەیەك لە زەمەن ئەرکی سەرەکیبەشی ڕۆژهەڵاتی نزیکی لە کۆمیسارییەتی کاروبارەی دەرەکی لە حکومەتی یەکێتی سۆڤیەت گرتبووە ئەستۆ، لەئەیلولی هەمان ئاڵیش ئەوحەیدەرخان بە نوێنەرایەتی پارتەکە لە کۆنگرەی ئەلاف ڕۆژهەڵات لە باکۆ هەڵستا. یەکەمین ئەرکی پارتەکە ڕوخاندنی شا و حکومەتەکەی بوو. لە کەناری قەزوینی سەر بەئێران دەستی بە ئەنجامدانی چالاکیەکانی خۆی کرد، بەشداری لە شۆڕشی غیلانی ساڵی ١٩٢٠- ١٩٢١ی کرد. پارتی شیوعی ئێرانە یەکەم تاکە پارتی چینی کرێکار بوو، لە دامەزراندنیدا ئیلهامی لە شۆڕشی ئۆکتۆبەری سۆشیالیست لە ڕوسیا وەرگرتبوو، لەسەر ڕێگای خەباتی چەکداری ڕۆیشت، پارتەکە تەنگی پێ هەڵچنرا کاتێك کە لە ساڵی ١٩٢١ ڕەزا شا هێرشی کردە سەر ناوچە باکورییەکانی ئێران و کەڕاندییەوە سەر دەسەڵاتی مەرکەزی لە تاران. بۆیە ناچار بوو کە بە نهێنی لە ئازربیجان و خراسان کاریکات. سوڵتانزادە باسی لەوە دکردووە کە زۆربەی ئەندامانی پارتەکە بۆ ڕێکخستنی کرێکاران چوونەتە تارانی پایتەخت.

- لە ساڵی ١٩٢٦ پارتی شیوعی ئێرانی و کۆمەڵەی لاوانی شیوعی ئێرانی داوایان لە یەکێتی سۆڤیەت کرد کە دەستێوەردانی سەبازی ئەنجام بدات بۆ پشتگیریکردن و یارمەتیدانی شۆڕشی میللی لە خوراسان.
- لە ساڵی ١٩٢٧ هەردوو پارتی شیوعی ئێرنی و تورکی کۆنگرەیەکیان لە ورمێ (ڕەزائییە) بەست.
- لە ساڵی ١٩٢٨ سوڵتان زادە و شارمتی نوێنەرایەتی پارتی شیوعی ئێرانیان لە کۆنگرەی شەشەمی کومنترن کرد.

پارتەکە ووشی لەڕێلادانی چەپڕەوانە و ڕاستڕەوانە بوو، بەڵام لە کۆنگرەی دووەم کە ساڵی ١٩٢٨ بەسترا توانی بگاتە دەست نیشانکردنێکی زانستی سروشت و ڕەوتی شۆڕشی ئێرانی. کۆنگرەی دووەم بۆ یەکەمجار وەڵامی مەسەلە بنەڕەتیەکانی بزوتنەوەکەی دایەوە:

- حکومەتی ئێرانی حکومەتی خاوەن موڵکە گەورەکانی زەوی و زار و بۆرژوازی گەورەیە و بەکرێگیراوی ئیمپریالیەتی جیهانیە.
- شۆڕشی ئێرانی شۆڕشێکە دژی ئیمپریالیەت و دەرەبەگایەتی و لەژێر سەرکردایەتی چینی کرێکار سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت.
- ناوەخنی سەرەکی شۆڕشی ئێرانی شۆڕشی کشتوکاڵیە و هێزی بنەڕەتی شۆڕش جەماوەری جوتیارانن.
- خەباتی چەکداری ڕێگای ڕووخاندنی فەرمانڕەوایی ئێستا و سەرکەوتنی شۆڕشە.

- یەکگرتنی چینی کرێکار لەگەڵ جەماوەری جوتیاران گرنتی سەرکەوتنی شۆڕشی ئێرانیە[19].

لەساڵی ١٩٢٩ سوڵتان زادە بە سەرکردەی پارت مایەوە کەچی لە ساڵی ١٩٣٠ یەکێك لە سۆشیالیستە روسە هەڵگەڕاوەکان بەناوی جۆرج انا بیکوف زنجیرە وتارێکی لە پاریس بڵاوکردەوە تیایدا هەندێ ڕێکخستنی سیاسی ئاشکرا کرد کە ئاگادریان بووە و کاری تێدا کردوون و لەماوەی ١٩٢٧- ١٩٢٩ لە ئێراندا هەبوون، ڕەزا شاو دار ودەستەکەی هەر زوو کەوتنە ڕاوەدوونانی شیوعیەکان و دیموکراتییەکان دەوروبەری (٣٥٠) هاوڵاتی گیران، ئینجا لەم گرتنە بەردەوام بوون و (١٠٠) هاوڵاتی گیران کە هاوڵاتیەکی گرنگیان لەناودابوو ئەویش عباس میرزا ئەسکەنداری یەکێك لە میرەکانی قاجاری پێشوو بوو.

- لە ساڵی ١٩٣٢ ڕەزاشاتۆمەتی سیخوڕیکردنی بۆ بەرژەوەندی دەوڵەتێکی بێگانەی ئاراستەی (٣٢) هاوڵاتی کرد و بەدەراوتنی پێنجیان کئەوانیتر هەموو تۆمەتەکەیان لەسەر چەسپا. پارتی شیوعی ئێرانی ڕۆژنامەکەی (ئەستێرەی سوور)ی لە شاری (لایبزج) ی ئەڵمانی دەرکرد ئێنجا ڕۆژنامەی (شەپ) و ئینجا ڕۆژنامەی (زیندووبوونەوە)ی دەرکرد.
- لە ساڵی ١٩٣٣ علی عەبدولسەمەد کمباخش گیرا ولە ساڵی ١٩٤١ کاتێك بووە ئەندامی دامەزرێنەری پارتی تودە ئازاد کرا.
- لەساڵی ١٩٣٣ ئەردەشێر نوفاشیان دەرچووی قوتابخانەی لاوانی شیوعی لە مۆسکۆ گەڕایەوە ئێران. کەچی لە ساڵی ١٩٣٤ دەردەستەی شا گرتیان و لەدوای ساڵی ١٩٤٢ بووە ئەندامی لیژنەی مەرکەزی پارتی تودە ئینجا بوو بە بەرشێوەبەری گشتی پڕوپاگەندە لە حکومەتی ئازەربیجان.

ئێشتلا جەختمان لەسەر ئەوە کرد کە ڕەزاشا بە پلەی یەکەم ئامانجی لەناوبردنی بزوتنەوەی نیشتمانی ئێرانی هەبوو کە هەردەم هەڕەشەیان لێدەرکرد، لەئەنجامی ئەو هێرشەش کە بەیارمەتی شارەزابەریتانیەکان ئەنجامیدا توانی پارتی شیوعی ئێرانی لەناو ببات کە لە سییەکان چالاکی لە شانۆی ئێران بزر بوو. بەڵام گروپی دووەم دەرکەوت کە شا و دارو دەستەکەی تووشی دڵەڕاوکێ کرد، ئەمانەش لە ڕۆشنبیرە بۆرژوازییەکان بوون کە بیروباوەڕی مارکسیان هەڵگرتبوو، دەستیان بەوەکرد کە بە شێوەیەکی فراوان لە ئێران بڵاوی بکەنەوە. دکتۆر تەقێ ئارانی کە لەساڵی ١٩٢٢ بە ئامانجی تەواوکردنی خوێندنی باڵا چوو بۆ ئەڵمانیا، گرنگی بە فەلسەفەی مارکسی دابوو، سەرکردایەتی ئەم گروپەی دەکرد. لە بەرلینیش پەیوەندی کرد بە دکتۆر مورتەزا یەزدی و عەلی بوزرورگ عەلەوی و خەڵکانی تریش. لە ساڵی ١٩٣٠ لەگەڵ هاوڕێیەکانی گەڕایەوە ئێران، لە ساڵی ١٩٣٣ گۆڤارێکی مانگانەی بۆ ڕۆشنبیران لە ژێر ناونیشانی (دنیا) دەرکرد، کەچی حکومەتی شا لە ئایاری ١٩٣٧ دکتۆر ئارانی و (٥٢) کەسی تری گرت، (٤٩) کەسیان دادگایی کران و تۆمەتی

ئەندامبوونیان لە حیزبی شیوعی خرایە پاڵ ، چاوپێکەوتنیان لەگەڵ سەرکردە شیوعیە گیراوەکان لە یەکاندا بەرهەمدار بوو، و لە ساڵی ١٩٤٠ دکتۆر ئارانی لە بەندیخانەدا مرد، و کاتێك ڕەزا شا لابردرا و کوڕەکەی محەمەد عەلی ڕەزا پەهلەوی لە جێگای باوکی حوکمی گرتە دەست، لە ئەیلولی ١٩٤١ شیوعیەکانی ئازاد کرد. و تێبینی ئەوە دەکەین لە دوای پێکهێنانی پارتی تودی بوونە پێشڕەوی بزوتنەوەی شیوعی ئێرانی-دوای شەڕی دووەمی جیهانی.

پێش ئەوەی کۆتایی بەم بەشە بهێنین دەمانەوێ ئاماژە بەو چەواشەکارییانە بکەین کە نوسەرە بۆرژوازییەکان لە ڕۆژئاوا سەبارەت بە توانای بزوتنەوەی نیشتمانی ئێرانی لە ئێران و پشتگوێخستنی بەهاو قورساییەکەی بڵاوی دەکەنەوە. ئەوەتا نوسەری بۆرژوازی ئەمریکی جۆزیف ئیتن سەبارەت بە مێژووی بزوتنەوەی نیشتمانی ئێرانی لە ساڵی ١٩٠٠ەوە لەژێر ناونیشانی هەلپەرستیەوە، ئەوەی خوارەوەی نووسیووە:

"دەبێت لێرەدا ئەوەی بخەینە سەر ئەوەی لەپێشتردا سەبارەت بە بابەتی هەلپەرستی ووتمان، کە سەروەربوونی -ئەوەی کە لەپێشتر وەسفمان کرد کە یەکێك لە سێ هۆکارە جیاکەرەوەکانی مێژووی فارسییە لە ساڵی (١٩٠٠)ەوە بەشێوەیەکی سەرەکی دەگەڕێەوە بۆ پێنج هۆکار:

یەکەم: نەبوونی هەر میسالیەتێکی نیشتمانی باو یان کەسایەتیەکی نیشتمانی کە بکرێت تاك یەکسەر متمانەی خۆی پێبدات، ئەمەش لە ئارەزووی بەهێز بۆ بوونی کەسایەتیەکی ئازا و چاکەکار و ناخۆپەرست و قوربانیدەر وەکو غاندی ڕەنگدەداتەوە.

دووەم: ئەو فشارە ئابوورییەی کە وا لە تاك دەکات کە لە هەر سەرچاوەیەکەوە دەبێت بەدوای یارمەتی بگەڕێت.

سێیەم: ڕۆچوونی توند لە قوماركردن کە سیمایەکی ئەرستۆکراتیەتە.

چوارەم: توڕەیی و بێزاربوون بەتایبەتی لەنێوان ئەندامەکانی کەمایەتیەکان ئەوانەی کە لەبارەی چاککردنی بارودۆخیانەوە تاکە هیوایان بە پەیوەندییە بێگانەییەکان و پارێزگاری کردنی بێگانەوە بووە.

پێنجەم: باوەڕی تەواو بەوەی کە قەدەریان وایە ئەو سیمایەیکە زیاتر جوتیاران هەیانبوو.

لە ساڵی ١٩٠٠ سێ هەوڵی گرنگ هەبوو بۆ دامەزراندنی یەکێتی نیشتمانی. یەکەمین لە دوای دانانی حکومەتی دەستووری لە ساڵی ١٩٠٦ و دووەم لەماوەی حەکمی ڕەزاشاە ساڵی ١٩٢١- ١٩٤١ و سێیەمیش لە کودەتای سەربازی لە ساڵی (١٩٥٣)ەوە. یەکەمیان بەهۆی جۆربەجۆرەوە شکستی هێنا، یەکێکیان دەستەوەستانی پەرلەمان یان ئەنجومەن بوو ئەوەی کە هیوای جەماوەری پێ‌ەوە بەسترابۆوە. دووەمیشیان

بەپلەیەکی گەورە بەهۆی ئەو هەنگاوانەوە شکستی هێنا کە ڕەزشا بۆ بەهێزکردنی دەسەڵاتی مەرکەزی حکومەت گرتیە بەر، ئەوەی کە بووە مایەی کەمبوونەوەی یەکێتی نیشتمانی نەك زیادبوونی"[٢٠١].

ئەوەی کە جوزێف ئەبتن سەبارەت بە مێژووی نوێی ئێران ووتی چ ئەوەی پەیوەندی بە بابەتی هەلپەرستی و شیکردنەوەی بۆ باوبوونی لە ئێران هەبوو، یان بەو سێ هەوڵەی بۆ دامەزراندنی یەکێتی نیشتمانی دران، دەلالەت لە نەزانی ناکەن بەو ڕادەیەی کە دەلالەت لە خراپ تێگەیشتنی بزونەوەی نیشتمانی ئێرانی دەکەن. یەکێتی نیشتمانی شۆڕشی دەستووری ساڵی ١٩٠٦ بەرپاکردبوو، پێش ئەوەش جیاووکی مۆنپۆلکردنی توتنی هەڵوەشاندبۆوە، و سەرکردایەتی جەماوەری دژی کۆمپانیای ئەنگلۆ- فارسی و ئیستیغلال کردنی موهادەنەکردنی حکومەتی ڕەزاشا وخراپیەکانی کردبوو. بەهەر شێوەیەك بێت دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی نیشتمانی ئێرانی تووشی هەرەسێکی گەورە بوو کاتێك کە ڕەزاشا و ئاغاکانی لە ئیستیعماریەکان توانیان بزوتنەوەی نیشتمانی و لەسەروشیانەوە پارتی شیوعی ئێرانی لەنا ببەن، ئەو هەرەسە بۆ هۆی جۆر بەجۆر دەگەڕایەوە پشکی هەرە گەورەی دەکەوێتە ئەستۆی پارتی شیوعی ئێرانی، ئەوەبوو کە نەخۆشیەکەی دەست نیشان کرد، بەڵام وەسفی چارەسەری پێویستی نەکرد بۆ بنبڕکردنی.

پەراوێزەکان :

---

[11] النفط يستعيد ايرلن، ص٩٤ و ٩٥.

[12] تأميم البترول الإيراني، بقلم: د. عاطف سليمان، مجلة البترول و الغاز العربي.

[13] المصدر السابق.

[14] Iran, by John Marlowe, Pp. ٥٩.

[15] The History of Modern Iran, by Upton, Pp.٩٢.

[16] Ibid.

[17] النفط يستعيد ايران، ص٨٣ و ٨٤.

[18] حول حقيقة التحولات الطبقية في ايران، بقلم آزاد– مجلة الهدف، العدد ١٢٦ الصادر في ١٣ تشرين الثاني ١٩١٧.

[19] Iran, by John Marlowe, Pp.٨١.

[20] Ibid.

# نمایشێکی سەدەی بیستەم

سروود قادر

٢-٢

هێزە رامیارییە رکەبەرەکان

ململانێی نیوان لیبرالەکان و کۆنەپارێزەکان سەرچاوەی سەرەکی دووبەرەکی بوو لە جیهانی خۆرئاوادا. کۆنە پاریزەکان بەزۆری سەر بە گروپە سەرپشکەکانی نێو کۆمەڵ بوون و پشتیوانیان لە نا هاوتاییە چینایەتیەکان و حکومەتی ئۆتۆکراتی و پرۆژە ئابوورییەکانی چینە باڵاکان دەکرد. هەروەها ئەمانە بەشیوەیەکی گشتی داکۆکیان لەو دام و دەستگایانە دەکرد کە نوێنەرایەتی بەهاو نەریتە کۆنەکانیان دەکرد واتا کەنیسەی یاسایی، مافی ئاسمانی پاشایەتی و سوپایەکی بەهێز. کۆنە پارێزەکان هێشتا لەناو گەلانی ناوەڕاست و خۆرهەڵاتی ئەورووپی وەك ئەڵمانیا، هەنگاریا و بەتایبەتی لە ڕووسیادا هێزێکی بەتوانا بوون.

ئازادیخوازەکان (لیبراڵەکان) زیاتر سەر بە چینە کاردار و پیشەوەرە سەربەخۆیە ڕابووەکان بوون و دەیانویست کۆمەڵگا بگۆڕن بۆئەوەی جێگە و ڕێگەیەکی مسۆگەر و پتەویان تێیدا هەبێت. ئەمانە خوازیاری ئازادیی دەبرین و چاپەمەنی، ئاین کۆڕ و کۆمەڵ بەستن، مافی دەنگدان و وەرگرتنی پۆست بۆ پیاوانی خاوەن داراییەك مامناوەندی، ئەم حکومەتە هەڵبژێردراوە بوون کە بە تەنگ مافی دەنگدان و بازرگانیەکی ئازاد لە کۆت و بەندەکانەوە دەچێ. هەندێ لەوانە کە زۆر ئازادیخواز بوون دەیانویست هەموو نێرینەیەکی پێگەیشتوو، تەنانەت ئەوانەشی هیچ داراییەکیان نیە، مافی دەنگدان و وەرگرتنی پایەیان پێ بدرێت.

ئەمەریکاییەکان لەگەڵ داهاتنی ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە ئەمەیان بۆ نێرینەی سپی پێست بەدەست هێنا. بەگشتی ئازادیخوازەکان لە ئەورووپادا، لە شۆڕشی فەرەنساوە ساڵی ١٧٨٩ دەسەڵاتیان بەدەست هێناو ساڵی ١٩٠٠ لە بەریتانیای مەزن و فەرەنسا و لەنێو هەندێك تاخمی ئیتالا و لەناو هەندێك گەلانی بچووکی ئەورووپای خۆرئاوادا هێزێکی بەتوانا بوون. لەگەڵ سوڕانەوەی سەدەدا هەندێك لە لیبراڵەکان بە ئومێدی بەربەستکردنی شۆڕشی سۆسیالیستی داکۆکیان لە بەرنامەکانی دەوڵەتی خۆشگوزەرانی وەك قەرەبووکردنەوەی بێکاری مانگانەی خانەنشینی دەکرد.

جیاوازیی لیبراڵ – کۆنەپارێزەکان بەزۆری خۆی لە ناکۆکیەکانی نێوان خەڵکی ساماندارا دەنواند و ئەم جۆرە شەڕانە بەدەرنەدەکەوتن کە بە ژمارەیەکی زۆری کرێکارانی کارگەوە پەیوەندیدار بن. یەکێك لە دژکارەکانی کرێکارانی خۆرئاوایی بەرامبەر چەوساندنەوەیان خۆڕێکخستن بوو لە یەکێتییە کریکارییەکاندا، بۆئەوەی لە ڕێگەی وتووێژە گەلەکوییەکان و پێشگرتن لە کرێکاران بۆ چوونە سەرکار و مانگرتن و پەیوەندی پچڕاندنەکانەوە خاوەن کارەکان ناچار بە چاکسازی بکەن. یەکێتییەکان مەبەستیان ئەوەنەبوو هەرچۆنێك بێت کۆتایی بە سیستەمی سەرمایەداری بێنن، بەڵکو لەباتی ئەوە جەختیان لەسەر باشترکردنی مزەکان و هەلومەرجەکانی کار و بەدەستهێنانی مانگانەی خانەنشینی و جۆرەکانی دکەی بیمەدا دەکرد. یەکێتییە کرێکارییەکان ڕووبەڕووی بەرهەڵستیەکی گەورەی خاوەن کارەکان و هاوپەیمانە ڕامیارییەکانیان بوونەوە، بەڵام بە شێنەیی بەهێزبوون، بەتایبەتی لە بەریتانیای مەزندا، لەدوای سوڕانەوەی سەدەدا. خەڵکانێکی تر کە بایەخیان بە کێشەی کرێکاران دەدا و ڕێڕەوێکی ڕادیکاڵانەتر لە هی یەکێتییە کرێکارییەکانیانگرتە بەر کە خوازیاری ڕووخاندنی سەرمایەداری و بەرپاکردنی سۆشیالیزم بوون.

کارل مرکس کە لە ١٨٨٣ دا مردووە یەکێك لە گەورەترین تیۆردارێژە ڕامیارییەکانی جیهان بوو. کرۆکی (سۆشیالیزمی زانستی) مارکس، کە لەگەڵ هاوڕێ ئەڵمانیەکەی فردریك ئەنگز دایانڕشت، تیۆری ماتریالیزمی مێژوویی یان دیالێکتیکی بوو. ئەم تیۆرییە ئەوەی ڕاگەیاند کە هێزە بەرهەمهێنەرەکانی وەك تەکنۆلۆژیا، سەرچاوە مادییەکان وەکو، پەیوەندییە ئابورییەکان دیاریدەکەن. لە ڕوانگە مارکسەوە هێزە بەرهەمهێنەرەکان و پەیوەندییە ئابوورییەکان بەیەکەوە بناغەی کۆمەڵگە پێکدێنن، و لە بەرامبەردا ئەو (سەرخان)ەی فەرمانڕەوایەتی، ئایینەکان، یاساکان و فەرهەنگ دیاریدەکەن کە چینی سەردەستە لە هەر هەوارێکی مێژووییدا بۆ بەهێزکردنی پێگەی خۆیان بەکاریدێنن.

مارکس ئەوەی دەرخست کە هێزە بەرهەمهێنەرەکان لە ڕەوتی مێژوودا گۆڕانی بەسەردا هاتووە، بۆیە پەیوەندییە ئابوورییەکان گۆڕان و لە ئەنجامدا چینی نوێ سەریانهەڵداوە بۆ گرتنەوەی شوێنی چینە سەرەکیەکان و دروستکردنی سەرخانی نوێ.

لەبەرئەوەی چینی دەسەڵاتدار هەرگیز بەشێوەی ئاشتیانە دەستبەرداری دەسەڵاتی خۆی نابێت. پێویستە لەلایەن ئەو چینە ڕاپەڕیوەی لکاوە بە هێزە بەرهەمهێنە نوێیەکانەوە بروخێنرێت، بەمجۆرە ناکۆکی چینایەتی شتێکی لەبەرچاو نەهاتوو و تا ڕۆژگاری کۆمۆنیزم دەچەسپێ، درێژە دەکێشێ. مارکس باوەڕی وابوو کە لە سەردەمی ژیانی خۆیدا ڕوخانی چینی فیودالی خاوەن زەوی لەلایەن بازرگان و خاوەن پیشەسازیخوازە سەرمایەدارەکانەوە بینیووە. مارکس دەڵێ هەروەك شتێکی لەبەرچاو نەهاتوو چینی

کرێکاری پیشەسازی یاخود پرۆلیتاریا یەکدەگرێت لەگەڵ چینە بەرهەمهێنە هێشتا نوێترەکان ئەوسا کۆمەڵگەی سەرمایەداری دەگۆڕێت، ئەم چینەی کرێکار ئەوسا (دیکتتۆریەتی پرۆلیتاریا) دەچەسپێنێ بۆئەوەی سیستەمی نوێی سۆسیالیستی دامەزرێنێ و ڕەفتار لەگەڵ هەموو ئەو چینە دوژمنانەدا بکات کە ماونەتەوە. ئەم دیکتاتۆرییەتەی پرۆلیتاریا و هەموو دام و دەستگاکانی حکومەت ئەوسا دەپوکێنەوە بۆئەوەی سەردەمی پەیوەندییە دادپەروەرانە کۆمەڵایەتیەکان، کاری شایستەی مرۆ وئاسوودەیی باڵای بەدوادا بێت.

لەگەڵ سوڕانەوەی سەدەدا سەندیکالیزم و مارکسیزم بەباڵە زۆرەکانیەوە هەردووکیان لەناو گەلانی ژمارەیەکی زۆر پاشرەویان هەبوو. ئەمە شتێکی ڕوونە کە لیبراڵەکان و کۆنپارێزەکان ڕووبەڕووی نەیاری ڕامیاری ترسناک بوونەوە. وێڕای جیاوازییەکانی نێوان مارکسیەکان و یەکێتیخوازەکان کاریگەرییان لەسەر یەك دانا، مارکس ڕایگەیاند کە هەلومەرجی کرێکاران لەژێر دەسەڵاتی سەرمایەداریدا بەرەو خراپتر دەچێت و ئەوانیش ڕادیکاڵتر دەبن. بەپێچەوانەی ئەمەوە مانگانە و هەلومەرجەکانی کار و ژیان لە وڵاتە سەرمایەدارەکانی وەك بەریتانیای مەزن و ئەڵمانیا بەرەو باشتر چوون کە سیاسەتمەدارە سەرمایەدارەکان دەستیان بە چاکسازی کرد بۆئەوەی بەر بە سۆیالیزم بگرن. ژمارەیەکی زۆر لە کرێکاران زیاتر بایەخیان بەمجۆرە باشتر کردنانە و ڕەنگە بەدەستهێنانی پشك لە دەسەڵاتی ڕامیاریدا نەك ڕووخاندنی سەرمایەداری لەڕێگای شۆڕشەوە.

پێش یەکەم جەنگی جیهانی لە ئەنجامی لەبەرچاوگرتنی جیهانبینی میانڕەوانەی زۆربەی کرێکاران ژمارەیەکی زۆر لە سۆشیالیستەکان لە ئەوروپا و وڵاتە یەکگرتووەکان بڕیاریان دا کە لە باتی گرتنەبەری شۆڕشی توندوتیژ بە سیستەمی پارتی ڕامیاری سەرمایەداری بگۆڕین. لەنێو ئەو گەلانەی کە ڕێگەیان بە دەنگدانی گشتی داوە پارتە ڕامیارییەکانی وەك پارتی سۆسیال دیموکراتی ئەڵمانی لە ڕووی قەبارەوە بە خێرایی گەشەی کرد. لە وڵاتە یەکگرتووەکان یۆجین دێبز، پاڵێوراوی سەرۆك کۆماری سۆسیالیست دووجار نزیکەی ملیۆن دەنگی بەدەستهێنا.

کاتێ کە هەندێك پارتە سۆسیالیستەکان شۆڕشگێڕایەتییەکەیان کاڵ بووەوە، دوو بزاوتی دیکە، ئانارشیزم و سەندیکالیزم، زیاتر بەرجەستە بوون.

ئانارشیستەکان باوەڕیان وایە حکومەتەکان خەڵك لە بەرژەوەندی چینە دەوڵەمەندەکان دەچەوسێننەوە، بۆیە خوازیاری ڕووخاندنی هەموو حکومەتێکن و بونیادنانەوەی کۆمەڵگەی بێ حکومەتن. لە ساڵی (١٨٤٩)ەوە تاکو ١٩١٢ ئانارشیستەکان سەرۆك کۆماری فەرەنسا ودانەیەکی وڵاتە یەکگرتووەکان و دوو

سەرۆك وەزیرانی ئیسپانی و پاشای ئیتالیا وئیمپراتۆریەتی ئەتریشیان تیرۆر کرد. سەندیکالیستەکان باوەڕیان وابوو یەکێتی کرێکاری کە ڕابەرایەتی مانگرتنی گشتی دەکات، کۆمەڵگە لە پێ دەخات و حکومەتەکەی دەڕوخێنێ، دوای ئەوە یەکێتییەکان دەبن بە دەزگا ڕێکخەرە بنەڕەتیەکانی کۆمەڵگە.

ئەم بزاوتە لە فەرەنساوە پەرەی سەند بەڵام کاریگەری دانا لەسەر کرێکاران وڕادیکاڵان لە هەموو شوێنێکدا. لە وڵاتە یەکگرتووەکاندا ڕێکخراوی کرێکارانی پیشەسازی جیهان (wobblies) گەورەترین تاخم بوون کە باوەڕەکانی سەندیکالی دادەمەزراندەوە.

لیبرالیزم، باوپارێزی، سۆسیالیزم و بزاوتی ڕامیاری دیکەش هەندێك کاریگەرییان لە دەرەوەی خۆرئاوادا هەبوو. لە دەستپێکی سەدەی بیستەمدا لیبرالیزم لەناو ئەو هیندییە خۆرئاواییانەدا بەهێز بوو کە خوێندنیان تەواو کردبوو، کە هەندێك لەوانە ساڵی ١٨٨٥ کۆنگرەی نەتەوەیی هیندییان دامەزراند. نزیکەی هەر لەو دەمەدا هەندێك لە ژاپۆنییەکان کە کەوتنە ژێر کاریگەری باوەڕە خۆرئاواییەکان پشتیوانیان لە دانانی دەستوورێك دەکرد کە سەرەنجام ساڵی ١٨٨٩ پەسەند کرا. هەرچەندە مارکسیزم لە ئاکامدا سەلماندی کە لەناو خۆرئاواییەکاندا دەبێتە هۆکارێکی بەهێز، لەپێش یەکەم جەنگی جیهانیدا هێزێکی پشتگوێ خراو بوو. گرنگترین نموونەی کاریگەری خۆرئاوایی لە ئاسیادا سەن یات سین بوو، کە ساڵی ١٩١١ ڕژێمی کۆنی چینی ڕوخاند و هەوڵیدا بە سیستەمێك بیگۆڕێت کە لەسەر بنەماکانی دیموکراتی، لیبراڵی و سۆسیالیستییەکی میانڕەو بونیاد بنرێ.

گەرچی باوەڕە ڕامیارییە خۆرئاواییەکان هەندێك زەمینەیان لە ناوچە نا خۆرئاواییەکاندا بەدەست هێنا، زۆربەی ڕابەرە نەریتییەکان تەقەلایان دەدا داب و نەریت و فەرهەنگە پەرت وبڵاوەکانی کۆمەڵگاکانی خۆیان نەمر بکەن وبەزۆری ئاینیان وەك هێزێکی بەتوانا بەکاردەهێنا بۆ پێشگرتن یاخود سنووردارکردنی بەخۆرئاوایی بوون. لەبەرئەوەی ئەم پێشەوا نەریتییانە تەقەلایان دەدا ئەو هەلومەرجە بپارێزن کە لە ئارادایە، ئەمانە هەندێك بە کۆنەپارێز (باوپارێز)ەئەورووپییەکان دەچوون.

### ناسیۆنالیزم –نەتەوەباوەری–

ناسیۆنالیزم لەگەڵ سوڕانەوەی سەدەدا، یەکێ لەو هێزە ڕامیارییانە بوو کە دەستبەکار بوو. ساڵی ١٩٠٠ لە خۆرئاوا و ژاپۆندا چەقی بەستبوو، و لەماوەی سەدەی بیستەمدا بە هەموو لایەکی جیهاندا بڵاو بووەوە. نەتەوەباوەری ئەو ئەمەکدارییە سۆزدارییە پەروەردە کراوەیە کە تاك بەرەو ئەو کۆمەڵە ئاراستە دەکات کە درك بەوە دەکات پەیوەندیگەلێکی هاوبەشی لەگەڵیدا هەیە. ئەم باوەڕە هەستی ئەندامیەتی و بۆگەڕانەوە بە

تاك دەبەخشێ. نەتەوەباوەڕی بەهۆی ژمارەیەك پەیوەندی هاوبەشەوە گیانی بە بەردا کراو کە ئەمانەن: زمان، ئاین، نەریتە کۆمەڵایەتی یان دەستوورییەکان، هەرێمی جوگرافی و مێژوو.

ئەو بناغەیەی نەتەوەباوەڕی کە بەم دواییانە لە هەمووان زیاتر دووبارە دەبێتەوە، کە مرۆڤ بە کۆمەڵی نەژادی خۆی دڵسۆز بێت. ئەمە پێویست نیە کە کۆمەڵێکی نەتەوەیی لە هەموو ئەو پەیوەندییانە هاوبەش بێت کە ئاماژەیان بۆ کرلوە. بۆنموونە سویزەرلاند مێژوویێکی نەتەوەیی درێژی هەیە، بەڵام ژمارەیەك کۆمەڵی زمانی سەرەکی لەخۆی دەگرێت.

مێژووی هاوبەش یەکێ لە توخمە پێکهێنەرە گرنگەکانی ناسیۆنالیزمە. گروپە نەتەوەییەکان و دەوڵەتان رابردووی خۆیان کۆدار رادەگرن و هەندێکجار کە ئەمە لە بارادا نەبوو هەوڵی بۆ داهێنانی یاخود رومانکردنەوەی رابردوویەکی مێژوویی دەدرێت. بۆنموونە ئەڵمانەکان تەقەلایان دا بە جەختکردن لەسەر سەرکەوتنەکانیان لە رابردووی دووری خێڵەکییەکانیانەوە بەسەر جیاوازییە هەرێمایەتی و رامیاری و ئاینییەکانیاندا زاڵ بن. ئەو هیندییە ناسیۆنالیستانەی لەژێر حکومڕانی بەریتانیادا دەگروان، ئاسۆکانیانی رومانڵ کردەوە، ئەو ئیمپراتۆرییەتەی سەدەی سێیەمی پێش زاین ژاباوە، لەژێر فەرمانڕەوایەتی ئەودا نیمچە کیشوەرەکە یەکخرا و بەهێزکرا. دروشمەکەی ئەو کە گالسیکە و شێر بوو ساڵی ١٩٤٧ کرا بە هێمای دەوڵەتی تازە سەربەخۆی هیندستان. دوای شۆڕشی ١٩١٠ ئەو مەکسیکییانەی بە پلەی یەك لە تۆرەمەی ئەمەریندی (نەژادی دوو رەگی ئەمەریکایی و سووورپێست) بوون جەختییان لەسەر رابردووی تازەتی و مایەنی خۆیانکرد نەك لەسەر میراتی ئیسپانییان.

لە نەتەوەباوەڕیدا نەتەوە خۆی بە زۆری بە شکۆدار دادەنرێت. نەتەوەباوەڕەکان بەو هەستە کۆن و تەنانەت برایانە دەوروژێنن کە لەسەر بنچینەی ئەو ئەفسانانە وەستاون کە گوایە نەتەوەکان نەمرن. وەك نوسەری ئیتالی جۆزێف مرینی ئەمەی دەربڕیوە کە دەڵێ: "وڵاتی ئێمە، ماڵی ئێمەیە، ئەو خانوەی خوا پێی بەخشیوین. لە کارکردن لە پێناو وڵاتەکەماندا، لەسەر بنەمایەکی راست و دروست، ئێمە بۆ مرۆیەتی کاردەکەین".

لەگەڵ داهاتنی ساڵی ١٩٠٠ نەتەوەباوەڕی وەك هێزێکی یەکخەر، لە ئەورووپای خۆرئاوا و وڵاتەیەکگرتووەکاندا ریشەی داکوت بوو. پێشەواکانی ئەم ناوچانە کە خوێندەواری تێیاندا لە ئاستێکی بەرزدا بوو، لەرێگەی نووسین و سیستەمی خوێندنەوە مێشکی تاکەکانیان بەوە ئاخنی کە وەك هێمای هەرە باڵای نەتەوەکەیان، پشتیوانی لە حکومەتەکەیان بکەن. لەبەرئەوەی دانیشتووانی وڵاتە یەکگرتووەکان فرە جۆرە نەتەوەباوەڕی لەم وڵاتە دیاردەیەکی دووبارە و ناکۆك بوو. رەوشێکی نەریتی نەژادی و ئاینی (کەمۆڵەی

ئاوێتەسازی) لە ئارادا بوو، کە هاوولاتییەکانی بەشێوەیەکی سەرەکی بە چەمکەکانی دەرفەتی ئابووری و دیموکراسی و ڕامیاری پابەند دەبوون. ئەمە هەرچەندە بەو نەریتە فەرهەنگییە پارسەنگ کرا کە بەهاو دەماردارییەکانی ئەو کەسە خودان دەسەڵاتە ڕامیاری و ئابوورییانەی تێیدا ڕەنگ دەدایەوە، کە نەوەی نەژادەکانی ئەورووپای خۆرئاوا بوون.

لە ئەورووپادا یەکخستنە کاریگەرەکانی ئەڵمانیا و ئیتالیا لە ساڵانی ١٨٦٠ و ١٨٧٠ دا توانی نەتەوەباوەڕی نەژادی دەرخست. گەرچی ژمارەیەکی زۆر لە ئەڵمانییەکان یەکبوونی خۆیان بە ناتەواو دادەنا، چونکە هێشتا ملیۆنان ئەڵمانی لە دەرەوەی کەوشەنەکانی ئەڵمانیای نوێ دەژیان. داخوازییەکانی نەتەوەباوەڕە توندڕەوە ئەڵمانییەکان بۆ یەکخستنی هەموو ئەڵمانییەکان لەناو یەك تاقە دەوڵەتدا تەگەرەی خستە بەردەم مێژووی ئەورووپا لەوەی بە ئاسوودەیی پێ بنێتە سەدەی بیستەمەوە.

لە زۆر ناوچەدا نەتەوەباوەڕی هێزێکی لەت و پەتکەر بوو نەك یەکخەر لەبەرئەوەی هەندێجار وای لە گروپە سەردەستەکان دەکرد کەمینەکان لەناو نەتەوەدا بچەوسێننەوە، ئەم جۆرە کردەوانە بەزۆری لەسەر بناغەی دوژمنایەتی نەژادی، چاوچنۆکی ئابووری و ڕقی ئاینی بونیاد نرابوون. بەرنامەکانی (هاندانی حکومەت بۆ هێرشەکانی لات و پاتان) لە ڕوسیادا دژ بە جولەکەکان و چەوسانەوەی ئەرمەنییەکان لەلایەن تورکەکانەوە نموونەکانی ئەم جۆرە ستەمکارییانە بوون لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا.

سۆزداری نەتەوەباوەڕی لە سەرێکی دیکەشەوە لەتوپەتکەر بوو. لە هەندێك وڵاتدا هەندێك دانیشتووانی دیاریکراو، کە لە ژێر دەسەڵاتی گروپەکانی دیکەدا بوون، بیری ئەوەیان بۆهات خۆیان لەم ڕکێفە ڕاپسکێنن، چی پێکهێنانی نەتەوەی سەربەخۆی خۆیان یاخود بە پەیوەست بوون بەو نەتەوە دراوسێیەیان کە لەلایەن هاو ڕەگەزەکانیانەوە فەرمانڕەوایەتی دەکرێن.

ئوستریا- هەنگاریا و ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، بەشێوەیەکی تایبەتی، بەهۆی دووبەرەکی نەتەوایەتی لەتوپەت بوون ونەك ئەم دەوڵەتانە فەرمانڕەویەتی ئەو دەستە و تاخمە کەمینە نەژادییە خانە خوێیانەیان دەکرد کە زیاتر و زیاتر ئامێزییان بۆ نەتەوەباوەڕێ کردبۆوە. ئیمپراتۆریەتی ئۆستڕۆ- هەنگاریا بەیەکەوە تارادەیەکی زۆر بەهۆی گوێلەمستییان بۆ دەسەڵاتی پاشایەتی و کەنیسەی کاتۆلیکی هەڵیان دەکرد.کاتێ ئەڵمانی و ماگیارە (هەنگارییە) سەردەستەکان دەستیان کرد بە پێداگرتن لەسەر ئەوەی کە ئیمراتۆریەتەکە کە بە پلەی یەك ئەڵمانییە، یاخود ماگیارییە، سلاڤ و گروپە نەژادییە کەمایەتییەکانی دیکەی ناو ئیمپراتۆریەتەکە بۆ بەدەستهێنانی دەوڵەتی نەتەوەیی خۆیان کەوتنە جموجوڵ کردن. تەنگژە و ڕقەکانی نەتەوەباوەڕێ بەلکانی کرد بە (بەردە ئەستێ و پووشی گڕگرتنی ئەورووپا). لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا کە

باوەڕ بە ئیسلام کۆی کردبوونەوە، کە هاوبەندی ئاینی وای لێهات بەس نەبێت بۆ ئەم مەبەستە، عەرەب و کورد گەرچی موسوڵمانیش بوون، کەوتنە هەوڵدان بۆ سەربەخۆی لەو دەوڵەتەی کە لەژێر دەستی تورکاندایە. ئەمجۆرە نەتەوەباوەڕێ و دەماردارییە نەژادییە خۆجێییە بەشێوەیەکی زۆر بەهێز بەشدارییان لە ڕوخاندنی هەردوو ئەم ئیمپراتۆریتە گەورانەی پێشوو کرد.

لە ساڵانی زووی سەدەی بیستەمدا ئەو ڕێڕەوە خۆرئاواییانە پەرەیان سەند کە جەختیان لەسەر باڵایەتی ڕەسەنی ئەوانەدا کرد کە پێیان دەگوترێت گروپی ئاریایی و گەلانی ئاری و پێیان لەسەر نزمایەتی گروپەکانی دیکەی وەك جووەکان، سلافەکان و قەرەجەکان داگرت. ئەمە ڕۆشنترین نموونەی ئەفسانە ڕەگەزپەرستییەکان بوو بۆ پەرەپێدانی نەتەوەباوەڕی.

لەگەل داهاتنی ساڵی ١٩٠٠ نەتەوەباوەڕیش بە باڵە جۆراو جۆرەکانیەوە باڵی بەسەر ئاسیادا کێشا. ژاپۆنییەکان بە جەختکردن لەسەر ئەوەی کە ڕەگەزێکی باڵان، پاساوییان بۆ ئەو دەستدرێژییانەیان دەهێنایەوە کە لە ئاسیادا ئەنجامیان دەدان. دەستەبژێرێکی بچووکی هیندی کەوتە ژێر کاریگەری خۆرئاوا، کاری کرد بۆ خۆ ڕزگارکردن لە حوکمی بەریتانی. بە بڵاوکردنەوەی چەمکی هیندستانی یەکگرتوو لەنێو ئەو دانیشتووانەی نەژاد و زمان و ئاین دابەشی کردبوون. لە چیندا دەستەبژێرێکی دیکەی ژێرکاریگەری خۆرئاوا کاری بۆ ئارایشتدانی چینییەکان کرد، بۆ خاچدروشمی نەتەوەباوەڕ لە یەك کاتدا. ئەمانە بێزاری و تووڕەیی خەڵکیان بەرامبەر کەمینە مەنووە فەرمانڕەواکان گۆڕی بۆ پلانی ڕوخاندنی بنەماڵەی مەنچو، لەکاتێکدا هەر لەو دەمە هەوڵیاندا کە هەموو کۆمەڵە نەژادییەکان لە چیندا بۆ بەرهەڵستیکردنی ئیمپریالیزمی خۆرئاوایی و ژاپۆنی ئارایشت بدەن.

### پەیوەندییە نێو نەتەوەییەکان

لە دەستپێکی سەدەی بیستەمدا لە ئەنجامی ئەو گرژیانەی لە کۆمەڵێك سەرچاوەوە هەڵدەقوڵان پەیوەندییە نێو نەتەوەییەکان لە هەموو لایەکی جیهاندا ئاڵۆزبووبوون. ئاستە نوێیەکانی شانازی نەتەوەباوەڕانە کاروبارە نێونەتەوەییەکانی گرتەوە کە ئەمە ئەو ترس و دوژمنایەتییە لە ئارادایانەی بەرزکردەوە کە میراتی ڕابردوو بوون. زۆربەی جار نەتوەباوەڕی بە هەستە گشتییەکانی لەپێشترایەتی نەتەوەیی و ڕەگەزی گوزارشتی لە خۆی دەکرد. بەریتانییەکان بە ووشەی ووگ ناوی خۆرئاواییەکانیان دەبرد کە کەمایەتییەکی زۆری تێدا ڕەنگ دەداتەوە، بەرامبەر ئەوانەی نەژادی سپی نین و فەرەنساییان بە بۆق و ئەڵمانییەکانیان بە تەتار ناو دەبرد، کە ئەوەش ئاماژەیە بەوەی کە گەلێکی دڕندە و وێرانکەرن. نەتەوەکان لەپێناو خاك و دەسەڵاتدا کەوتنە شەڕکردن لەگەڵ یەك، لەکاتێکدا تۆمەتی ئەوەیان دەدایە پاڵ نەیارەکانیان

کەخەسڵەتێکی دڕندانە یاخود مێژوویەکی پڕ لە شەرمەزارییان هەیە. بەرپرسێکی بەریتانی ساڵی ۱۸۹۹ دووپاتی ئەوەی کردەوە کە: ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانیا ... هەردەم خاوەن سەنگێکی ناقۆڵا بووە. ڕکابەرایەتی ئیمپریالیستی بۆ دەستگرتن بەسەر خاك بەدەوری جیهاندا بەوەی کە پالی بە گەلانەوە نا بەدوای ئەمنییەتدا بگەڕێن کە ئاگرەکەی خۆشتر کرد، بۆدوورخستنەوەی مەترسی لە خۆیان پەنا ببەنە بەر پێشبڕکێی خۆ پڕ چەك کردن، هاوپەیمانییەکان و پلانی جەنگییەکان.

ئیمپریالیزم

ئیمپریالیزم، ئەو ڕەوەندەی کە ژمارەیەکی کەم لە نەتەوە پیشەسازییەکان بەهۆیەوە دەسەڵاتی ئابووری و ڕامیاری خۆیان بەسەر زۆربەی بەشەکانی دیکەی جیهاندا بەرفراوان کرد، لەگەڵ سوڕانەوەی سەدەدا ئەو هێزە سەرەکییە بوو کە ئاراستەی پەیوەندییە نێونەتەوەییەکانی دیاریدەکرد. وەك یەکێك لە ڕابەرە ئیمپریالیستە بەریتانییەکان گوتوویەتی: ڕۆژگاری گەلانی بچووك بەسەرچووە، ڕۆژی ئیمپراتۆرییەتەکان داهاتووە. لەڕاستیدا ئەم ڕەوەندە نوێ نەبوو، لە سەدەی پازدەیەمەوە بۆ سەدەی هەژدەیەم ئەوروپییەکان بەدوای خۆراك و فایبەر و مادە بە نرخەکاندا دەگەڕان، دەستییان بەسەر سەرتاسەری نیوەگۆی خۆرئاوا، ئوسترالیا، بەشێکی زۆری ئاسیاو هەندێك پارچەی ئەفەریقادا گرت. لێرە بەدواوە گەرچی هەرگیز دگیرکردنە ئیمپریالیییەکان بەتەواوی کەم نەبۆتەوە، بەڵام بەرلەوەی ئیمپرالیزم بەشێوەیەکی کاریگەر لە دوامین سێیەکی سەدەی نۆزەدەیەم بەهێز بێ، تاڕادەیەك بە هەنگاوێکی لەسەرخۆتر بەرەو پێش چوون. دۆخی گەلە ئیمپریالیستەکان گۆڕانی بەسەردا هات. ئیسپانیا و پورتوگال و هۆڵەندا سێ قارەمانی سەدەی پێشووتر بوون، وەکو جاران بە چالاکی نەمانەوە بەڵکو سێ هێزی ئیمپریالی نەریتی دیکە - بەریتانیای مەزن فەرەنسا و ڕوسیا بەتەواوی دەستیان لەسەردەمی نوێدا هەبوو. ئەمانە بیلیکیوم Belgium و ئەڵمانیا و ئیتالیا و وڵاتە یەککگرتووەکان و ژاپۆنیشیان هاتە پاڵ. گەلێ هۆ هەبوون بۆ بوژاندنەوەی ئیمپریالیزم، کە هۆکاری ئابووری یەکێکە لە گرنگترینیان. لەگەڵ ئەو هێزە ئابورییەی لە ئارادا بوو، پیشەسازیخوازە خۆرئاوایی و ژاپۆنییەکان، یەکبینە بەدوای بازاڕە نوێیەکان، کاری هەرزان، کەرەستەی خاوی پیشەسازی، و بەرووبوومی کشتوکاڵی و شوێن بۆ ...... دەگەڕان. بەزۆری دوو ئەلگۆی ئاوێتەی- دوبا پشت پێکبەستنی ئابووری سەریهەڵدا. بۆنموونە کارگەکانی چنینی کوتاڵی بەریتانی لە هیندستان و میسردا هانی چاندنی لۆکەی دا کە هەردووکیان بەشە زۆر گرنگەکانی ئیمپراتۆریەتی بەرفراوانی بەریتانی بوون. کرێکارە هەرزانە خۆجێیەکان لۆکەکەیان پەروەردە دەکرد و دەچنییەوە کە بە کەشتی دەبران بۆ بەریتانیای مەزن بۆئەوەی بکرێت بە کوتاڵ. پاشان قوماشە لۆکەییەکە دەکرا بە کراس و کەل و پەلی پۆشاکیی دیکە کە لە بەرامبەردا بە

کرێکارەکانی هیندستان و میسر دەفرۆشرانەوە. لەم شێوازەدا پیشەسازخوازەکان نەك هەر تەنیا کرێکاری هەرزان و کەدەستەی خاویان دەست دەکەوت بەڵکو قازانجییان لە بازەڕەکانی کەلوپەلە کارخانەییەکانیشیاندا دەکرد.

نەتەوەباوەڕیش، کە لە زۆر وڵاتدا کێشمەکێشی بێوچانی هێنابووە ئارا بۆ ڕکابەرایەتی کردن لەگەڵ گەلانی دیکەدا بۆئەوەی ببێت بە بەهێزترین گەل لە جیهاندا، ئاگری ئیمپریالیزمی خۆشتر کرد. زوو زوو گروپە خاوەن بەرژوەندییە تایبەتەکان یاخود پروپاگەندەکەرەکانی وەك نوێدۆزەکان و سەرەرۆکان حکومەتە نەتەوەییەکانیان هان دەدا دەسەڵاتی خۆیان بەرفراوان بکەن.

ستراتیژی ئیمپریالیزم، کە پەرۆشیە بۆ دەستگرتن بەسەر ڕێگە ئاوییە گرنگەکان، بەندەرەکان و پاسگا سوپاییەکان یەکێ لە هۆکارە گرنگەکانی دیکە بوو کە پاڵی بە گەلانەوە نا دەست بەسەر ناوچە دووە دەستەکاندا بگرن. بۆنموونە حکومەتی بەریتانی هێزێکی دەریایی بەتوانای بەکارهێنا بۆ پاراستنی ڕێڕەوە ئاوییە بازرگانییە نێونەتەوەییەکان.

لایەنێکی ئیمپریالیزم کە لە سێ کوچکەی پاڵنەر، بیانووسازی و ئەنجام پێکهاتووە بە (ئیمپریالیزمی فەرهەنگی) ناوبراوە. لەسەر بنچینەی بەند و باڵوەی ئەوەی کە نەژادی سپی بە سروشت باڵاترە. خۆرئاواییەکان وایان دەرخست کە ئەمە ئەرکی سەرشانی سپییەکانە ولمەکانی ژیاری خۆرئاوایی (باڵاتر) – تەکنۆلۆژیاکەی، ئاینەکەی، دام و دەستگاکانی– بۆ ئەو نا سپییە (نزمتر)انەی جیهان ببەن کە لە (تاریکی و نەزانی)دا دەژین.

ویلهیمی دووەی تزاری ئەڵمانیا کە ئیمپریالیستێکی خوێنڕێژ بوو، بانگەشەی ئەوەی کرد (خوا بانگی ئێمەی کردووە بۆ بەشارستانیکردنی جیهان) ئێمە نێردە ئاینییەکانی پێشخستنی مرۆیەتین. ئەندامێکی ئەنجومەنی پیرانی وڵاتە یەکگرتووەکان بە زمانێکی دۆستانەتر دەڵێت: ئێمە شەنگایی هەر بەرز و بەرزتر دەکەینەوە تا دەگەیەنین بە ئاستی شاری کانساس. هەندێك لە خۆرئاواییەکان لەوەش دوورتر ڕۆیشتوون کە وای پیشان دەدەن ئەوانەی سپی نین ئەندازەیەکی کەم دەستکەوتی مێژوویی یاخود فەرهەنگییان هەیە، کە نایان کات بە جێی متمانە پێکران و هەرگیز ناگەن بەو ئاستە بەرزە فەرهەنگی و ڕامیاری و تەکنیکییەی کە کۆمەڵگە سەرکەوتووەکانی سپی پێستە خۆرئاواییەکان پێی گەیشتوون.

سۆسیال داروینیستەکانی وەك هێربەرت سپنسەر دەڵێن پەرەسەندن کە ململانێ و لەناوبردنی بێ هێز و مانەوەی گونجاوترین دەگرێتەوە، دەبی بەسەر ململانێی نێوان فەرهەنگاکان، نەتەوان و گەلانیشدا جێ بەجێ بکرێت. تەنانەت وای دەردەخەن کە بەمە ڕەوایە یاخود سروشتییە کە (فەرهەنگە بەهێزە باڵاترەکان)

زاڵ بن بەسەر (فەرهەنگە لاوازترە پەستەکان) یاخود تەنانەت لەناویشیان ببەن. بەمجۆرە دوای ئەوەی فەرەنسا جەزایری داگیرکرد هەوڵیدا نەریت و زمان و ئاینە خۆجێیەکان ریشەکێش بکات. کاتێك کە جەزایرییەکان دژ بە داڕوخاندنی کۆمەڵگاکەیان شەڕیان کرد، فەرەنسییەکان بەمە وەڵامیان دانەوە کە شتێك بەناوی نەتەوەی جەزایری لە ئارادا نییە و ئەمان دەستکەوتەکانی ژیاری فەرەنسی (واوەتر) بۆ خێڵە نەزانە سەرگەردانەکان دێنن.

جۆش و خرۆشی نێردەی بڵاوکردنەوەی فەلەیی گوزارشتکردنێکی دیکە بوو لە ئیمپریالیزمی فەرهەنگی. زۆرجاران دەووترا کە ئاڵا بەدوای خاچدا دێت. نێردەکانی خەڵکی ئەوروپا و وڵاتە یەکگرتووەکان دەیانویست ئاینی فەلەیی لە ئەفەریقا و ئاسیادا بڵاو بکەنەوە، وەك چۆن پێشتر لە ئەمەریکای لاتیندا ئەو کارەیان ئەنجامدا. زۆجاران ئەم نێردراوانە ئەو شوێنکەوتووانەی کە تازە هاتبوونە سەر ئاینی فەلەیی تووشی دەمەقاڵە و بێنە و بەردە دەبوون لەگەڵ لایەنگرەکانی کلتووری خۆجێی. هێزە ئیمپریالییەکان پاشان هێزی سوپاییان بۆ ناوچە خۆجێییەکان دەنارد بۆئەوەی چی وەك هاونیشتمانی و چی وەك هێمای فەرهەنگی ، خۆرئاوا پارێزگاری لە نێردەکان بکەن.کاتێ (ساڵانی ١٩٥٠) نێردەیەکی ئاینی فەرەنسی لە چین بەدەستی چینییەکانەوە کوژرا، ناپلیۆنی سێیەم ئەم ڕووداوەی بۆ بەرپاکردنی شەڕ دژ بە چینییەکان قۆستەوە و لە ئەنجامی سەرکەوتنەکانی فەرەنسادا، ناوبراو مافی وە بەرهێنانەکانی پێ برا.

لەبەر هۆیە فەرهەنگی، ئاینی و نەژادییەکان، ژمارەیەکی زۆر ئیمپریالیست باوەڕییان وابوو کە باڵادەستی خۆرئاوا بەسەر جیهاندا هەتا هەتایە درێژە دەکێشێ. گەلانی خۆرئاوایی تەقەلایان دا کە ئیمپراتۆریەتەکانیان لە ئەندێشەی خۆیاندا هەڵبچننەوە. سەرپاکی کۆمەڵگاکان لە ئەفەریقا و، ئاسیا و ئەمەریکای لاتیندا هەموارکرابوون و لە هەندێ باردا بە تەواوی ڕووخا بوون. بە کردەوە هەموو بارودۆخەکانی وڵاتی ئیمپریالی و خەڵکانی داگیرکراو گۆڕابوون. لە زۆربارودۆخدا هەوڵیاندا بۆ ڕوخاندنی دەسەڵاتی دەرەکی و بەدەستهێنانەوەی دەسەڵات بەسەر چارەنووسی خۆیان، بەڵام لەمەدا سەرنەکەوتن. لەلایەکی دیکەوە بانگەشە فەرهەنگییەکان و دەستدرێژییە خۆرئاواییەکان تەکانیان بە ئاسیایی و هی دیکەشدا بەها نەریتییەکانی خۆیان سەرلەنوێ بەسەر بکەنەوە وپێشنیازی چاکسازی بکەن.

هەندێکجار ڕکەبەرایەتی ئیمپریالیستی ڕکەبەرە خۆرئاواییەکانی بەرەو لێواری جەنگ بردووە. یەکێ لە بارودۆخە ترسناکەکان ساڵی ١٨٩٨ لە ئەفەریقادا نموونەیەکی بەرجەستەی ئەمە بوو. بەریتانیا دەیویست ئیمپراتۆریەتێکی کۆلۆنی دامەزرێنێ و ڕەنگە ویستبێتی ڕێگەیەکی ئاسنی نێو کیشەوەری دابمەزرێنێ ك لە دەوری ئەفەریقاوە بچێت بەرەو میسر، لە (قۆپەوە بۆ قاهیرە)، بەم جۆرەش ئیمپریالیستە فەرەنسییە

بەجۆشەکان خەونیان بە ئیمپرلتۆریەتێکەوە دەبینی کە لە خۆرئاوای ئەفەریقاوە بەرەو کەناری خۆرهەلآت درێژبووبێتەوە. ئەم ڕکابەرییە بوو بەهۆی ڕووبەڕووبوونەوەی یەك سالی ١٨٩٨ لە دنیەکی سودلنی بەناوی فاوودە. قەیرانی فاشوودە نموونەیەکی بەرجەستەی نەتەوەباوەڕی توندڕەو یاخود جینگۆییزم بوو.

وشەی جینگۆییزم لە جینگۆوە داڕێژرلوە کە هۆلێکی بەرە بوو لەو ڕۆژگارەدا کە دەلێ: "ئێمە نامانەوێ شەڕبکەین، بەلأم لە نزیك جینگۆوە، ئەگەر شەڕ بەکەین، کەشتیمان هەیە، پیاو مان هەیە، پارەشمان هەیە". کە لەلایەن ووتارەکانی میدیا جەماوەرییەکانی ڕۆژنامە و گۆڤارەکانەوە هاندەدران، خەلك لە فەرەنسا و بەریتانیای مەزندا بێ هەژمارکردنی کەسی خێراچوون بۆ پشتیوانی کردنی نەتەوەکانیان. (ولأتی من، چی لەسەر هەق بێ، چی لەسەر هەق نەبێ). نە فەرەنسییەکان و نەبەریتانییەکانیش لە کێشمەکێشەکەدا هیچ سەنگیان بۆ سودلنیەکان دانەنا. تەنیا بە تکاکاری دیپلۆماتە میانڕەوترەکان، دووبارە بیرکردنەوەکانی فەرەنسییەکان لە بڕیارکەیان بەرپابوونی شەڕێکی ئاشکرا لەنێوان بەریتانیا و فەرەنسا سالی ١٨٩٨ ڕێگەی پێ گیرا.

لە هەندێك بارودۆخی کەمدا ئیمپریالیستەکان لەپێناو بەرژەوەندی زیاتر لەگەلێ یەك بەشەڕ هاتوون. بۆنموونە ژاپۆن و ڕوسیا لەسەر کۆریا و مەنچوریا بەشەڕ هاتن، بەریتانیەکانیش لەگەلێ هۆلەندییە نیشتەجێبووەکانی خواروی ئەفەریقادا شەڕیان کرد. هەرچەندە کە ئیمپریالیستەکان بۆ زۆربەی پارچەکان ئەوەیان لاباشتر بوو پەنا ببەنەبەر ئەو ڕێکەوتننامانەی بە ڕەنج و ماندوبوونێکی زۆر بەدیدەهاتن، کە تیایاندا ناوچەکانیان تیایاندا پارچە پارچە دەکران وەك لە هەندیك یاری پاوانکاری زەبەلاحدا. بۆ نموونە چوار دەولەت لە کۆنفرانسی کۆلۆنیایی بەرلینی سالی ١٨٨٥ کۆبوونەوە بۆئەوەی بڕیار لەسەر چارەنووسی کۆنگۆ لە ئەفەریقا بدەن، هیچ کۆنگۆییەك لەوێدا ئامادە نەبوو، و نەتەوە ئەوروپیەکان بڕیاریان لەسەر یەکێ لە گەورەترین ناوچەکانی ئەفەریاقدا تەنانەت بێ ئەوەی پرس بەخەلکی ئەم هەرێمە بکەن کە چیان دەوێت.

ئەگەر چی هەرگیز هێزە گەورەکان بەگشتی لەسەر بانگەشەکانی ئیمپریالیستی بەشەڕ نەهاتبوون، ژمارەیەکیان درێژەیان بە گلەیی و گازاندەکادن دەدا. لەمانە بەشێوەیەکی تایبەت ژاپۆن و ئەلمانیا و ڕوسیا و ئیتالیا باوەڕیان وابوو کە دەستیان بەو داراییە نەگەیشتووە کە پشکی ڕەوای خۆیانە و هەولیاندەدا ڕێگەیەکی دیکە لەپێناو زۆرترکردنی پشکە جیهانییەکانیان بدۆزنەوە. هەندێك نەتەوەی وەك بەریتانیای مەزن، فەرەنسا و ولأتە یەکگرتووەکان بەشێوەیەکی سەرەکی بەو ناوچانەی خستبوویانە سەر قەلەمڕەوەکەیان و ئەو ناوچانەی خستبوویانە سەر یەك بۆ ژێر دەسەلأتی ئابووری ناڕاستەوخۆ قایل بوون.

پێشبڕکێیەکانی چەك، سوپاسالاری و هاوپەیمانیەکان

لەم هەوارە پڕ لە قەیرانە نەتەوەباوەڕی و ئیمپریالیستییەدا، نەتەوە گەورەکان بۆ بەهێزکردن ئاسایشی خۆیان دەستیان بە جموجوڵ کرد. چەکە نوێیەکانی ئەو سەردەمەیان کەڵەکە کرد، قەبارەی دام و دەستگا سوپاییەکانیان بەرفراوان کرد، هاوپەیمانیەکانیان دروست کرد. سەدەی نۆزدەیەم پروسیا لەشکرێکی گەورەی پێکەوە نا بە سەربازگیری زۆرەملێی ماوەکورت. بەپێی ئەم سیستەمە پیاوەکان دەکران بە سەرباز و مەشق دەدران و پاشان ڕەوان دەکرانەوە سەر کاری سیڤیلی خۆیان. ئەم ڕەوەندە سەربازگەلێکی بە مەشقی دروست کرد کە دەکرا بانگ بکرێن بۆ پەیوەستبوون بە سوپاوە بۆ پێکهێنانی سوپایەکی گەورە و گران لەکاتی هەڵگیرسانی جەنگدا. پروسیا ڕێکخراوێکی ستافی گشتی پێکهێنا کە نەخشەدانان و ئەنجامدانی شەڕەکانی داهاتووی لە ئەستۆدا بوو. ساڵی ١٨٧٠ سوپای بەرفراوانی پروسیای پێکهاتووی سەربازگیری کراوە زۆرە ملێیەکان و یەدەگەکان کە بە مەشق و تفاق و ڕابەرایەتییەکی باشیان هەبوو، سوپا بچووکرتەکەی فەرەنسای شکاند کە پێکهاتبوو لە سەربازە پیشەییە ماوە درێژەکان. فەرەنسا بەهۆی پەند وەرگرتن لە شکستخوادرنەکەی خۆی بایدایەوە سەر سیستەمی پروسیایی و سوپای گەلەکۆیی خۆی پێکهێنا. ئەم جۆرە سیستەمە برێکی پارەی زۆر و زەوەندی گەرەك بوو، و شیرازەی پیشە سیڤیلییەکانی ڕێژەیەکی بەرز دانیشتوانی نەتەوەی دەپچڕاند.

ژاپۆن بۆ پاراستنی خۆی لە ئیمپریالیزمی خۆرئاوایی دەزگایەکی سوپایی لەسەر شێوازی خۆرئاوا دامەزراند و کە جەربەزەییەکەی بە بردنەوەی شەڕەکانی دژ بە چین لە ١٨٩٥ و ڕوسیا لە ١٩٠٥ دا دەردەکەوێت. لەبەرئەم سەرکەوتنانە زیاتر لە هەر لایەنێکی دیکەی بە مۆدێرنبوون و بەدەستهێنانی یەکانی لە کارو بارە نێو نەتەوەییەکان لە خۆراو ز یاتی پێ برا. ژاپۆن ئەمەی بینی کە سوپایەکی جەربەزە ئەنجامەکانی بەدهێنا و لێرە بەدواوە ڕەوتێکی زۆر سوپا سالاری و ئیمپریالی گرتەبەر. لەلایەکی دیکەوە بەریتانیای مەزن و وڵاتە یەکگرتووەکان بە دەریا پارێزرابوون و وەك هەڕەشەی ڕێتێچوو بۆ سەر حکومەتی خۆجێیی بەسوپای‌نەگۆڕی گەورە دەژمێردران. ئەمانە سوپایەکی تا ڕادەیەك بچووکیان هێشتەوە. ئەگەر چی لەگەڵ داهاتنی ١٩١٤ دا هەردوو نەتەوە سەربازی یەدەیکیان دامەزراند و هەردووکیان ئەرکانی سوپایان دروست کرد. بەرزبوونەوە لە سوپادا پێشبڕکێی هێزی دەرباییشی لەگەڵدا بوو. تا ساڵی ١٨٨٠ باری هێزی دەریایی بەریتانی لە هەردوو لایەنی چەندایەتی و چۆنایەتییەوە گۆی بردنەوەی بەدەستهێنا و هێزی دەریایی فەرەنسا لە پلەی دووەمدا بوو. فەرەنسا خوازیاری مەیدانخوازی کردن نەبوو لەگەڵ بەریتانیا، ئەگەرچی ئەڵمانیا دەستی بۆ بەرنامەی دامەزراندنی هێزی دەریایی برد، و وڵاتە یەکگرتووەکان و ژاپۆن بە تەقەلایەکی میانڕەوانەتردا لەدوای ئەمانەوە بوون. ئەڵمانیا و وڵاتە یەکگرتووەکان هەردووکیان،بەخێرایی، لە هەر چوار

لای جیهاندا، پەرەیان بە بەرژەوەندییەکانیان دا و پێویستیان بە هێزی دەریایی بتەو هەبوو، بۆئەوەی ڕێگاکانی گەیاندنی ئازووقە و تفاقیان بپارێزن. ژاپۆنیش هەوڵیدا بەهۆی هێزێکی دەریایی بەتوانا هەرێمی بەرژەوەندی خۆی بپارێزێت. بەریتانیای مەزن ترسی ئەوەی لێ نیشت کە بەرنامەی دامەزراندنی هێزی دەریایی ئەڵمانیا هەر تەنیا بۆ پارێزگاریکردنی بەرژەوەندییەکانی ئەڵمانیا لە دەرەوەی ئەورووپا نەبێت، بەڵکو بۆ هەڕەشەکردن لە بەریتانیاش بێت. لە ئەنجامی ئەمەدا بەریتانیا دەستیکرد بە ئەوپەڕی تەقەلادان بۆ هێشتنەوەی هێزە دەریاییەکەی خۆی لەپێش هی ئەڵمانیادا. ئەم پێشبڕکەی کەشتی جەنگیە پارەیەکی یەکجار زۆر و زەوەندی تێدەچوو و گوشارێکی زیارتی خستە سەر ئابووری هەردوو نەتەوە. پێشبڕکێی چەك، کە وەك هۆکارێکی خۆپاراستن لەبەرامبەر گرژی دەست پێکرا، تەنیا تەنگژە و ترسێکی زۆرتری دروست کرد، کە پاڵی بە ڕابەرە نەتەوەییەکانەوە نا بگەنە ئەو ئەنجامەی کە ئەگەر شەڕ هەڵبگیرسێ ئەوا باشترین خۆپاراستن دەستپێشخەری کردنە لە هێرشی سوپاییدا.

لەسەر بنچینەی شەڕەکانی ئەسترۆ- پروسیایی و فرانکۆ- پروسیایی لە ساڵانی ١٨٦٦ و ١٨٧٠، نەخشەدارێژە و پایە ئەوروپییەکان باوەڕیان وابوو کەشەڕی داهاتوو ماتۆڕێکی ئاشکرای کەمخایەن دەبێت، ئەگەرچی شەڕی ناوی وڵاتە یەکگرتووەکان و شەڕەکانی باڵکان دەریان خست کە شەڕی داهاتوو دەکرێ شەڕێکی درێژخایەنی نێو سەنگەر و شەنگبەر بێ.

زۆرکردنی سوپا و هێزی دەریایی سەرهەڵدانی سوپاسالارییشی لەگەڵدا بوو، ئەم تێگەیەی ئەوە دەگەیەنێ کە لایەنە سوپاییەکانی کۆمەڵگە لە هەموو لایەنەکانی دیکە گرنگترن. فردریك فۆن بێرنهاردی، کە ژەنەراڵێکی ئەڵمان بوو، کاریگەری چارلس داروین لەسەری ڕەنگ دەداتەوە، کە نووسیوویەتی شەڕ پێویستیەکی بایۆلۆژییە، یاسایەکی سروشتە. بۆچوونەکانی داروین پاڵیان بە لیۆ تۆلستۆی نووسەری ڕوسیاییەوە نا ساڵی ١٩٠٦ بەژارەی خۆی دەردەبڕی بەرامبەر ئەوەی کە (زانست بڕیاری لەسەر ئەوە داوە کە ململانێ و دوژمنایەتی هەمووان لەلایەن هەمووانەوە، پێویستە، لەچارنەهاتووە و هەلومەرجێکی چاکە بۆ ژیانی مرۆ). فردریك نیچە نووسیوویەتی: تۆ دەڵێی ئەمە هۆیەکی باشە کە تەنانەت شەڕیش بە پیرۆز دادەنێ؟ من پێت دەڵێم ئەمە شەڕە کە هەموو هۆیەك بە پیرۆز دادەنێ. شەڕ و ئازایەتی لە خۆشەویستی هاوسێ زیاتر شتی مەزنیان ئەنجامداوە.

داکۆکیکارەکانی سوپاسالاری جەختیان لەسەر ئەوە کرد کەجەنگ شتێکی باشە لەبەرئەوەی کە چۆنایەتییەکانی ئەو ئەمەکداری و هاوکری و ئازایەتییە گیانبەختییەی پێش خستووە کە بۆ پەرەسەندنی مرۆڤایەتی گرنگ بوون. سەرکۆمار تیۆدۆر ڕۆزفێلت و قەیسەر ولیهیلمی دووەم هاودەنگ بوون لەسەرئەوەی

جەنگ کاریگەری وبوژاندنەوەی لەسە دلنیشتوولنی گەلدا هەیە. ڕۆزفێلت دەڵێ: هەر سەرکەوتنێکی ئاشتی هێندەی سەرکەوتنە شکۆدارەکانی جەنگ مەزن نیە. نووسینە نیشتمانییە ژاپۆنییەکان بەچاوی شکۆوە دەڕوانێنە جەنگ و جەنگاوەرەوە. ئەم هەڵوێستە ژاپۆنییە زۆر قەرزداری هەستی هاوپشتی و گیانبەختی ناو سامۆرایە (چینی پێشووی جەنگاوەری کە پشتاوپشت لە باوانەوە بۆ نەوە دەمایەوە)، کە ڕێسا و ڕەفتاری ئەندامەکانی پێی دەگووترا بەشیدۆ واتە ڕێگەی جەنگاوەر باڵی بەسەر ڕەفتاری سامۆرایدا کێشابوو. خزمەتکردن و ئەمەکداری و حەزکردن بە مردن لەپێناو گەل و دۆز فێر دەبوون. رابەرە ژاپۆنییەکان پشتیان بە ڕێزە نەریتییەکان بەست کە لەلایەن سەرانی سامۆرایەوە قەبووڵ کرابوون، بۆ گۆشکردنی هاووڵاتیانی ئاسیایی بە هەمان ئەو بەهایانە.

وێڕای پەرەدان بە هێزە سوپاییەکانیان، وڵاتە ئەوروپییەکان هەوڵیاندا لەڕێگای هاوپەیمانێتیەکان و هاوسەنگی هێزی نێوان بلۆکەکانی گەلانەوە بەدەست بهێنن. زۆر لەپێش ۱۹۰۰ ەوە گەلانی ئەوروپی ئەمەیان کردبوو بە بنەمایەکی سەرەکی دیبلۆماسیەت بۆ هاوسەنگکردنی ئابووری و سوپا و هێزی ستراتیژی خۆیان دژ بە گەلانی خەنیم، بۆئەوەی نەتوەی ڕکابەر دەستکەوتێکی بەرجەستەیان نەبێ و دەست بەم دەستکەوتەوە نەگرن بۆ هێرشکردن. بەزۆری هێزێکی گەورە، کە دڵنیا نەبووایە لەوەی لەگەڵ ڕکابەردا هاوتایە هەوڵیدەدا بەهۆی دروستکردنی هاوبەشی لەگەڵ نەتەوەی سێیەمدا هاوسەنگی دروست بکات. بۆنموونە بەریتانیای مەزن بەشێوەیەکی نەریتی بەهۆی سازکردنی دۆستایەتی لەگەڵ گەلانی دیمە لەسەر بنچینەی پەیوەندییە ئابوورییەکانەوە هاوسەنگی هێزی دەهێشتەوە.

هەندێك نەتەوەی دیکەی وەك فەرەنسا و ئەڵمانیای خەنیمە ئەوروپییەکان باوەڕیان وابوو کە ئەمنیەتەکەیان دەکەوێتە سەر پێهێنانی هاوپەیمانییە سوپاییە فەرمییەکان. هەر دوو گەل سیستەمێکی هاوپەیمانیان پیادە کرد کە بۆ ترساندنی دوژمن لە هێرشکردن دانرابوون، ئەگەر شەڕ هەڵبگیرسایە هاوپەیمانەکان دەخرانە سەر هێزی سوپاییان. نەتەوە بچوکترەکان کەمجار ڕێ‌ڕ'وی هاوسەنگی هێزییان بەکاردەهێنا بۆ پارێزگاری کردنی خۆیان لە نەتەوە بەهێزترەکان. ئیمپراتۆری عوسمانی کە پێی دەوترا پیاوە نەخۆشەکەی ئەورووپا، بۆماوەی چەندان دەیە بەهۆی هاندانی مێملەکان دژ بەیەك بەربەستی لە بەردەم ڕوسیا و هی دیکەدا دادەنا کە قەڵەمڕەوەکەی نەگرن، بەمجۆرە، کاتێك ڕوسیا کەوتە بیری بەرەو گۆڕ ناردنی پیاوە نەخۆشەکە، بەریتانیا لەترسی ئەوەی کە شکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بەدەستی ڕوسیا پارسەنگی هێز لەناوچەی دەریای ناوەڕاست تێك بدات، ویستی پیاوە نەخۆشەکە بە زیندوویی بمێنێتەوە. بەهۆی ئەمەوە عوسمانیەکان توانیان خاکێکی زۆر و زەوەندلەژێر قەڵەمڕەوی خۆیاندا بهێڵنەوە کە ئەگەر ئەمە

نەبوایەوە بەرامبەر بە گەلە بەهێزترەکان لە دەستی دەچوو. هەر بەم جۆرەش چین پەنای بردە بەر ستراتژییەتی و بەکارهێنانی بەربەرییەکان بۆ دەستگرتن بەسەر بەربەرییەکان، لە هەوڵی هاندانی گەلانی خۆرئاوایی دژ بەیەك و دژ بە ژاپۆن. تایلەند هەر سەربەخۆ مایەوە چونکە وەك بەربەستە دەوڵەت ( buffer state) لەنێوان بۆرمای بەریتانی هیند و چینی فەرەنسادا هەڵکەوتبوو. هەر بەو شێوەیە ئیمپراتۆرییەتەکانی ئەسیوپیا دەسەڵاتی خۆیان بە بڵاوکردنەوەی ئەو بیرۆکە دەپاراست کە ئەگەر نەتەوەیەکی ئەورووپی دەست بەسەر ئەسیوپیادا بگرێت ئەوا پارسنگی هێز لە ئەفەریقادا تێك دەچێ.

بیرۆکەی هاوسەنگی هێز لە زەمینەیەکی سەرتاسەری بەکارهێنرا. بەریتانیای مەزن لەترسی گەشەکردنی توانای ئەڵمانیا لە ئاسیای خۆرهەڵات هاوپەیمانیەکی ڕەسمی دەگمەنی لەکاتی ئاشتی لەگەڵ ژاپۆندا بەست. بەریتانیا ژاپۆنی جێهێشت سەیری ئەڵمانەکان بکات لە ئاسیای خۆرهەڵات، هێزەکانی خۆی کۆکردەو بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی نەیارەکانی لە هەر شوێنێکی دیکەی جیهان، بۆ نموونە ڕوبەڕووبوونەوەی ڕوسیا لە ئێران.

هەندێکجار هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی هاوسەنگی هێز بۆتە هۆی بەرپابوونی جەنگ نەك پاراستنی ئاشتی. گەلان دڵیان هەر بەوە دانەدەکەوت کە هاوسەنگی هێز لە هەموو بوارە جۆربەجۆرەکانیدا (سوپایی، ئابووری، دیپلۆماسی) بهێڵنەوە، بەڵکو خەباتیشیان کرد بۆ گۆڕینی ئەم هاوسەنگییە بە قازنجی خۆیان. لە ئەنجامی ئەمەدا چەمکی هاوسەنگی هێز بوو بە سەرچاوەی ڕکەبەرایەتەکی ئابووری وسوپایی و هەرچی زیاتر ماڕپێچییانە و لە ئاکامیشدا بوو بە سەرچاوەی جەنگ.

هاوپەیمانەکان کە بە حیساب بۆ پێشگرتن بە جەنگ هێندرانە کایەوە، بە کردەوە هەڕەشەی هێنانە کایەی ئەو جەنگانەی کرد کە لەوانە بوو ئەگەر ئەمان نەبوونایە ڕوویان نەدابا.

ئەو گەلانەی پشت ئەستوور بوون بە هاوپەیمانەکانەوە زۆرجار بەشێوەیەکی توندوتیژ لەوە ڕەفتاریان دەکرد کە ئەگەر تەنیابان لە هەندێك باروذۆخدا، وەك ئەوەی کە لە هاوینی ١٩١٤ گەلانی ئەورووپی لە ئەڵمانیا و فەرەنسا بەهۆی سیستەمی هاوپەیمانی هاوپەیمانەکانیان والێکرد کە مل بۆ سازش نەدەن، بەمجۆرە هەلومەرجێکی ترسناکیان دەهێنایە ئاراوە.

لە وەڵامدانەوە بەو کەشەی تەنگژە نەتەوەباوەڕییەکان کە ئاماژەیان بە جەنگ دەکرد خەڵکێکی زۆر بایەخان بە پەروەردەکردنی گیانی هاوکاری نێو نەتەوەیی دا بۆ سەقامگیرکردنی ئاشتی. نوێنەرگەلێك لە کۆنفرانسی ئاشتی نێو نەتەوەیی لە هاگ لە هۆڵەندە لە ساڵی ١٨٩٩ و ١٩٠٧ دیداریان سازدا کە تێیدا لەسەر گەلاڵەکانی چەك داماڵین، تەکنیکەکانی داوەری نێو نەتەوەیی کاریان کرد و دادگای هاگیان دامەزراند بۆ داوەریکردنی کێشمە کێشەکان. ئامادەیی دادگا کە بووە خۆی ئەوەی ژمارەیەك لە گەلان

کێشەکانیان لەڕێگەی داوەرییەوە چارەسەر بکەن. بزاوتی ئاشتی کەڵکی لە بەشداریکردنی کەسایەتییە بەرجەستەکانیش وەرگرت.

ئەلفرێد نۆبڵ، داهێنەری دینەمێت خەڵاتی نۆبڵی بۆ ئاشتی دانا، یەکێك بوو لەو کەسایەتیانە. ئەندرۆ کارنێجی، کە بازرگانێکی ئاسن و ستیلی زۆر دەوڵەمەند بوو خەڵاتی کارنێجی دانا بۆ ئاشتی نێو نەتەوەیی و باڵەخانەی ئاشتی لە هاك بونیاد نا. هەرچەندە کە بزاوتی ئاشتی نێونەتەوەیی لەچاو تەوژمی دوژمنکاری نەتەوەباوەڕی کزبوو. دادگا تەنیا کێشو بێ بایەخەکانی وەك پرسەکانی سنوری تەکنیکی دەخرایە بەردەست. لەکاتێکدا نەتەوە گەورەکان درێژەیان دا بە تەرخانکردنی وزەی خۆیان بۆ پێشخستنی دەزگاکانی شەڕ.

رەوتە فەرهەنگییەکان

لە خۆرئاوا، ژمارەیەکی زۆر شێوازی نوێی گرنگی گوزارشتکردن لە ئاین و وێژە و هونەردا بەرپابوون. فەرهەنگە نا خۆرئاواییەکان بەهۆی بەیەکگەیشتنی لەگەڵ خۆرئاوا تا چەند ڕادەیەك جیاواز هەموار کران. فەرهەنگە ناخۆرئاواییەکانیش شوێن پەنجەیان هەبوو بەسەر خۆرئاواوە، بەڵام بە ئەندازەی کاریگەری ئەو لەسەر ئەم نا.

بەر لە یەکەم جەنگی جیهانی، خۆرئاوا دووبەرەکیەکی یەکبینەی نێوان سکۆلاریزم و ئاینە نەریتییەکانی بە خۆیەوە بینی، سکۆلاریستەکان (ئەوکەسانەی تاڕادەیەکی زۆر نەخشی کەنیسە و ڕێوڕەسمەکانی لەناو کۆمەڵدا بەرتەسك دەکەنەوە) لە ئەوروپا و وڵاتەیەکگرتووەکاندا زۆربە توندی دژایەتی پێگەی هەڵاوردەی کەنیسەی فەرمییان کرد. گۆڕانە زانستی و تەکنۆلۆژییەکان، و بەشارستانیبوون ئەلگو کۆنەکانی ژیانیان تێکدا، کە لەبەرامبەردا کاریان کردە سەر دابە ئاینییەکان و بیروباوەڕەکان. وێڕای جیاوازییەکانیان، بیرۆکەکانی داروین، مارکس، نیچە و فرۆید هەموویان بەگژ سەرلەبەری یاخود لایەنێکی باوەڕە ئاینییە لەمێژینەکاندا چوون.

هەندێ کەسایەتی هەوڵیاندا لەناو چوارچێوەی جوانی و فەلەبیدا باوەڕە ئاینییەکان لەگەڵ هەندێك لە کاریگەری و بیرۆکەکاندا بگونجێنن. چاکسازی جوانی و لیبراڵ پرۆستانتیزم دوو ڕەوت بوون لەم کاردانەوانە، بەڵام جووە ئۆرۆدۆکسەکان و کوێر باوەڕە پرۆستانتەکان کەمتر ئامادەی سازش بوون. کەنیسەکانی کاسۆلیکی و ئۆرسۆدۆکسیش بەزۆری بەرامبەر بیرۆکە نوێیەکان بەجۆش نەبوون.

ناکۆکییەکانی دیکەی ناو فەرهەنگی خۆرئاوا جیاوازییەکانی ناو هزرمەند و هونەرمەندەکان بوو، لەبارەی شێوەی بینین و پیشاندانی ئەو جیهانەی لە دەوروبەریان و لەناخیاندایە. لە دەیەکانی ڕاستەوخۆ پێش ١٩١٤.

كەسانێكی زۆر دەستیان كرد بە لێپێچانەوەكردن زاتیەتی ڕێبازێكی بابەتی و زانستی و وردی عەقڵانی ڕاستی كرد. تیۆرییەكەی پەیوەندیداری ئەنیشتاین وادەركەوت كە نكوڵی لەجێی متمانەبوونی زانست بكات. فەیلەسوفی فەرەنسی هێنری بێرگسۆن جەختی لەسەر ئەوە كرد ڕاستی بەچاوی دڵ پەی پێدەبرێت نەك لەڕێگەی بەڵگەوە، فرۆید و لەپێش ئەویشدا نیچە پێیان لەسەر نەخشی هاندەری ناهۆشەكی و نائاگایی داگرت. نوسەران و هونەرمەندان زۆر بە گومان بوون لە دەربڕینی هونەرییانەی ئەو شێوازە ڕیالیزمییانەی لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمەوە باڵادەست بوو و پابەندبوو بە ڕێبازێكی زانتی بابەتی.

هونەر، موزیك و وێژەیەكی نوێ لەم پرسینەوەیە پەیدابوون، هەروەها لە ڕێگا نوێیەكانی ڕوانین و وێنەكێشانی جیهانی دەرەكی و ڕاستی ناوەوەی خۆیان پەیدابوون. هونەری مۆدێرن ژمارەیەك دەربڕینی جیاوازی لەخۆی گرت. لە نیگارە جێكەوتەخوازییەكانی پاوڵ سزانا، ڤینسینت ڤان گوخ، پاوڵ گاوگیون، و گۆگیس سیورات تا ڤۆوڤیزمی هێنری ماتیس، و شەش پالۆگەری پابلۆ پیكاسۆ و ئەبستراكتگەراییەگەی واسیی كاندینسكی. لە موزیكدا ئارنۆڵد كۆنبێرگ گرنگترین داهێنەر بوو. لەنێوان ١٩٠٦ و ١٩٠٩ ناوبراو ئەو شێوازەی قوڵكردەوە كە دەكرێ بە موزكی ناسازی ناوببرێ، ئەو هەنگاوەی وای لە كاندینسكی هونەرمەند كرد بنوسێ كە سكوینبێرگ (گەنجینەكانی جوانی نوێی لە گەڕانی بەدوای پێكهاتەی ڕوانیندا ڕوماڵ كرد)ووە.

لە وێژەدا هۆزانوا هیماگەرەكانی فەرەنسا و ڕوسیای وەك ستیفن مالارمێ و ئەلیكساندەی بلۆك لە بەرجەستەترین مەیدانخوازەكان بوون بەرامبەر بە ڕیالزم و سروشتگەرایی (ناچرالیزم). بەبەكارهێنانی ووشەی وەكو هێما هەوڵیاندا ڕاستییەكی بەواتاتر و ئاڵۆزتر و شاراوەتر دەبخەن.

لەپاڵ گۆڕانكارییەكانی ناوەوەی فەرهەنگی خۆرئاواییدا، ڕەوتێكی بایەخدری دیكە هەبوو كە ناخۆرئاواییەكان هەندێجار دوای دەست و پەنجە نەرمكردن لەگەڵ خۆرئاوادا بەهاكانی خۆیان دەگۆڕی. ئاین و فەلسەفە سەرەكییەكانی ئەفریقا و ئاسیای وەك ئیسلام، كۆنفۆشیانیزم، بودایی و هیندۆسی بەرەوڕووی فەلەیی وسكۆلاریزم و هەندێ لایەنی دیكەی فەرهەنگی خۆرئاوا بوونەوە. لەكاتێكدا هەندێك لە ئاینە خۆجێیەكان لەناوبران یان گۆڕان، بەگشتی باوەڕە جیهانییە سەرەكیەكانی پێش ١٩١٤ كاریگەرییەكی كەمیان خرایە سەر. لە هیندستان چاكسازە هیندۆسەكان هەوڵیاندا ڕێوڕەوشە نەریتییەكان لەگەڵ زانستە هاوچەرخەكان و چەمكەكانی یەكسانی هەموو مرۆیەتی بگونجێنن. هەندێك لە سكۆلارە چینیەكان هەوڵیاندا كۆنفۆشیانیزم ڕاڤە بكەنەوە بۆئەوەی لەگەڵ ئایدیالە خەڵكبارەرییەكان ڕێكبێتەوو. هەرچەندە لە هەردوو باردا ئەم جۆرە تەقەلایانە لەلایەن زۆرینەی ئۆرسۆدۆكسەكانەوە بەرپەرچ درانەوە.

لەکاتێکدا لـە کاریگـەری فەرهـەنگی خۆرئـاوا لەسـەر جیهـانی نـا خۆرئـاوا بێگومـان گـەورەتر بـوو لەپێچەوانەکەوە، هەندێك کاریگەری ناخۆرئاوایی جێگای سەرنجش بەسەر هونەرمەند و نوسـەر و بیرمەنـدە خۆرئاواییەکانەوە هەبوو لەئاکامی فراوانخوازییە ئیمپریالیستییەکان. خۆرئاواییەکان تارادەیەکی زۆر بایەخیان بە فەرهەنگە بیانییەکان دەدا. بڵاوبوونەوەی بەرگی یەکەمی لقی زێڕین بەرهەمی جێمز فرایزەر لەساڵی ١٨٩٠ دا دەرگای کۆمەڵگا (بەرایی)یەکانی لەسەر کەسانێکی زۆر کردەوە کە فرۆید و هی دیکەش لەو کەسانە بوون بە کردەوە بابەتەکەی فرایزەریان بۆ داڕشتنی هەندێك لـە تیۆرییـە دەروونناسییەکان بـەکارهێنا. هەنـدێك هونەرمەندی هاوچەرخی خۆرئاوایی کە جیهانبینییە خۆرئاواییە نەریتییەکانیان بەرپەرچ دەدایەوە کەوتنـە ژێـر کاریگەری هونەری ژاپۆنی، باشوری زەریای هێمن و ئەفریقایی. ڤۆول گۆوگیون بۆنموونـە سـاڵی ١٨٩١ چـووە تاهیتی و کەوتە ژێر کاریگـەری هونـەری ڤینـسینت ڤـان گـوخ، زۆرتـر مـنـەتباری پارچـە داڕینـە نەخـشێنراوە ژاپۆنییەکانی بن پێچ و زەمینەی زوو بوون. پیکاسۆخوێندنەوەی لەسەر ئەفریقایی دەکرد کاتێ، شان بەشـان لەگەڵ گۆرگیس براکە، ساڵی ١٩٠٧- ١٩٠٨کوبیزمی دانا. لەگەڵ داهاتنی ناوەڕاستی سـەدەی نۆزدەدا بـیرە ئاینیەکانی هیندستان دەستی کردبوو بـە کاریگـەری دانـان لەسـەر بیرمەنـدە خۆرئاواییـەکانی وەك ئارسـەر شۆپنهاوەری فەیلەسوفی ئـەڵمانی و ڕالـف والـدۆ ئیمێرسـۆنی نوسـەری ئەمـەریکایی. سـاڵی ١٩١٢ شـاعیری بەناوبانگی ئێرلەندی ولیەم بەتلەر ییتس سەرنجمانی بەرەو نـوراوە هۆزانییـەکانی نوسـەر و بیرمەنـدی ئـاینی هیندی رابیندراناس تاگور ڕاکێشا، کە ساڵانی دواتر بوو بە یەکەم نووسەری نا خۆرئاوایی کە خەڵاتی نۆبڵ بـۆ وێژەی وەرگرت. ییتس لە لێکدانەوەی نوسینەکانی تاگور نوسـیوویەتی: ئـەم نوسـینانە بـەجۆرێکی وا منیـان هەژاند کە چەند ساڵی هیچ شتێك وا نەیهەژاندووم.

سەرچاوە :

The Twentieth century A brief global history, Richard Goff, Walter Moss and Jun- Haw Upshur, Fifth edition, ١٩٩٨.

# زەوی و گەل و یاسا[1]

و. م.ی. کامەران محمد حاجی
کۆلیژی ئەدەبیات-زانکۆی سەلاحەدین

ئەبراهام لینکلن[2] وای دەبینی کەوا هەر نوممەتێك، هەرچەندە تواناکانی بەسەر کۆی بەشەکانیدا زاڵبێت، ئەوا بەرهەمی سێ بنەما یە : گەل، زەوی و یاساکانی.

ئەم سێ بنەمایە لەوڵاتانی جیهانی کۆندا، بەدرێژایی مێژووەکەی،لێك جودا نەبوون،بەڵام وڵاتە یەکگرتووەکان ،هاوشێوەی ئەو نوممەتانەی تریش کەوا لەسەر دەستی نیشتەجێ بووە ئەوروپاییەکان و لەمیانەی شەپۆلێکی گەورەی کەلتوری رۆژئاوا لەکۆتاییەکانی سەدەی پازدەدا دامەزرا ،مێژوویەکی دێرینی نییە تاکو پێی بناسرێ ·بۆیە لەگەڵ دەستپێکی مێژووی ئەمریکی جگە لەزەوی هیچی تر نەبوو·

ئەو زەوییەی کەوا دواتر دەبێتە وڵاتەیەکگرتووەکان شوێنێکی گونجاو بوو بۆ نیشتەجێ بوون، بەپێچەوانەی ئەو زەوییەی کەوا دۆزەرەوەو نیشتەجێ بووە ئەوروپاییەکان یەکەمجار لەسەری پێگەیشتبوون · لەئەوروپای رۆژئاوادا چڕی دانیشتوان لە شارەکان و گوندەکان و لادێیەکان بوو، زەوییە کشتوکاڵییەکان بەشێوەیەکی رێکخراو دەکێڵران و ژیانی کۆچەری سنورداربوو ·هەروەها دارستانەکان دەگمەن بوون ، بۆیە ئەم نەتەوەیە ویستی سوودیان لێ ببینێ ·

ئەمەریکا دەکەوێتە سەر هەمان ئەو ناوچەی گەرمابیەی کەوا کیشوەری ئەوروپای لەسەر درێژدەبێتەوە · چەند چەشنە درەخت و ڕووەك و ئاژەڵی ناسراوی لێ دەژیا، جگە لەجۆرەها ڕووەك و ئاژەڵی نەناسراوی وەکو گەنمەشامی و(راکون) و(زوربان) و ماری زەنگوڵدار·

بەڵام لەپشتی ئەو کەنارە بەردەڵانییەی کەوا ئەمڕۆکە بەویلایەتی ماین (Maine) دەناسرێ و لەپشتی ئەو کەنارە لمینیە فراوانەش کەوا نزیکەی بەبێ پسانەوە لەنیو هامشایر بۆ مەکسکیۆ و دوای ئەویش درێژ دەبێتەوە، دەشتێکی چۆڵ تازە کەوا دەستی دانیشتوانی، تەنها نەختێك نەبێ، پێنەگەیشتبوو، درێژ دەبێتەوە ·

ئەم دەشتە چۆڵە ڕۆژێك لەڕۆژان دارستانێك بوو، ڕووبەرەکەی لەڕووبەری هەموو کیشوەری ئەورووپا بەسەر یەکەوە زیاتر بوو · کەوا تاویەناو تەنها مێرگ و ڕۆنگ و زەلکاوو کەندەلانە بەردەلانییەکان و لوتکەکانی شاخە ڕووتەنەکان وکێڵگە سووتاوەکانی هیندییەکان دەیانبڕی · ئەم دارستانە لەهێڵی کەنارەوە تاکو دواگرێی میسیسپی دەکشا · لەوێوەش بەبەرامبەر زێ و کەناری جۆگەلەکان بۆ ئەو دەشتە فرلوانانەی کەوا ناوەڕاستی کیشوەرەکەی دادەپۆشی تێپەڕدەبوو ·

ئەم دارستانە زەبەلاحە لەچەشنە داری جیاواز پێك دەهات · لەباکوردا دار سنۆبەرەسپییەکان – کەوا باشترین جۆری تەختە بوو بۆ پیشەسازی دروست کردنی ستونگی چارۆگەو لاتەنیشتی کەشتی چارۆگەدار – لەگەڵ دارستانەکانی تەختەی پتەو لەجۆری دەرەختی ئەسفندان و هەنجیرو ڕەقەدلردا کەوا زەویە نزمەکانیان دادەپۆشی و ئەو داربەڕوو و گوێزانەش کەوا بەسەر لێژاییە وشکە بەرزەکاندا هەڵزنابوون بەدوای یەکدا دەهاتن – چەند گوزێك لەچەشنی سنۆبەری جیاوازیش بەدرێژایی کەناری ئەتڵەسی (لەڕۆژهەڵات – ك.م) بەرەو ناوچە ناوەکییەکان درێژدەبنەوە، لەوێشدا لەلای بانەکاندا بەدارستانەکانی تەختەی پتەو دەگەیشتن ·

کەناری ڕۆژهەڵاتی ئەمەریکای باکوور بەشێوە زەوییە پانەکانی جیا دەکرێتەوە، دەشتی کەناری بەرفراوان لەوێ، بێ ئاستەنگی زۆر، یاریدەی نیشتەجێ بوونی داوە · لەوێ چەند نیمچە دورگەیەکیش دەبینرێت وەکو:کێپ کود(Cape Code) لۆنگ ئایسلاند(Long Island) ، هەروەها چەند کەنارێکی لێك دابڕاویش هەن کەوا تاکو قولایی باشوور درێژ دەبنەوە، ئەمەش بۆتە هۆی دابین کردنی بەندەرێکی ئاسوودە بۆ هاتنی کەشتییە پێشەنگییەکان بۆ ئەوێ · هەروەها بەهۆی فرەیی چەند زێیەکی وەکو:میرماك، چارلز، تایمز، کونیکتیکەیت، هۆساتۆنیك، هێدسن، رارێتان، دیلاویر، ساکسویماتا، پوتوماك، راباکۆبۆروساڤانا، بەلەمی بچووك لەوێ لەتەنکاوەکان هەبوو دەیانتوانی بگەنە ناوچە ناوەکییە دوورەکان· لەساڵی ١٦٠٩ هێنری هێدسن[٣] – پیاوێکی ئینگلیزی بوو بۆحیسابی هۆڵەندییەکان کاری دەکرد – بەکەشتییەك بەناوی هاف موون(Half Moon) توانی دووری ١٥٠ میل ببڕێت تاکو گەیشتە سەرووی ئەو زێیەی کەدواتر بەناوی ئەوەوە ناونرا (مەبەست لەزێی هێدسنە– ك .م)· بەمەش گەیشتە دوورترین شوێن ئەوەی کەوا ئەمڕۆ بەئەلبانی (Albany) دەناسرێت · گەشتێکی دوورو درێژی لەم جۆرە، بەڕێگای وشکانیدا، مانگێك یان زیاتری پێ دەچوو · بەلام هیدسن – هەرچەند کەوا بەوریایی و لەڕێڕەوێکی ناوی تەسکدا دەڕۆیشت کەپێشتر بەسەری نەکردبۆوە – ماوەکەی بەیەك هەفتە بڕی ·

ئەم زێیانە لەکاتێکدا پێك هاتن کەوا ئاستی دەریا لەم ئاستەی ئێستای نزمتر بوو، بەمەش بەرزبوونەوەی ئاستی دەریا بووە هۆی پڕکردنی ڕێڕگەی زێیەکان لەئاو، دابین کردنی ژمارەیەك بەندەرو بوونیان بەچاکترین بەندەرەکانی سەر کەنارەکانی ئۆقیانووسی ئەتڵەسی باکوور. بەم جۆرە ژمارەیەك لەشارە یەکەمینەکان لەوڵات- بۆستن، نیوپورت، نیو لەندەن، نیویورك، بالتیمۆر،وچارلستون - لەم بەندەرانە بوژانەوە .

کەش و هەوای ئەمەریکای باکوور کەوا نیشتەجێ بووەکان ڕووبەڕووی بوونەوە - وەکو زەوییەکە- ئاسایی و نائاسایی بوو. کەش وهەوای لای ڕۆژهەڵاتی کیشوەرە فراوانەکە کەوا بەسروشتی خۆی لەجۆری کەش و هەوای کیشوەری[4] بوو، بەبەراورد لەگەڵ کەش و هەوای ئەورووپای ڕۆژئاوا کەوا بەهۆی شەپۆلێکی گەرمی هاتوو لەگەڵ شنەبای کەنداو(Gulf Stream) پلە گەرمییەکەی مام ناوەندی بوو، ئەمەش وای دەکرد کەوا وەرزی زستان لەئەمەریکا لە زستانی ئەورووپای ڕۆژئاوا ساردتر بێت ، بەهەمان شێوەش وەرزی هاوینی گەرمتر بوو.

هەردوو پلەی گەرمایی گەورەو بچووکی (بەرز و نزم) یتۆمارکراو لە لەندەن لە باکووری هێڵی پانیی پەنجاویەك،دەگەنە ٩٩پلە ودوو پلە (١) بەشێوەیەکی یەك لەدوای یەك ، کەم جار هەیە پلەی گەرمایی دەگاتە ئەم ئاستە . بەڵام پلەکانی گەرمایی تۆمارکراو لەنیویۆرك لەباکوری هێڵی چل و یەك (چل و یەکی باکور- ك.م) ،١٠٦ پلەو ١٥ پلەی یەك لەدوای یەك بوو، زۆر جار گەرمایی دەگەیشتە ئەم دووپلەگەورەیە . وەبەبەراورد لەگەڵ ئەورووپا وەرزەکانی زستان لە نیو ئینگلاند[5] و هاوین لەبەشی باشوردا زۆر درێژە .

ئەم زەوییە بەرفراوانەی کەوا پێی دەگوترا (ئیندیانز- Indians) بەفەرەنسی(Les Indian)، بەئیسپانیش لوس ئیندۆس(Los Indios) لەدانیشتوان چۆڵ نەبوو . ئەمە سەرەڕای پێنەزانینی دۆزەرەوە ئەورووپاییە پێشەنگەکان بەم ناوچەیە، کەوا ئەوکاتە وایان زانی لەسەر تخوبی ئاسیان - لەڕاستیدا دانیشتوانە ڕەسەنەکانی ئەمەریکا لەهەموو لایەکی کیشوەرەکە دەژیان، ژمارەشیان سەبارەت بەڕووبەری زەوییەکان و بەبەراورد لەگەڵ ئەورووپا، کەم بوو . ناکرێ بگەیتە ئەنجامێکی وورد سەبارەت بەژمارەی دانیشتوان لەوێ و، خەمڵاندنەکانیش وەکو یەك نین - ژمارەی دانیشتوانی هیندییەکان لەبەشی ڕۆژهەڵاتی ئەمەریکای باکوور لەنێوان ملیۆنێك و دوو ملیۆن کەس بووە لەسەردەمی کۆلۆمبوس[6]دا . ئەم ژمارەیەش - هەندێك جار بەشێوەیەکی یەك لەدوای یەك - کەمی کرد، کاتێك کەوا بەهۆی زیاتر پەیوەندییان بەئەورووپاییەکانەوە، بەر لەنیشتەجێ بوونیان ، نەخۆشی وایان بۆهات کەوا نەیاندەتوانی خۆیانی لێ بپارێزن .

هیندییەکان، هەتا بەپێوەری جیاوازی ئەوروپاییەکانیش، تەنها لە یەك شارستانیەتدا بەشدار نەبوونە[٧]، بەڵکو لەگەڵ سەرەتای دۆزینەوە ئەوروپاییەکاندا دووسەدو پەنجا زمانی زیندوو لەئەمەریکای باکوور هەبوو(لەنێوان دووهەزار زمان لەنیوەی ڕۆژئاوای گۆی زەوی هەمووی) · هەتا ئەم کۆمەڵانەی دانیشتوانیش لەئەمەریکای باکوور کەوا بەیەك زمان ئەدوان ئەوا بۆ چەند هۆزێکی بچووکی بەگژیەکداچوو دابەش ببوون و، بەردەوامیش لە دەستەویەخەوەستاندا بوون ·

یەکێك لەوانە هیندییەکانی دۆڵی میسیسپی بوون، ئەوانەی کەوا لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە لەسایەی چەند سەرکردایەتیەکدا ڕێکخرابوون وکشتوکاڵیان کردبوو بەسەرچاوەی سەرەکی هێزو گوزەرانیان · بەڵام هیندییەکانی کەناری ڕۆژهەڵات – ئەوانەی کەوا لەشێوە ژیانی خێڵەکایەتی دەژیان – ئەوانە لەبنچینەدا لەڕاوچییەکان و خۆراك کۆکەرەوەکان(٨) بوون · کەمتر لە ١٪ی ئەوزەوییانەی بۆ کشتوکاڵکردن شیاو بوون، لەبەشی ڕۆژهەڵاتی ئەمەریکای باکوور، بۆ کشتوکاڵی بەرووبوومی خۆراکی بەکاردەهات · وەبەپشت بەستنیان بەشێوازی سووتاندنی زەوییەکان، هیندییەکان توانیان کشتوکاڵی گەنمەشامی و کولەکە و پاقلە لەپەڵەزەوییەکدا بۆماوەی چەند ساڵێك چێ بکەن، ئینجا دوای نزمبوونەوەی بەرشتی پەڵە زەویە کۆنەکە، بۆ پەڵە زەوییەکی نوێ بگوێزنەوە ·

بەزمانی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا، هیندیە ڕۆژهەڵاتیەکان بۆ چاخی بەردینی نوێ دەگەڕێنەوە، کەوا ئامرازەکانیان پێشکەوتووبوو، بەڵام کانزاکانیان نەدەناسی · خاوەنی شارستانیەکی پێشکەوتووبوون، سەدان جۆری کەرەستەو تەکنەلۆژیای جیاوازیان بەیارمەتی ئەو هونەرە بەکارهێنابوو کەوا پاش دووسەدە جێمس فیلنیمور کۆپەر[٣] ناوی ((هونەری دارستانی پایەبەرز))[٣]ی لێ نابوو · ئەم هونەرانە کەوا بەدرێژایی هەزاران ساڵ لەژیان لەوەی زەوی پێشکەشی دەکرد – ئەوەی کەوا دانیشتوانە ڕەسەنەکان بۆ نیشتەجێ بووەکانیان گواستەوە – یارمەتی ئەم هیندیانەی دا بۆ خۆراگری زیاتر لەجارێك بەرووی کارەساتەکاندا، بەڵکو هەروەها بۆ ڕووبەڕووبونەوەی مەترسیەکانی قرتێکەوتن و لەگەڵ تێکۆشانی بەردەوامیان بۆ دۆزینەوەی جێ پێیەك بۆخۆیان لەجیهانی نوێ (New World) لەو شوێنانەی پێشتر بەسەریان نەکردبۆوە ·

بەلام ئەو شارستانیەتەی کەوا نیشتەجێ بووەکان لەگەڵ خۆیاندا هێنایان و، لەشوێنی شارستانیەتی هیندیەکانیان دانا ،بەهۆی پێشکەوتنە تەکنەلۆژیایەکەیەوە ، بەسەر ئەوەی دواییاندا زاڵ بوو، ئەم هۆکارە گرنگەش دەبێتە هۆی ڕووخانی شارستانیەتی هیندییەکان · هیندیەکان لەسەر بەکارهێنانی ئەو بەرهەمە زیاتر پێشکەوتوانە کەوا ئەوروپاییەکان لەگەڵ خۆیاندا هێنایان، وەکو کەرەستە کانزاییەکان و جل و بەرگ و چەکە ئاگرینیەکان ، خۆیان ڕاهێنا· ئیتر جێگایەك بۆ دەست ڕەنگینی هیندییەکان لەبەکارهێنانی

کەرەستە سەرەتاییەکانیان نەمایەوە ٠ پاش ماوەیەکی کورت، ڕێگای دەریاز بوونی هیندییەکان، لەئاڵوگۆڕی بازرگانی بۆ دەستکەوتنی پێداویستیەکانیان و بەمەرجی وەها کەوا جەوری زیاتریلەگەڵ بوو، نەمایەوە ،ئیتر بەم شێوەیە سەروەری ئابووری خۆیان لەدەست دا ٠ کۆتـایی سـەروەری ئـابووری سـەرەتای کەمبوونـەوەی سەروەری سیاسی و پاشماوەی ئەو بنەمایانەشی لەگەڵ خۆیدا هێنا کەوا شارستانیەتەکەیانی پێ جیا دەکرایەوە ٠

لەگەڵ دەرکەوتنی سەدەی شازدەدا ،بەهۆی گەورەترین پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیا لەمێژووی مرۆڤایەتی کۆتاییان بەچاخەکانی ناوەڕاست لەئەورووپا هێنا ودەرگایان لەپێش بەنیشتیمانکردنی جیهانی نوێ والاکرد ٠ داهێنانی چاپخانە[9] پشکداری کرد لەکەمکردنەوەی تێچونەکانی بەرهەمهێنانی کتێب و ئینجا مەعریفەت ٠ لەگەڵ ناوەڕاستی سەدەی پازدەدا لەهەموو کیشوەری ئەورووپادا، تەنها ٥٠هەزار کتێب هەبوو کەوا زۆربەیان لەژێر چاودێری کڵێسا دابوو، کە ئەو کاتە سەرپەرشتی سەر زانکۆکانیشی دەکرد ٠ کەچی لەگەڵ کۆتـا یـی هەمان سەدە ژمارەی کتێبەکان لەئەورووپا گەیشتە١٠ملیۆن کتێب، بەمەش شەبەنگێکی بەرفراوانی لەچەند ڕێ بابەت بەدەست هێنا کەزیاتریان لەبواری تەکنەلۆژیا و کشتوکاڵ بوون ٠ گەورەترین بەشی ئەم کتێبانە لەدەستی توێژی بازرگانە دەوڵەمەندەکان و چینی ئورستوکراتی دەرەبەگ دابووە لێرەوە قۆرخکاری کڵێسا بۆزانست و مەعریفەت تێك شکاو، پاشانیش لەگەڵ بڵاوبوونەوەی شەپۆلی چاکسازی پرۆتستانتی لەزۆربەی ناوچەکانی بەشی باکوری ئەورووپا قۆرخکارییەکەی بۆ ئایین لەدەست دا ٠ ئەمەش بوو پلێتەی جەنگێکی داگیرساند کەوا زیاتر لەسەدەیەك بەردەوام بوو ٠

بەڵام داهێنانە گەورەکەی تر، ئەوەی سەدەکانی ناوەڕاست بەخۆیەوە بینی، بریتی بوو لەکەشتی چارۆکەداری ئامادە بۆ هەڵستان بەگەشتی دوورو درێژ لەئۆقیانووسدا ٠ لەدەوروبەری ساڵی ١٤٠٠ (سەرەتای سەدەی پازدە — ك.م—) زۆربەی کەشتیەکانی ئەورووپا لەجۆری کەشتی بچوك بوون و، یەك چارۆگەیان هەبوو،وەکو ئەو جۆرەی کەوا (ویلیام)ی داگیر کەر نزیکەی بەر لە چوار سەد ساڵ، بەهۆیەوە کە ئاڵی بەرەو ئینگلترا بڕی ٠ کەچی ساڵی ١٤٥٠ کەشتی گەورەتر لەڕووی قەبارەوە کەوا چەند چارۆگەیەکیان هەبوو کەلەهەندێکیان دەگەیشتە چوار چارۆگە، بەدیارکەوتن ٠ ئەم کەشتیانە گەشتی دەریاییان بۆ پشت ئەو سنوورەی جیهان ئەنجام دەدا کەوا ئەوکات لەلایەن ئەورپاییەکانەوە ناسرا بوو ٠

لەوکاتەدا گەشتی دەریایی لەپشت سنوورە نەناسراوەکان پەیدا بوو ٠ ئەوە بوو تورکەکان لەساڵی ١٤٥٣[10] دەستیان بەسەر قوستەنتنیەی پایتەختی کۆنی ئیمپراتۆریای ڕۆمانی ڕۆژهەڵاتدا گرت ٠ بەم شێوەیە هێزێکی موسڵمان دەستی گرت بەسەر ئەو ڕێگا بازرگانییانەی بەرەو ڕۆژهەڵات دەچوون و باجی سەپاندە

سەر هەموو ئەو شمەکانەی کەبەم ڕێگایانە ڕەت دەبوو کەوا لەژێر دەسەڵاتی دابوون . هەروەها تورکەکان دەستیان کرد بە فراوانخوازی بەئاراستەی ئەورووپا خۆشی و،لەشکرەکەیان لەگەڵ ناوەڕاستی سەدەی شازدەدا گەیشتە دەروازەکانی ڤیەننا[11] . ئەوکاتەش مەسیحیەت هەستی بەوە کرد بۆتە ئامانجێکی وا کەوا پێشتر لەوەتەی چاخەکانی تاریکی[12] بەر لەدەورووبەری سەدساڵێك ڕووچاری نەبووبۆوە .

کەچی بەهۆی کەشتی چارۆگەدارەوە، ئەورووپاییە ڕۆژئاواییەکان سوڕانەوەیان بەدەوری ناوچەکانی دەسەڵاتی موسڵمانان تەواو کرد . ئەو ناوچانەی کەوا ڕێگاکانی بازرگانیان لێوە درێژ دەبۆوە . وەلەگەڵ بەکۆتاهاتنی سەدەی پازدەدا پورتوگالیەکان لەلای ڕۆخی باشووری کیشوەری ئەفەریقایی بەدەوری (سەری ئاواتی چاکە)[13] سووڕانەوە، تاکو بگەنە هیند . لەساڵی ١٥١٠ گەیشتنە دوورگەکانی بەهارات( Spice Islands)، ئەمەش سەرچاوەی ئەو بەهاراتەی (وەکو بیبەر) دابین کرد، کەکاتێك دەگەیشتە ئەورووپا قازانجێکی خەیاڵی دەستەبەر دەکرد.

کۆلومبوس، ئەوەی لەژێر ڕۆشنایی ئەو تێورەی کەوا لەسەر بنەمای بیرۆکەیەکی هەڵەدا سەبارەت بەقەوارەی جیهان بونیاد نرابوو ڕۆیشت، بەبێ ئەوەی بزانێ،لەساڵی ١٤٩٢ خۆی لەجیهانی نوێ دۆزییەوە . لەوکاتەی هەوڵی دەدا لەڕێگای گەشتی دەریایی بەڕۆژئاوا بەئاسیا بگات .

پاش ئەوەی ئەوە ئاشکرابوو کەوا کۆلۆمبوس و دۆزەرەوە پێشەنگەکانی تر بەڕاستی جیهانی نوێیان دۆزیوەتەوە، ئیتر هێزە دەریاییە ئەورووپاییەکان کاریان کرد بۆ باربووکردنی هەڵمەتەکانی دۆزینەوە . ئیسپانییەکان یەکەمینی ئەوانە بوون کەوا سەرکەوتنیان بەدەست هێناو لەگەڵ دەست بەسەرداگرتنی مەکسیکۆ، پاش دەساڵانی تریش بەهۆی دەستگرتنیان بەسەر پیرۆ سامانێکی زۆریان بەدەست هێنا . ئیتر بڕێکی یەکجار زۆر لەزێڕو زیوو بەردەبەنرخەکان بەلێشاو گەیشتنەئیسپانیا . لەئەنجامی ئەوەشدا ئیسپانیا بوو بوو بەهێزێکی سەرەوکار لەئەورووپادا . پورتوگالیش لەبەرازیلدا دەستی بەبەرهەمهێنانی شەکر کرد . لەگەڵ ناوەڕاستی سەدەی شانزەدا شەکر بوو بەبەروبوومێکی بەقازانج کەوا چاندنی لەسەر هێزی بازووی کۆیلە بوو . وەلەگەڵ کۆتایی هەمان سەدە فەڕەنسیەکان لەڕێگای زێ ی (لۆرانس)ەوە گەشتی دەریاییان بۆ قووڵایی کیشوەری ئەمەریکای باکوور ئەنجامدا . دەستیان کرد بەئەنجامدانی پڕۆسەی بازرگانی گەورەی فەرو لەگەڵ ئەو هیندییانەی لەکەنارەکانی دەریاچە گەورەکان نیشتەجێ بوون .

لەگەڵ ئەوەشدا،نیشتەجێ بوونی ئیسپانیەکانی لەکەنداوی چیسابیك لێ دەرچێ، کەدواتر لەژێرکاریگەری هیندیەکاندا ناچار بوون دوای ساڵی ١٥٧٢ دەست بەرداری ئەوناوچەیە بن، کەچی کەناری ڕۆژهەڵاتی ئەوەی کەوا ئێستا بە وڵاتە یەکگرتووەکان دەناسرێ، لەدەرەوەی بازنەی گرنگی پێدان دابوو .

نزیکی زەوییەکان لەناوچەکانی باکوور، ڕێگای بەچێکردنی کشتوکاڵی بەرووبوومی ناوچە خوولگەییەکانی،وەکو شەکر، نەدەدا، هەروەها نزیکی لەناوچەکانی باشووریش واتای مەحاڵ دەست کەوتنی فەروی باشی دەگەیاند . بەڵگەش لەسەر بوونی کانزای بەبەها نەبوو .

لەساتەکانی لێکۆڵینەوە لەبارەی ڕێڕەوێکی دەریایی لەلای باکووری ڕۆژئاوا، ئینگلترا ئەو پرۆسانەی دۆزینەوەکانی باربوو کرد کەوا جیوفانی کابووت (ئیتالی بوو لەنێوەندە ئینگلیزیەکاندا بەناوی جۆن کابوت ناسرابوو)، ئەنجامی دەدا، بەلام لەمیانەی پرۆسەکانی پێشبڕکێ بۆ سوود بینین لەخێرو بێرەکانی جیهانی نوێ لەڕێگای نیشتەجێ بوونەوە، گەشتەکانی کابووت لەرووی کاتەوە دواکەوتوو بوون . کەچی ئەمە خاڵی دەستپێکی پێشبڕکێ بوو . ئەوە بوو لەساڵی ١٥٨٥ و، جارێکی تریش لەساڵی ١٥٨٧، سێر والتەر رالی (Walter Raleigh) هەوڵی دامەزراندنی نشینگەیەکی لەرونوك ئایلاند لەئەلبیمەیرل ساوند (Albemarle Sound) دا، ئەو ناوچەیەی کەوا ئێستا نۆرپ کارولاینا (North Carolina)ی پێ دەگوترێ . ئەم نشینگەیە نەما، جگە لەنامەیەکی نهێنی واتا کەلەسەر قەدی درەختێك هەڵکەندرابوو هیچ شوێنەوارێکی تری لەپاش بەجێ نەمابوو[14]، کەچی ئینگلترا پاشی بیست ساڵ گەڕایەوەو، ئەمجارەیان سەرکەوتنی بەدەست هێنا .

چاکەی دامەزراندنی ئەو نشینگەیەی دەکەوێتە جێمس تاون بۆ حکومەتی ئینگلیزی ناگەڕێتەوە، بەڵکو بۆ کۆمپانیایەکی بازرگانی تایبەت .

داهێنانە ماددیەکان، وەکو چاپخانەو کەشتی چارۆگەدارلەلایەن مێژوونوسانەوە گرینگییەکی گەورەیان پێ دراوە، بەلام داهێنانە فیکرییەکان گرنگیان لەداهێنانە ماددیەکان کەمتر نەبوو . دوا داهێنانە فیکرییەکانی سەردەمی ڕێنیسانس (ئەوانیش کەتۆماری ژمێریاری یەکانگیرو دامەزراوەی تایبەت بوون) ڕۆڵێکی گرنگیان لەپەرەسەندنی شارستانیەتی ئەورووپایی لەجیهانی نوێدا بینی، بەتایبەتی لەم وڵاتەی ئێستا کەبەوڵاتە یەکگرتوەکان دەناسرێت .

ژمێریاری لەوەتەی سەردەمی بەرەبەیانی شارستانیەتی لەوڵاتی نێوان دووڕووبار ناسرابوو . داهێنانی نووسینیش لەڕاستیدا – ئەمەش نمونەیەکی تایبەتمەندی جیاکەرەوەی شارستانیەتە – بۆ پاراستنی دانراوەکان بوو . بەلام ژمێریاری بەدرێژایی هەزاران ساڵ پێشکەوتنی گەورەی بەخۆوە نەبینی، واتە تاکو دەرکەوتنی شێوازی پێکەوەلکاندنی تێ نووسەکان(مسك الدفاتر) بەبەکارهێنانی تۆماری یەکانگیر[4] لەئیتالیا لەسەدەی پازدەدا . تۆماری یەکانگیر ئاسانکاری زۆری بەخشی لەبەدواداچوونی هەڵەکان و پێشکەشکردنی وێنەیەکی ڕاستەقینەلەبارەی هەلومەرجی دارایی دامەزراوەکە لەسەر بنەمای ژمارە یەکەمینە

سازیووەکاندا ٠ وەبەهۆی شێوازی پێکەوە لکاندنی تێنووسەکان، لەڕێگای بەکارهێنانی تۆماری یەکانگیرەوە، خەڵکی ڕەشۆکیش توانیان سامانەکانیان لەو پرۆژانە وەبەر بهێنن کەوا لەڕووی جوگرافیەوە دوور بوون، توانیان چاودێری باری پرۆسەی وەبەرهێنانەکانیان بکەن ٠ ئەمەش بوو وای کرد کەوا فێرونیاندو ئیزابێلا[٩] ژمێریار لەگەڵ کۆلۆمبوس لەگەشتەکەی یەکەمیدا بنێرن، تاکو بتوانن دڵنیابن لەدەستکەوتنی بەشی تەواوی خۆیان لەو قازانجانەی بەتەمای بوون ٠

هەروەها کۆمپانیا پشکدارەکانیش[١٠] توانیان لەم هەلومەرجەدا ڕۆڵی خۆیان بسەلمێنن ٠ دۆزینەوەی زەوییە دوورەدەستەکان، لەڕێگای بەکارهێنانی کەشتی یە چارۆگەدارەکان کارێکی مەترسیداربوو – زۆر لەکەشتیەکان دەڕۆیشتن بێ ئەوەی بگەڕێنەوە[١١] ئەمەش پێویستی بەبەکارخستنی بڕێکی گەورە لەسەرمایە، بەپێوەری ژمارەی سەدەی شازدە،هەبوو ٠ زۆربەی گەشتەکان لەوانە بوون کەوا لەلایەن تاج لەو وڵاتانە باربووی دەکردن، ئەم جۆرەیان لەپلەی یەکەم دەهات بەڵام ئینگلترا وڵاتێکی بچووکی کەم دانیشتوان بوو، ئەم سەرچاوەداراییەی نەبوو کەوا هەریەك لەئیسپانیا و فەرەنسا هەیان بوو ٠ هەروەها هۆڵەندی کەوا ڕکابەرێتی ئیسپانیای دەکرد، پێویستی بەڕێگایەکی تر هەبوو بۆ باربووکردنی ئەو پرۆژە سپێردراوانەی کەوا توانای بەدەست هێنانی قازانجی زۆریان دیار نەبوو،لەبەرامبەر ئەوەشدا پێویستی بەتوانایەکی دارایی واهەبوو کەلەتوانای تاکە دەوڵەمەندەکانی زیاتر بوو ٠

لەوانەیە شێوازی هاوبەشەکی(الشراکە) لەوەتەی چاخە کۆنەکانەوە ناسرابێ ٠ بەڵام شێوازی هاوبەشەکی بریتی بوو لەوەی کەوا هاوبەشەکە بەرپرسیارێتی هەموو قەرزەکانی پرۆژە کەلەئەستۆ بگرێ ٠ ئەمەش دەبووە هۆی ئەوەی کەوا وەبەرهێنی خاوەن سەرمایەی سنووردار لەحاڵەتی سەرنەکەوتنی پرۆژەکەدا دوچاری ئیفلاس بوون ببێتەوە ٠ بۆیە لێرەدا کەسانێکی کەم ئامادەباشی ئەوەیان هەبوو بەرگەی ئەو مەترسیانە بگرن، بەتایبەتی لەو پرۆژەیەی کەوا نەدەتوانرا بخرێتە ژێر چاودێرییەکی ڕاستەوخۆوە کۆمپانیای پشکدار، لەڕێگای ئەوەی کەوا وەبەرهێن بەپێی ی بڕی سامانەوە بەرهێنراوەکەی لێپرسراو دەبێ، توانی چارەسەری کێشەکە بکات ئەمەش بەلای خۆیەوە هەندێك لەمەترسیەکانی بۆ قەرزارەکانی کۆمپانیا گوێزایەوە،لەهەمان کاتیشدا بڕێکی زۆری پارە لەوەبەرهێنان بچوکەکان دابین کرد ٠ بەم شێوەیە کۆمپانیا پشکدارەکان کەوا لەپاش ((دەوڵەت – ئومەت)) (State- Nation) بەپلەی دووەم دەهاتن وەکو گرنگترین پەرەسەندنە ڕێکخراوەییەکانی سەردەمی ڕێنیانس ناسران و هاوشێوەی((دەوڵەت – ئوممەت)) یاریدەدەر بوون لەبەدیهێنانی ئەو دەسکەوتانەی کەوا جیهانی نوێیان دروست کرد ٠

لەنیوەی دووەمی سەدەی شازدەدا زۆرێك لەكۆمپانیای ئینگلیزی پشكدار بۆ ئاسان كردنی پرۆسەی بازرگانی لەژمارەیەك ناوچە دامەزران، لەنێوان ئەم كۆمپانیایانەش : كۆمپانیای مۆسكۆ(Moscow Company) (سالی ۱۰۰۰)،كۆمپانیای رۆژهەلات(Levant Company) (سالی ۱۵۸۲) و كۆمپانیای هیندی رۆژهەلاتی (سالی ۱٦۰۰) ٠ هۆلەندییەكانیش كۆمپانیایەكان دامەزراند كەوا كۆمپانیای هیندی رۆژهەلاتیان پێ دەگوت[۱۷] ٠ ئەم كۆمپانیایە پشكداری كرد لەپچراندنی گەورەترین بەشی ئیمبراتۆریەتی پورتوگالی لەرۆژهەلاتی دووردا،هۆلەندای وەكو ولاتێكی هەژار لەرووی دەرامەتی سروستی، كرد بەیەكەم ولاتی بازرگانی لەجیهانداو دەولەمەندترین ولاتی ئەوروپا لەسەرەتای سەدەی حەڤدەدا ٠

لەسالی ۱٦۰٦ شا جێمسی یەكەم[۱۸] رێگای مۆلەتدانی دا بەدامەزراندنی كۆمپانیای ڤێرجینیا كەلەسەردەستی كۆمەلێك بازرگانانی لەندەن دامەزرا ٠ هەروەها گەلالەنامەی كۆمپانیاكە باسی لەوەدەكرد كەوا ئامانجی كۆمپانیا كەبریتی یە لەدامەزراندنی كەشتیگەلێكی بازرگانی بۆ ئینگلترا و زیاد كردنی ژمارەی دەریاوانی شارەزا لەمیانەی زیادكردنی قەوارەی بازرگانییەكانی و دۆزینەوەی كانزای بەنرخ و دامەزراندنی نشینگەی پرۆتستانتی لەزەوییەك كەوا لەژێر بەزەیی هەرەشەكانی ئیسپانیا دابوو، وەلەگەل هەموو ئەمەشدا هێنانی بت پەرستەكان بوو بۆ سەر ئایینی مەسیحی ٠

ئەم ئامانجەی دوایی لەواقیعدا گرنگی زۆری پێ نەدرا، بەدلنیاییەوە، ئینگلترا هەرگیز مزگێنیدەرێكی نەنارد ٠ بەپێچەوانەی ئەمەوە، نیەتی خۆی بەدیارخست بەبەدیانكردنی هیندیەكان لەمیانەی كۆمەلێك پرۆسەی فێركردنی ئابووری (عمليات التلقين الاقتصادي) "بەنیازی نیشتەجێ كردنی ژێردەستەكانمان و پەرتەوازە كردنی یەكێتی دانیشتوانە رەسەنەكان لەپێناو خودای گەورە و،بلاوكردنەوەی ئایینی مەسیحی و،پەرەپێدانی كارودەستكەوتی جوتیار لەم ولاتە بەگشتی و،بەدیهێنانی بەرژەوەندییە تایبەتیەكانمان و زەمانەتی قازانجەكانمان" ٠

بەم جۆرە تێروانینی ئینگلیز بۆ نیشتەجێ كردن، هەر لەسەرەتاوە لەگەل تێروانینی ئیسپانی و فەرەنسیەكان جیاوازی ریشەیی هەبوو ٠ حكومەتەكانی ئیسپانیا و فەرەنسا كۆششیان بۆ زالبوون بەسەر هەموو كاروبارێكی تایبەت بەو زەوییانەی كەوا لەجیهانی نوێدا لەژێر دەستیان دابوو و، كۆششی زۆریان كرد بۆ هێنانی هیندیەكان بۆ ناو ئایینی (بەلكو ئایینزا – ك.م–) كاسۆلیكی جا ئەگەر ویستیان، یان رەتیان كردەوە ٠

كەچی دەرگای كۆچكردن بۆ نیوسپەین(New Spain) و نیو فرێنس (New France) تەنها بۆ ئەوانە والا كرا كەوا رێگایان پێ درابوو، ئەمەش بۆ ئەوەی كەسانی گومراو خراپەكاران تێكی نەدەن ٠ بەلام

حکومەتی ئینگلترا بەرژەوەندییەکی گەورەی لەپرۆژەکەدا نەبوو، تەنها بەدوورخستنەوەی سەرچاوەی پەشێوییەکان – چاچ ئایین دارەکان بن یاخود تاوان کاران –و بێ کاران و هی تر وازی هێنا ٠ ئابوری ئینگلیزی لەزۆربەی ماوەکانی سەدەی شازدەدا، بەهۆی گۆڕانکارییە نەرێیەکانییەوە دەینالاند ٠ ژمارەی دانیشتوانی بەخێرایی زیادی کرد، لەنزیکەی سێ ملیۆن لەساڵی ١٥٠٠ بۆ چوار ملیون پاش سەدەیەك و،پێنج ملیون لەساڵی ١٦٥٠ دا٠ کەچی ژمارەی کرێکارانی بەهەمان رێژە زیادی نەکرد ٠ پیشەسازی جل و بەرگ – کەوا کۆڵەگەی بنچینەیی پیشەسازی بەریتانی بوو لەوەتەی جێنشینبوونی جۆلاکانی فلمینغ لەوێ لەناوەڕاستی سەدەی چواردەدا – پلەو پایەی خۆی بۆ بەرژەوەندی رکابەران لەولاتانی کشوەری تردا لەدەست دا ٠

لەم ئان و ساتەدا سیستمی دەرەبەگایەتی کۆن، کەوا لەسەر بنچینەی موڵکدارێتی زەوی دامەزرابوو،بەخێرایی دەپووکایەوە ٠ چینی بالادەست و ئۆرستوکرانی – کەوا نزیکەی ٥٪ ی دانیشتوان بوون و زۆربەی زەوییە کشتوکاڵییەکانی ئینگلترایان لەژێر دەست دابوو – پەرژینیان بۆ زەوی و زارەکانیان دروست کردو وازیان لەبەکرێ گیراوەکان هێنا تاکو بۆخۆیان کار بکەن و بەبەکارهێنانی دەستی کرێکاری بەکێگیراو بەرهەمیان زیاد بکەن ٠ وەلەسەد ساڵەی نێوان ١٥٣٠ – ١٦٢٠ دا نیوەی جوتیارانی ئینگلترا کرێ دەستەکانیان لەدەست داو ژمارەیەکیشیان بۆ دەستکەوتنی کارێکی تر رووبەڕووی ئاستەنگی گەورە بوونەوە

سەرباری ئەمەش، بەلێشاو هاتنی زێڕ و زیو لەجیهانی نوێوە بۆ ناو ئابووری ئەوروپا، بەهۆی داگیرکارییەکانی ئیسپانیەکان، بووە هۆی کردنەوەی جڵەو بۆ هەڵاوسانێکی سەرخەستی نرخەکان بۆ ٤٠٠ لەسەدا ، لەسەدەی شازدەدا ٠

ئەو جوتیارانەی کەوا لەموڵکەکانیان بێ بەش بوون و ئەو کرێکرانەش کەوا لەکاری جلوبەرگدا لەکار کەوتبوون – ئەوانەی کەوا بەسواڵکەرە تەندروستەکان (ئەوانەی توانای کاریان هەبوو) تاکو لەو سواڵکەرانە جیا بکرێنەوە ئەوانەی کەوا بەهۆی نەخۆشی و ئەنگاوتنوە کاریان بۆ نەدەکرا – لەئەبرەشیەکەوە بۆ یەکێکی تر دەسوڕانەوە ٠ ئەمە پاش ئەوەی کەوا فەرمانبەرە خۆجێیەکان رەتیان کردەوە هیچ چاودێرییەك یان گرنگیان پێ بدەن ٠ ئەوانە لەسەر ئەوە راهاتن کەلەبازاڕەکانی گوندەکان و بەندەرەکان کۆببنەوە٠ ئەوەبوو لەندەن – گەورەترین شاری ئینگلترا – زیاد بوونی ژمارەی دانیشتوانی بەخۆوە بینی لە ١٢٠ هەزار کەس لەساڵی ١٥٥٠ بۆ ٢٠٠ هەزار کەس تەنها پاش پەنجا ساڵ ٠ وەلەساڵی ١٦٥٠، گەڕەکە میللیەکان بەشەقامە تەسك و پێچاو پێچەکانیان و خانووە بچوکەکانیان ٣٥٠ هەزار کەسیان، کەزۆربەیان لەهەژارانی نەدار بوون ،دەحەواندەوە ٠

ئەوانەی سەر بەو توێژە کۆمەڵایەتیانە بوون – هەڵاتوانی دەست برسێتی و کوێخاکانی وڵات – ئەوان بوون لەپاڵ سەربەرزەکان لەخانەدانەکانی ئەوانەی کە بەزۆری بچوکترین ڕۆڵەکانی خێزانە دەرەبەگیەکان بوون، کۆمپانیای ڤێرجینیا (Virginian Company) کۆی کردنەوە[19] لەکانوونی یەکەمی ١٦٠٦ سێ کەشتی کەبریتی بوون لە سوزان کونستانت (Susan Constant) گەدسبید (Godspeed) و(Discovery) دیسکەڤەری،ئینگلترایان بەجێ هێشت و ،لە ٢٦ی نیسانی ١٦٠٧ گەیشتنە کەنداوی چیزابیك و سەدوپێنج پیاوی لەسەر بوو( سی و نۆیان لەڕێگادا مردن)· پاش ئەوەی بۆ خۆشاردنەوەی لەئیسپانیەکان، نزیکەی ٦٠ میل بەئاراستەی چاوکەی زێ ی جێمس گوزەری کرد، هەرسێ کەشتی لەسێزدەی ئایار لەشوێنێك لەنگەریان گرت کە هەمان ناوی زێیەکەی هەڵگرتبوو، واتە جێمس تاون (James Town) بەناوی شای ئینگلترا ·

هەرچەندە جۆرێك لە ئاسایشی ڕێژەیی دوور لەپەلامارەکانی ئیسپانیەکانی هەبوو، کەچی ئەم شوێنە – لەسەر کەناری باکووری زێ ی جێمس(James) نزیك یەکێك لەزۆنگاوەکان – هیچ تایبەتمەندییەکی تری نەبوو · ئەو زۆنگاوەی کەوا یاریدەدەر بوو بۆ بەرپەرچدانەوەی پەلاماری هیندیەکان، کەچی مەڵبەندێکی بەپیت بوو بۆ زیاد بوونی ژمارەیەکی زۆر لە مێش و مەگەز لەهەردوو وەرزی بەهار و هاویندا · ئەمەش ببوە هۆی بڵاوبوونەوەی مەلاریا لەنێوان نیشتەجێ بووەکاندا · نا ، بەڵکو ئاوی ئەو بیرە کەمئاوانەی کەنیشتەجێ بووەکان هەڵیان کەندبوو شیرین نەبوو، بەتایبەتی لەکاتی دابەزینی ئاستی زێیەکەدا · ئەمەش ببوە هۆی ژەهراویبوونی نیشتەجێ بووەکان بەخوێیەکان لەئەنجامی ئارەقەکردنی زۆریان بەهۆی بەرزی پلەی گەرمای ڤێرجنیا و ناچاربوونیان بۆ زۆرخواردنەوە لەم ئاوە · وەکاتێك ئاستی زێیەکە دادەبەزی ئەوا پاشماوەکان و ئاوی ئەو ڕێرەوانەی کەوا پاشماوەکانی تێ دەهاویشترا نەدەچوونە ناو دەریا بەڵکو نەخۆشی وەکو تیفۆ و سکچوونیان دەنایەوە و یاریدەی بڵاوبونەوەیانی دەدان ·

لەئەنجامی ئەمەدا ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی مردن · لەنێو نیشتەجێ بووە ڕەسەنەکاندا کەوا ژمارەیان دەگەیشتە سەدو پێنج نیشتەجێ بوو، لەپاش نۆمانگ تەنها سی و هەشت کەسیان لەژیان مانەوە ·

ئەو کێشەبنچینەییەی کەوا لەئەنجامی چوونە ناوەوەی کۆمپانیای ڤێرجینیا ( Virginia Company) لەو کاتەدا بۆ نێو پرۆژە تازەکان –کەبریتی بوو لەکێڵگە ئەمەریکاییەکان – خۆی حەشاردا بوو و دامەزراندنیشی بەهۆی تەکنەلۆژیای تازەوە بەجێ دەهات، بریتی بوو لە کەشتی چارۆگەدارەکان · بەهەمان شێوەش لەو کاتەوە – لێرەدا داهێنانی هێڵەکانی ئاسن لەسەرەتاکانی سەدەی نۆزدە و، داهێنانی ئەنتەرنێت لەکۆتاییەکانی سەدەی بیست بەخەیاڵ دادێ – فێرکردن پێویستی بەتێچوونێکی زۆر هەبوو،

بەرلەوەی قازانجەکان لەم بارودۆخەدا سەقامگیری بەخۆوە ببینن . هەروەها بازرگانە لەندەنیە دەوڵەمەندەکان، ئەوانەی دەسەڵاتیان بەسەر کۆمپانیای ڤێرجنییادا گرتبوو، هیچ بیرۆکەیەك لەبارەی پێویستی دامەزراندنی نشینگەیەکی سەرکەوتوو لەسەر تخووبی دەشتی ئەمەریکی لەدووری سێ هەزار میل و ماوەی سێ مانگ لەوڵاتی دایك نەبوو .

لەئەنجامدا، ئەو بازرگانانە هەڵەکانیان دووبارە دەکردەوە، چونکە ئەوانە بەهۆی مزگێنیدانیان بەدەستکەوتنی زێڕ وایان لەنیشتەجێ بووەکان کردبوو کارکردنی قورسی پێویست بۆ کشتوکاڵ لە خاکێکی تازە ڕەت بکەنەوە . بەڕاستی لێرە زێڕ نەبوو، تاکو بەدوایدا بگەڕێی، چونکە نیشتەجێ بووەکان بڕێك کانزای (مسیکا)ی خۆجێیان دۆزییەوە و خۆیان فریو دا بەوەی گوایە ئەم کانزایە فلزی زێڕی گران بەهایە . بەپێ ی دەربڕینی جۆن سمیس(John Smith) لەو کتێبەی ژمارەیەکی زۆری لێ فرۆشراو لەساڵی ١٦١٢ بڵاو کرایەوەو بەناوی(()وەسفی ڤێرجنییا) (Description of Virginia) بوو دەڵێ: ((قسەو باس و خواست یان کار نەبوو، تەنها کنەکردن بەدوای زێڕدا نەبێ )) . وە ئەوەش ئاشکرابوو کەوا ئەو(زێڕ)ەی بۆ ئینگلترا بارکرا بێ بەها بوو .

کۆمپانیاکە لەسەرەتادا مافی خۆی لەموڵکدارێتی زەویدا پاراست، چونکە بەتەمای ئەوە بوو نیشتەجێ بووەکان وەکو جوتیارلەزەوییەکانیاندا کاربکەن . بەڵام هیچ کامێکیان لەجەربەزە خانەدانەکان یان بەسەرباز گیراوەکان ئەوانەی هاتبوونە سەر شۆستەی بەندەرەکان لە لەندەن و بریستول، ئارەزووی ئەوەیان نەبوو لەپێناو کۆمپانیاکەدا کۆششێکی دژوار بکەن . هەروەها ئەوان پسپۆڕی پێویستیان بۆ ئەمە نەبوو: لەڕووی ماددییەوە خانەدانەکان ناچار نەبوون کارێکی وا ئەنجام بدەن و((سواڵکەرە تەندروستەکان))یش دەرفەتی ڕەخساویان نەدۆزییەوە .

ئەنجامی (ئەوەی سەرەوە — ك. م) بریتی بوو لەبرسێتی لەزستان، چونکە هیندییەکان.زێدە شمەکێکی زۆر کەمیان هەبوو بۆ شمەك بەشمەك گۆڕینەوە یانیش بازرگانی، هەروەها زۆرجار ئەوان هەر لەبنەڕەتدا ڕەتیان کردبۆوە بازرگانی بکەن (لەگەڵ نیشتەجێ بووە ئەورووپاییەکاندا —ك.م))·لەگەڵ ئەوەی کەوا کۆمپانیاکە ساڵانە ژمارەیەکی زۆری لەنیشتەجێ بووەکان دەگواستەوە، کەچی ژمارەی سەرجەمی ئەمانە، تەنها بەتێکڕایەکی لەسەرخۆ نەبێ، بەرز نەبۆوە . لەکانونی یەکەمی ١٦٠٩ ژمارەی دانیشتوانی جێمس تاون گەیشتە دووسەدوبیست کەس . لەگەڵ داهاتنی بەهار، بەهۆی کەمی خۆراکەوە، تەنها شەستیان لەژیان مابوو . هەتا یەکێك لە نیشتەجێ بووەکان قەستی ئەوەی کردبوو هاوسەرەکەی خۆی بکوژێت و گۆشتەکەی بخوات (دواتر وەکو سزایەك لەسەر مێخدا سوتێنرا) .

ئەو نیشتەجێ بووانەی مانەوە، لەحوزەیرانی ١٦١٠ جێمس تاونیان بەجێ هێشت و ڕێگای دەریایان گرت و بۆ وڵاتی دایك گەڕانەوە . کەچی لەلای ڕێژگەی زێی جێمسدا بەسێ کەشتی گەیشتن کەوا سێ سەد کۆچبەری تازەیان لەسەر بوو . بەم جۆرە بۆ جاری دووەم بۆ نشینگە بچوکەکە گەڕانەوە .

هەوڵێکی زۆر درا بۆ دۆزینەوەی بەرهەمێك کەبکرێ بنێردرێتە دەرەوەو بۆ پڕکردنەوەی تێچونەکان پشتی پێ ببەسترێت و قازانجێك بۆ خاوەن پیشە وەبەرهێنەکان بەدەست بهێنێ . وە لەبەرئەوەی داواکاری لەسەر شووشە لە ئینگلترا لەبەرزبوونەوەدا بوو، لەکاتێکدا کەوا سوورتەمەنی تەختەی پێویست بۆ بەرهەم هێنانی دەگمەن بوو،لەگەڵ ئەوەش کەکۆمپانیاکە هەوڵی دا تا سوود لەدارستانە بەرفراوانەکانی ڤێرجینیا و لمە فرەکەی ببینێت، کەچی نەیدەتوانی لەڕێگای ئەتڵەسەوە و بەجۆرێکی بەقازانج باری بکات . هەروەها بازرگانی قیر، مس، تەختەی کرابورد و بەهاراتی ساسافراس دەستکەوتیان وەکو پێویست نەبوو .

لەگەڵ داهاتنی ساڵی ١٦١٦ کۆمپانیای ڤێرجینیا زیاتر لەهەزاروحەفت سەد کەسی بۆ ڤێرجینیا گواستەوە و سامانێکی بێ شوماری کەگەیشتە ٥٠ هەزار جونەیە، لەپڕۆژەکەی سەر کەناری چیزابیکدا وەبەرهێنا . بۆ بەخشینی بیرۆکەیەکی سەرەتایی لەبارەی بەهای ئەم بڕە پارەیە لەئینگلترا، لەڕۆژگاری یەعاقیبەکان ، ئەوە وەبیر دێنێتەوە کەوا داهاتی ساڵانەی پیاوێك لەخانەدانەکان لەدەستکەوتی زەویدا دەگەیشتە پەنجا جونەیە . کەچی ئەو قازانجەی کەوا تاج لە دەستکەوتی باجەکاندا وەری دەگێرت – ئەوکاتە سەرچاوەیەکی بنەڕتی داهاتی شابوو – مامناوەندییەکەی گەیشتە حەفتاو پێنج جونەیە . لەگەڵ ئەوەشدا و لەبەرامبەر هەموو ئەو داراییانەشدا کۆمبانیاکە لەکەناری زێ ی جێمس، ئەو شوێنەی کەوا سێ سەدو پێنج کەسی لێ دابەزاندو زۆربەیان نەخۆشی و برسێتیان چێشت، ئەنجامێکی وای بەدەستەوە نەدا .

پاش نۆ ساڵان پێگەی ئینگلیز لەکیشوەری ئەمەریکای باکوور هێشتا هەر لەژێر هەڕەشەی زۆر دابوو، لەوانەش پەلاماری هیندییەکان و هێرشی ئیسپانیەکان و نەخۆشی و برسێتی . هەروەها واقیعی کۆمپانیاکە خۆشی لەم هەڕەشانە کەمتر نەبوو، چونکە دەبویست بەهەر ڕێگایەك بێ دەستکەوتی زیاتر لەو تێچونانە بەدەست بهێنێ کەوالەم نشینگانەدا خەرجی کردبوو . ئەوە ئاشکرا بوو کەوا چارەسەری کێشەکە لەڕووەکێکی خۆماڵیی باویی بەربڵاودا لەهەردوو ئەمەریکا خۆی حەشارداوە، ئەویش ناوی تووتنی نیکۆتین( Nicotine Tobacco) . بەدرێژایی هەزاران ساڵ بەر لەهاتنی ئەوروپاییەکان توتن لەو شوێنەی کەوا ئێستا پیرو و ئیکوادۆری پێ دەگوترێ – چێ کرا . لەسەرەتادا کێشانی گەڵای وشك کراوە هەستێکی خۆشی دەبەخشی و پاش ماوەیەکی کەمیش دیاردە هەمیشەکێشی بەدوادا هات . لەوکاتەی کۆلومبوس گەیشتە جیهانی نوێ ئەم نەریتە لە ناوچە فێنکەکانی نیوەی ڕۆژئاوای گۆی زەوی و پشت ئەوەش بڵاو بۆوە . واتە لەو شوێنانەی کەوا کشتوکاڵی توتنی لێ دەکرا .

پاش گەڕانەوەی لەگەشتی یەکەمی، کۆلۆمبوس توتنی بۆ ئەورووپا گواستەوە · لەسەدەی دواتریشدا ئەم نەریتە بەخێرایی لەجیهانی کۆندا بڵاوبۆوە · چێکردنی کشتوکاڵی توتن لەحەوزی ناوەڕاستدا دەستی پەفرلولنبوون کرد · ئیسپانیەکان لەوێست ئەندیز (West Indies)دا دەستیان کرد بەچێکردنی کشتوکاڵی توتن بەئامانجی ناردنەدەرەوەی · نەریتەکە لەبەریتانیاش بڵاو بۆوە و شا جیمس ڕقێکی زۆری لەبەرامبەر توتن پیشاندا و لەشتە خراپەکانی دانا · ئەوە بوو کەناميلکەیەکی دانا و بەناوی ((لەبەدرۆخستنەوەی توتن)) دا بڵاوی کردەوە · سەیر نیە کەوا ماددەی کتێبەکە گرینگیەکی وای بەگۆشەنیگای پادشایەتی دا کەشایەنی باس کردن بێ،چونکە جەماوەری کێشانی توتن لەزیاد بوون دابوو · بەڵام کەش و هەوای سارد و بارانـاوی بەریتانیا بۆ کشتوکاڵی توتن بۆ مەبەستی بازرگانی نەدەگونجا بۆیە لەسەر وڵات پێویست بوو کەوا زۆربەی پێداویستییەکانی خۆی لەئیسپانیاوە، کەوا لەگەڵیدا لەشەڕێکی بەردەوام دابوو، هاوردە بکات ·

هەرچی هیندیە خۆجێییەکانی ڤێرجینیای ڕۆژهەڵات بوو، ئەوانیش هەروەها هەمیشە کێش بوون، بەڵام ئەو جۆرە توتنانەی دەیانچاند لەنێوان نیشتەجێ بووە ئینگلیزەکاندا باو نەبوو · نیشتەجێ بووەکان ئەو توتنانەیان لەلاباشتر بوو کەوا ئیسپانییەکان لە ویست ئەندیز (West Indies)دا بەرهەمیان دەهێنا · پاشان لەساڵی ١٦١٢ پیاوێك بەناوی جۆن رۆلف چنگێك لەتۆوی توتنی لەو وڵاتە – زیاتر لەوانەیە ترینیداد بێت – هێناو چاندی · تۆوەکە بەخێرایی لەکەش و هەوای گەرمی شێداری ڤێرجینیادا گەشەی کرد[20]، ئەمەش بەهۆی کۆششی هیندیە خۆجێییەکان بوو (رۆلف لەساڵی ١٦١٤ شازادەیەکی هیندی بەناوی بوکاهونتاس هێنا) · بەم جۆرە جۆن فێری هونەری چێکردنی کشتوکاڵی توتن بوو ·

لەساڵی ١٦١٦ یەکەم بەرووبوومی بازرگانی لەگەڵ خۆیدا، بەهاوڕێیەتی خێزانەکەی بۆ ئینگلترا گواستەوە · گەیشتنی بەرووبوومەکە و خێزانە هیندییەکەی بوونە هۆی نانەوەی بەلەسەیەکی گەورە · هەرچەندە کەوا کەش و هەوای ئینگلترا بووە هۆی مردنی بوکاهونتاسی (هاوسەرەکەی) · رۆلف لەساڵی ١٦١٧ بۆ ڤێرجینیا گەڕایەوە، ڤێرجینیا بەیادی یەکەم جەژنی شوکر لەئەمەریکا ئاهەنگی ساز کرد، چونکە بەرووبوومی توتنی ئەم ساڵە فرە و باش بوو ئەمەش سەرفرازی بازرگانی بۆ نشینگەکە هێنا ·

یەکەمین ماوەکانی بووژانەوەی ئابووری ئەمەریکایی لەڕێگادابوو دەربکەوێ· کاتێك کابتن جۆن سمیس گەڕایەوە ئینگلترا ئەوەی ڕاگەیاند کەوا فەرمانڕەوا تازەکە لەکاتی گەیشتنی بۆ جێمس تاون لەم ساڵەدا، ئەم شارەی لەحاڵەتێکی شپرزەدا بینی بوو ((بازاڕو شەقامەکان و هەموو پەڵە زەوییەکی چۆڵ بەتووتن چێنرابوو)) ·

لەساڵی ١٦١٨ بیست هەزار ڕەتل توتن لەڤێرجینیا بەرهەم هێنرا تاکو پاشان بۆ ئینگلترا باربکرێ · پاشی چوار ساڵان – سەرەڕای پەلاماری هیندیەکان لەم ساڵە و کوژرانی سێ یەکی نیشتە جێ بووەکان لەوانەش هەروەکو ڕیولیەتەکان پەسندی دەکەن، جۆن ڕۆلف خۆی بووە – بەرووبوومی توتن سێ جار هێندەی خۆی زیادی کردبوو · لەگەڵ ساڵی ١٦٢٧ بەرووبوومەکە بۆ ٥٠٠ هەزار ڕەتڵ زیادی کردو ئینجا گەیشتە ١,٥ ملیۆن ڕەتل لەساڵی ١٦٢٩دا · لەگەڵ داهاتنی ساڵی ١٦٣٨، ڤێرجینیا ساڵانە سێ ملیۆن ڕەتل توتنی بۆ بەریتانیا دەنارده دەرەوە و بوویە سەرچاوەیەکی سەرەکی ناردنە دەرەوەی توتن بۆ ئەورووپای ڕۆژئاوا و بەمەش بەسەر وێست ئەندیز دا سەرکەوت ·

لەو هۆکارانەی بوونە هۆی زیاد بوونی خێرایی بەرهەم هێنانی توتن،بێگومان، بریتی بوو لەوەی کەوا لەساڵی١٦١٦ کۆمپانیای ڤێرجینیا سیاسەتی خۆی تایبەت بە زەوییەکان گۆڕی، لەجیاتی داواکردن لەنیشتەجێ بووەکان بۆ کارکردنیان لەزەویی و بۆ حیسابی کۆمپانیا، کەچی لەهەمان کاتدا دەرگایان لەپێش نیشتەجێ بووەکان والاکرد تاکو زەوییە تایبەتیەکانیان بکەن بە موڵکی خۆیان (تەملیکیان بکەن –ك.م–) · سەرەڕای ئەمەش، بەئامانجی ڕاکێشانی کۆچبەری زیاتر، بەپێی ئەو سیاسەتەی کەوا ئەو کاتە بەناوی مافەکانی سەر (حقوق الرأس) (Head Rights) ناسرا بوو، کۆمپانیا زەوی بەخۆڕایی پێشکەش بە نیشتەجێ بووەکان دەکرد · ئەوە بوو کەوا ٥ هەکتار (زەوی) بەخشرایە هەرپیاوێك کەوا خۆی خەرجیەکانی گەشتەکەی بۆ ئەم وڵاتە (ئەمەریکا – ك.م–) بگرێتە ئەستۆ، پەنجای تر بۆ هەرخزمێکی کەوا لەگەڵی بایە و هی تریش بۆ هەموو خزمەتکارێك کەوا ئەو (پیاوەکە – ك.م–) خەرجییەکانی گەشتەکەی بۆ ئەم وڵاتە لەئەستۆ بگرتایە · هەروەها بۆ خزمەتکارە بەگرێبەستەکان ئەوانەی کەوا ڕازی بوون چەند ساڵێك کار بکەن بۆ ئەوەی خەرجی تێچونی گەشتەکانیان بدەنەوە،پەنجا هەکتار زەوییان پێ درا، ئەمەش پاش تەواو بوونی دانەوەی پێویستییەکانی گرێبەستەکانیان بوو · بێ گومان دەستکەوتنی ئەم مافانەش بە مەسەلەی بەزیندوو مانەوەیان بەستراوەتەوە · چونکە ٢٥ لەسەدای کۆچبەرەکان،لەساڵی یەکەم لەچیزابێکدا، لەسەرەتاکانی ساڵانی نیشتەجێ بوونی ئینگلیزیدا گیانیان لەدەستدا ·

ئیمتیلاکبوونی سەد هەکتار یان دووسەد یانیش زیاتر لەزەوی گونجاو بۆ کشتوکاڵ و بەبێ بەرامبەر،سەرەڕای بوونی هەموو مەترسییەك پاڵنەرێکی بەهێز بوو · لەو چاخەی کەوا کشتوکاڵ بنچینەی هەموو ئابوورییەکی نیشتمانی بوو، ساماندارێتیی بەپارە نەدەپێورا،بەڵکو بەموڵکدارێتی زەوی · وە لەئەورووپا کەوا زەوی فراوانی کەم بوو،موڵکدارێتی دووسەد ((أکر)) لەزەوی کشتوکاڵی بەپێت مرۆڤی دەوڵەمەند دەکرد

· کەچی کۆمپانیای ڤێرجینیا، کەوا زەوی و زاری بەخشی، سوودی زۆری لەگرنگترین جیاکەرەوەکانی ئەو ڕکابەرێتییە وەرگرت کەوا ئەمەریکا هەیبوو: ئەویش ئەو زەوی و زارە بەرفراوانە بێ پسانەوەی بوو کەهەیبوو ئەو نیشتەجێ بووانەی کشتوکاڵی توتنیان چێ دەکرد قایل کران تاکو خەرجی تێچوونی گەشتی خزمەتکارە بەگرێبەستەکان بدەن · چونکە توتن لەو بەروبوومانە بوو کەوا پێویستی بەڕێژەیەکی زۆری دەستی کار هەبوو،وەکاتێك بڕی تەرخانکراو بۆ ناردنەدەرەوە دەستی بەزیاد بوونێکی خێرا کرد ، ئەوا هەروەها پێویست بوو دانیشتوانی ڤێرجینیی بەتێکڕایەکی زۆر زیاد بکات · لێرەشدا یەکێك لەتایبەتمەندییەکانی تر کەئابووری ئەمەریکایی پێویستی بوو چەکەرەی کرد: ئەویش بریتی بوو لەکەمی دەستی کار ·

بووژانەوەی پیشەسازی توتن یاریدەی ڕزگاربوونی ڤێرجینیای دا، بەلام کۆمپانیای ڤێرجینیای ڕزگار نەکرد، چونکە لەپاڵ زۆری قەرزەکانی،هەروەها کۆمپانیاکەش – پاش پەلاماری گەورەی هیندیەکان لەساڵی ١٦٢٢ – دوچاری زیانی زۆر بووە و توانای لێ بڕی · لەساڵی ١٦٢٤ شا جێمس مۆڵەتی کۆمپانیا مایەپووچەکەی (کۆمپانیای ڤێرجینیا –ك.م –) کێشایەوە و دەستی بەسەر ڤێرجینیادا کێشا و تاکو ببێتە یەکێك لەنشینگەکانی سەر بەتاج[٢٠] · سڵەمینەوە لەتوتن و جگەرەکێشان وای لێکرد کەوا بەبێ دوودڵی باجی زۆر لەسەر بازرگانی توتن دابنێ · هەروەها شا جێمس قۆرخکارییەکی بۆ سەرپەرشتیکردنی ڕاستەوخۆی سەر ئەم بازرگانییە دامەزراند، کەوا پاش بەرزبوونەوەی گەورەی بەرهەمی توتنی ڤێرجینیا و فراوانبوونی زۆریی قەوارەی بازرگانییەکەی لەگەڵ ئینگلترا و ئەورووپا،گەشەکردنێکی بەردەوامی بەدی هێنا ·پاش جیلێکی تر توتن نیوەی دەستکەوتەکانی باجەکانی تاجی پێشکەش دەکرد · کەچی ساڵی ١٦١٩– کاتێك کەبازرگانی توتن ڕووی ڤێرجینیا و ئابوورییەکەی گۆڕی ساڵێکی یەکلایی کەرەوە دەبێ لەمێژووی ڤێرجینیا و وڵاتەکەیدا، ئەو وڵاتەی کەڕۆژێك لەڕۆژان ڤێرجینیا دەبێتە بەشێك لەو ·

لەوەتەی دامەزراندنی نشینگەکە پێشی دوازدە ساڵ،پیاوان زۆربەی دانیشتوانی جێمس تاونیان پێك دەهێنا · ئەو کاتە کۆمپانیای ڤێرجینیا لەپێناو دامەزراندنی نشینگەیەکی ئاوەدان لەجیهانی نوێ کۆششی دەکرد · بەڵام کە کۆمپانیاکە لەساڵی ١٦١٩دا یەکەمین کەشتی هێنا بۆ نشینگەکە کە ئافرەتی لەسەر بوو (ئەوەت بەدیاری کراوی) ئەوەبوو نیشتەجێ بووەکان لەبەرامبەر ١٢٥ ڕەتل توتن بۆ هەر ئافرەتێك،وەکو هاوسەر قبووڵیان دەکردن، پاش ئەوەی ماوەیەکی درێژ بێ هاوسەر مابوونەوە · یەکسەر کۆمەڵگای ڤێرجینیا دەستی بەوە کرد گۆڕانکاری ڕاستەقینە بەخۆوە ببینێ · ئیتر مۆرکی نێرینەی هاوشێوەی سەربازگەی کرێکارانی کانەکان یاخود سەربازگە کراوەکانی لەشکر دەستی بەکەمبوونەوە کرد، بۆ ئەوەی پلە بە پلە، کۆمەڵگایەکی مرۆیی هاوشێوەی ئەوەی کەوا ڤێرجینیەکان لەپاشی خۆیان لەئینگلترا بەجێیان هێشتبوو شوێنی بگرێتەوە ·

هەروەها لەم ساڵەدا یەکەمین ئەنجوومەنی نوێنەران لەبەشی ڕۆژئاوای گۆی زەوی دامەزرا · سێر ئێدوین ساندیز وەکو ئەمینداری سەندوقی ئەم ساڵەی کۆمپانیای ڤێرجینیا دامەزرا،ئەمەش وای لێ کرد کەوا بەشێوەیەکی کرداری ببێت بە بەڕێوەبەری باڵای کۆمپانیاکە· یەکسەر دەستی کرد بەناردنی فەرمانڕەوایەکی تازە، ئەویش سێر جورج یێردلی بوو، ڕایسپارد تاکو هەستێ بەپێکهێنانی ئەنجومەنێکی نوێنەرایەتی کە بەفەرمی ناوی ئەنجوومەنی نوێنەران بێ و، تاکو فەرمانڕەواکەو ئەنجومەنەکەی کار بکەن وەکو ئەنجومەنێکی یاسادانان کە بڕیار لەسەر یاسای تازە دەدات · ئەم پەرلەمانە وەکو بچووککراوەی ئەوەی وێستمنستر یەکەم جار لەسیی تەمووزی ١٦١٩ لەکڵێسای جێمس تاون کۆبونەوەی گرێ دا ·

هەرچەندە کەوا ئەم دەستکەوتە بەپێوەرەکانی ئەمڕۆ دەستکەوتێکی گەورە بوو، کەچی ئەو کاتە بەم شێوەیە نەبوو · لەگەڵ ئەوەی کەوا حکومەتی ئینگلیزی بەوە لەحکومەتەکانی وڵاتانی تری ئەورووپایی جیا دەکرایەوە کەوا بەشێوەیەکی سنووردار دەستی دەخستە نێو کاروباری هاونیشتمانیان، هەروەها مافە کەسایەتیەکانی هاونیشتمانیانی ئینگلیزی لەسەرووی مافەکانی هاونیشتمانیان بوو لەوڵاتانی تری ئەورووپایی هاوشێوەی خۆی -- ئەم مافانەی کەوا لەوشەی ((ئازادی))دا بەرجەستە بوون و لەوەتەی سەردەمی گەلا لەنامەی مەزن (Magna Carta)[٦] پەرەسەندنی بەردەوامی بەخۆوە بینی – کەچی چینی باڵا لەکۆمپانیای ئینگلیزیدا خۆی کاروباری خۆجێیی خۆی بەڕێوەدەبرد،هەروەها وا لێ ڕاهاتبوو بەشداری لەپەرلەمانێك بکات کەوا دەست بە دەست لەگەڵ فەرمانڕەوادا لەسەر داڕشتنی یاساکان و تەشریعاتەکانی وڵاتدا کاریان دەکرد ·

وەبەهۆی ئەستەمی دۆزینەوەی پەرلەمانێکی هاوشێوەی پەرلەمانەکەی وێستمنسر لەم وڵاتە نوێیە، ئەوا بەخشینی یاسایەکی تایبەت بە بەڕێوەبردنی کاروباری خۆجێیی بۆ ڤێرجینیا تەنها یەك مانای هەبوو: ئەویش بریتی بوو لە بەخشینی ((مافەکانی هاونیشتمانێتی ئینگلیزی)) بەدانیشتوانی ڤێرجینیا ·

(سێر ئێدوین ساندیز قەت سەردانی ڤێرجینیای نەکرد، کەچی جۆرجی براکەی، کەوا لەشاعیرە پایەبەرزەکان بوو، دەوروبەری دەسالان لە١٦٢١ بۆ ١٦٣١ لەوێ ژیا، کاتێك وەکو ئەمینداری سەندوقی نشینگەکە کاری دەکرد · هەر لەجێمس تاونیش دەستی کرد بەنووسین و وەرگێڕانی(Metamorphoses)ی کتێبی ئۆڤید[٧]، یەکەم ڕەگەزی شیعری ئینگلیزی کەوا لەجیهانی نوێدا بنووسرێ) ·

پاش یەکەم کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی نوێنەران بەسێ هەفتە، کەشتییەکی هۆڵەندی بەرەو چیزابیك ڕێگای دەریایی گرت، سەرکردەکەی نیازی وابوو ئەوبارەی کەلە پیاوان پێك دەهات بفرۆشێتە خاوەنی ئەوکێڵگانەی کەوا تامەزرۆی دابینکردنی دەستی کاری پێویست بوون بۆ ئەو کێڵگانەی توتن کەوا

ڕوویەرەکەیان لەفرلوانبوون دابوو . گەیشتنی کەشتیەکە هیچ گومانێکی دروست نەکرد جگە لە یەك شت نەبێ: ئەویش بریتی بوو لەوەی کەوا پیاوەکان لەبەندەری ئینگلیزی دا بەویستی خۆیان نەچووبوونە سەرپشتیکەشتیەکە، بەڵکو بەزۆرلێکردنەوە کۆت کرابوون تاکو قوبتانی کەشتیەکە بیانکڕێت .

سەرەڕای ئەوەش، ئەمانە (ئەوانەی لەئەوروپاوە هێنران – ك.م–) بەمانای وردی وشە کۆیلە نەبوون، چونکە جوتیارەکان، لەنێو ئەوانیشدا فەرمانڕەوا – کەوا دەستی بەسەر زۆربەی ئەم پیاوانە داگرتبوو – نەیانکڕین، بەڵکو ڕەنجیانی بەکرێ دەگرت . پاش ئەوەی ئەم پیاوانە ماوەی خزمەتەکانیان تەواو دەکرد، وەکو خزمەتکاری بەگرێبەستی ئینگلیزیی ئازاد دەبوون . بەڕاستی،زۆر لەو ڕەشپێستانەی بۆ ڤێرجینیا گواسترانەوە، هەر لەسالانی یەکەمینی تەمەنی نشینگەکەدا ئازادی خۆیان بەدەست هێنا[٣١]، بوونە موڵکداری زەوی و زاری فراوان ، بەرادەیەك کەوا هەندێکیان کۆیلەیان بۆکارکردن لەو موڵکانە کڕی . بەرەچاوکردنی کورتی تەمەنی چاوەڕوانکراوی ئەوانەی بۆ ڤێرجینیا کۆچیان کردبوو، ئەوا کۆیلەکان – ئەوانەی بەرزترین تێچونیان هەبوو – لەڕووی ئابوورییەوە وەکو هاوشێوەکانی خۆیان لەخزمەتکارە بەگرێبەستەکان شکۆمەندی ئابووریان نەهێنا .

لەساڵی ١٦٥٠، تەنها دەوروبەری سێ سەد کۆیلە لەڤێرجینیا هەبوو، واتە کەمتر لەدوو لەسەدای ژمارەی دانیشتوان . دەوری شەستەکان بەسەر چوو بەر لەوەی لەیاسای ڤێرجینیادا ئامارەیەکی فەرمی(تایبەت) بەکۆیلە ڕەشپێستەکان هەبێ، ژمارەی خزمەتکارە بەگرێبەستەکانیش تاکو هەشتاکانی سەدەی حەڤدە زۆر لەسەرووی ژمارەی کۆیلەکان بوو، کەچی باشبوونی بارودۆخی ئابووری لەئینگلترا کەوا فشاری سەر کۆچبەرەکانی سووك کردو، بەرزبوونەوەی تێکڕای نێوەندی تەمەن لەڤێرجینیا لەگەڵ فرلوانبوونی نشینگەکە و پەرەسەندنی بوونە هۆی زیاد بوونی ژمارەکانی کۆیلە بەسەر ژمارەکانی خزمەتکارە بەگرێبەستەکاندا، ئەمەش بەو پێیەی کەوا کۆیلەکان سەرچاوەی سەرەکی دەستی کارن . هەروەها ژمارەی کۆیلەکان لەهەشتاکانی سەدەی حەڤدە هێندەی تر زیاد بوو و لەدەیەی دوایشدا جارێکی تر هێندەی تر زیادی کرد .

لەگەڵ کۆتایی سەدەی حەڤدەدا تێچوونی خزمەتکارێکی بەگرێبەست لەبەرامبەر چوار ساڵ خزمەت دەوروبەری ١٥ جونەیە بوو، لەکاتێکدا کەوا تێچوونی یەك کۆیلە لەگەڵ دەربەست بوونی خۆیی و منداڵەکانی لەپاش خۆی بەکارکردن بەدرێژایی ژیانیان، لەنێوان ٣٠،٢٥ جونەیە دابوو . ژمارەی کۆیلە ڕەشپێستەکان بەپێ ی ڕێژەی دانیشتوان دەستی بەزیادبوون کرد،تاکو گەیشتە ١٤ لەسەدای دانیشتوان لەساڵی ١٧١٠ دا .

ئێمەی کەوا ئێستاکە دەڕوانینە ڕووداوەکان،پاش ڕوودانیان، کارێکی سەختە تا لەوە بگەین ئەوەی وای لەخەڵک کرد لەسەدەی حەڤدە دا تا لەڕوانگەیەکی ڕەوشتییەوە سەیری کۆیلایەتی نەکات ٠ لەناوەڕاستی سەدەی هەژدەدا سەرهەڵدانی ئەو بیرۆکانـەی بـەخۆوە بینـی کـەوا پێـی وابـوو کۆیلایـەتی لەهـەموو شوێن و کاتێکدا کارێکی بەدەر لەڕەوشتە ٠ ئـەو بیرانـە بـەخێرایی لەئـەورووپاو ئەمـەریکادا بـڵاو بوونـەوە، هـیچ نـەبێ لەنێوەندی ئەم توێژە کۆمەڵایەتییانەدا بڵاو بۆوە کەوا پشتیان بەکاری کۆیلە نەبوو، ئەمەش لەبەر ئـەوە بـوو کەوا بەرژەوەندی ئابووری تایبەت بەردەوام وەکو بەربەستێکە لـەپێش ئـەو بیرکردنـەوە پاکانـەی کـەوا پـێ لەسەر چارەسەرکردنی لایەنە ڕەوشتی و سیاسییەکانی هەر کارێك لەکاروبارەکان دا دەگرن ٠

وەلەسەدەی حەڤدەدا،کاتێك زۆرترینی خەڵك هەستیان بـەوە کـرد کـەوا ویستی خواوەنـد پێگـەی کۆمەڵایەتی بۆ مرۆڤەکان دیاری دەکات، وا دانرا کەوا کۆیلایەتی دۆخێکی لەچارەنووسراوە لەسەر توێژێکی خەڵکدا و بەئینکاری و ڕقەبەرایەتیەوە پێشوازی لێ نەکرا، هەروەکو ئەمڕۆکەش هەروایە ٠ هەر هیچ نـەبێ لـەو سەردەمەدا کەسێك نەبوو پێ ی وابێ کۆیلایەتی و نەژاد دوولقی پەیوەست بەیەك بن٠ لەناوەڕاستی سـەدەی حەڤدەدا پیاوێکی ڕەش پێست کەناوی ئەنتۆنی جۆنسن بوو کێڵگەیەکی توتنی لەکەناری ڕۆژهەڵاتی ڤێرجینیا هەبوو کەوا ڕووبەرەکەی دەگەیشتە ٢٥٠ هەکتار و یەك کۆیلەی هەبوو ٠ خۆی وەکو ئەو دراوسێیانەی حساب دەکرد کەوا ئەوانیش بەلای خۆیانەوە ئـەوەیان ڕەت نـەدەکردەوە ٠ دوودڵ نـەبوو لـەوەی داوا لـەدادگا بکـات تاکو مافەکانی خۆی لەسەر کۆیلە لەخزمـەت ڕاکردووەکـەی بسەلمێنێ ٠ پاسـاش ئـەم مافانـەی بەئاشـکرایی دەستەبەر دەکرد ٠

لەگەڵ زیاد بوونی ژمارەی کۆیلە ڕەش پێستەکان بەتێکڕایـەکی جێگیر، جـاچ بەشـێوەیەکی ڕەهـا بێت یان بەگوێرەی ژمارەی دانیشتوان، لەکاتێکدا کەوا قازانجەکانی توتن لەیەك یەکەی کاردا (کرێکار) لەگەڵ گەیشتنی ئاستی بازاڕ بەڕادەی تێربوون دە ـتی بەدابەزین کـرد، ئـەم بارودۆخـە هەڵگەڕایـەوە ٠ ئـەو ڕەخنـە داخکەرانەی کەوا لەدژی چەوساندنەوەی کۆیلە ئاڕاستە کران و ئـەو هاوارانـەیش کـەوا ڕەشپێـستە ئازادەکـان بەهەوایان دادەدا لەگەڵ زێتر بوونی مەترسییەکانی ڕوودانی هەر هەڵگەڕانەوەیەك و، پێداویستی ئابووری کەوا وای لەڕەشپێست کرد بۆ کەمبوونەوەی تێچونەکان کۆششی زیـاتر بکـات، لەبـەرز بوونـەوە دابـوو ٠ وەلەگـەڵ دەسپێکی سەدەی هەژدەدا ڕێگا نەدەدرا بەکۆبوونەوەی ڕەشپێستەکان لەکۆمەڵ وا کەوا لەچوار کەس تێپـەڕ بکات، داوایان لێ دەکرا کەوا مۆڵەتی نووسراو بەدەست بهێنن ئەگەر ویستیان ئەو کێڵگەیە بـەجێ بهێڵن کـەوا تێیدا نیشتەجێ بوون و کاریان تێدا دەکرد ٠ دەورییەکانی پۆلیـسە خۆجێیـیەکان یاریـدەی سـەپاندنی کـۆتی تازەو جێگیر کردنی سیستەم و ڕێکخستنیان دەدا ٠ ئەو کاتە یـەکێك لـەجوتیارەکان کـەوا نـاوی ویلیـام بێرد

بوو، ئەوەی نووسی کەوا لەشوێنەوارە نەرێنییەکانی بوونی ژمارەیەکی زۆر لەکۆیلە بریتی یە لە : ((پێویستی ئەوەی کەوا مرۆڤ توندوتیژ بێ، ژمارەیەکی گەورە وای لێ دەکردن بێ شەرم بن Insolent ، بەم شێوەیە تۆقاندن دەبووە هۆی دروست کردنی ئەو شتەی کەوا ئارەزوومەندی پێی نەدەکرا ٠

فراوانبوونی کەلێنی جیاکەرەوەی نێوان ڕەش پێست و سپی پێست و توندو تیژی زیاد بوو لەمامەڵە کردن لەگەڵ کۆیلە، بوونە هۆی پاشەکشێ کردنی ئەو بانگەوازانەی کەوا داوای ریزگرتنی باری کۆمەڵایەتی و ئابوورییانەی لەسەر بنەمای جۆرێك لەڕەگەز پەرستیی دەکرد ٠ ئەم ڕەگەزپەرستیە گۆڕرا بۆ شێرپەنجەیەك بەنێو پێکهاتەی سیاسی وڵاتە یەکگرتووەکاندا ڕۆچوو، ریشەکێشکردنی گیان و ماڵێکی زۆری ویست ٠ ئەم ڕەوشەش بەهەمان شێوە بەدرێژایی سێ سەد ساڵان بەردەوام بوو تاکو ئەمڕۆ دەستی بەکەمبوونەوە کرد ٠

کەسێك نەبوو ڕێگا بە بەکۆیلایەتی کردنی ڕەشپێست بدات ،ئەو ڕەگەزپەرستیەی کەوا بۆ ریشەکێشکردنی ئەو گرفتە ئابوورییە هەمیشەییەی کەوا ئەمەریکا بەدەستەوە دەیناڵاند لە کەمی دەستیکاردا ڕەنگی دایەوە ٠ بەڵام ئەمەش ئەو واقیعە تاڕادەیەك ڕاڤە دەکات ٠ وەدەکرێ بگوترێ کەوا گەورەترین خراپە لەدژی نەفسی خۆمان ئەنجامەمان دابێ و گەورەترین تێشکانی ڕەوشتیش کەوا وەکو گەلێك دووچاری بووبین ئەوە بوو کەوا لەنیازپاکییەوە تێ ی کەوتین بێ ئەوەی بیر لەدەرەنجامەکانی بکەینەوە ٠

ئیتر ڤێرجینیا سەرچاوەی ژیانی ئابووری خۆی بەهۆی سەرکەوتنی لەچاندن و ناردنە دەرەوەی توتن دەستەبەر کردو، بەم جۆرە ئەو میللەتەی کەوا بەئینگلیزی دەئاخافتن بۆخۆیان شوێنێکیان لە جیهانی نوێ دۆزییەوە ٠

پەراوێزەکانی وەرگێڕی عەرەبی :

(١)فەهرەنهایت .

(٢) جێمس فینیمۆر کۆپەر(١٧٨٩-١٨٥١ن) ڕۆماننووس و ڕەخنەگرێکی کۆمەڵایەتی ئەمەریکی بوو .

(٣) the gentle art of the forest

(٤) تۆمارکردنی یەکانگیر Double entry :بریتییە لەتۆمارکردنی یەك پرۆسەی حیسابی بە دووجار . جارێك لەژێر بەندی قەرزدارو جاری دووەمیش لەژێر بەندی قەرزدەردا لەتێنووسەکانی حیسابیدا .

(٥) ئەوکاتە شای ئیسپانیا بوون .

(٦) الوپیقه العقمی Magna Carta : بریتی بوو لەو گەڵاڵەنامەیەی کەوا لەلایەن شا (جۆن) لەساڵی ١٢١٥ز داواڕۆ کراوە کەواجەخت لەسەر ماف و ئەرکەکانی خانەدانەکانی ئینگلیز دەکردەوەو، سنووری بۆ دەسەڵاتی شا دادەنا، دانی بەوەدانەدەنا کەواهەموو کەسێك بەشاکان و فەرمانڕەواکانیشەوە لەبەرامبەر یاسادا بەرپرسیارن .

(٧) ئۆفید : شاعیرو ڕۆماننووس (٤٣پ.ز–١٧ز) یەکێك بووله‌ناودارترین شاعیرەکانی ڕۆمان .

پەراوێزەکانی وەرگێڕی کوردی :

(١) ئەم ناونیشانە، ناونیشانی تەوەرێکە لەتەوەرەکانی کتێبێك بەناونیشانی :

An Empire of Wealth (The Epic History of American Economic Power)

لەنووسینی :John Steele Jordon

کەوا بەناونیشانی (الامبراگوریه الپوره) بەشێکی کتێبەکە لەلایەن : نجم الدین باکیر لە زنجیرە(٥٧)ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٨ی گۆگدڤاری العالم المعرفه) بڵاوکراوەتەوە .

٢– ئەبراهام لینکلن : Abraham Lincoln شازدەمین سەرۆکی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بوو، لە کۆمارییەکان بوو .لە نێوان ساڵی١٨٦١–١٨٦٥ سەرۆکایەتی ولاتی کردووە .لەسەردەمی ئەمەداجەنگی ناوخۆی ئەمەریکا هەڵگیرسا .لە٤ی نیسانی ١٨٦٥ تیرۆر کرا .بۆزانیاری زیاتر بڕوانە : الان نیڤینز و هنری ستیل کوماجر،موجز تاریخ الولایات المتحده،ترجمه:محمد بدرالدین خلیل،الجزوالپانی،دارالمعارف،القاهره،١٩٧٦،ص١٩٥ ومابعدها .

٣– هێنری هێدسن Henry Hudson بۆحیسابی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەلاتی هۆڵەندی،لە کەنداوی نیۆیۆرك و دۆڵی زێی هێدسن کاری دەکرد.بڕوانە : د.رافت غنیمی الشیخ،امریکا و العالم فی التاریخ الحدیپ و المعاصر،الگبعه الاولی،مگبعه صحوه،مصر،٢٠٠٦،ص٢٢ .

٤–

٥– نیو ئینگلاند New England :یان ئینگلترای نوێ ، ئەم ناوچەیە بەناوی ئینگلترا ناونراوە،چونکە لەلایەن ئەوانەوە ئاوەدان کرایەوە،کەوا دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەلاتی ولاتە یەکگرتووەکان و چەند نشینگەیەکی تێدا دامەزرا .د.رافت غنیمی الشیخ،المصدرالسابق،ص١٨.

٦– کریستۆفەر کۆلۆمبوس Christopher Columbus(١٤٥١–١٥٠٦) دەریاوانێکی ئیتالی بوو. لە ئابی ١٤٩٢ لەکەنارەکانی ئیسپانیاوە لەگەڵ ٨٧ کەسی تردابەسێ کەشتی ڕێگای دەریایان گرت و لە ١٢ی تشرینی

یەکەمدا گەیشتنە دوورگەی سان سلفادۆر،ئینجا لەکوباوهایتی و دوورگەکانی کاریبی دابەزین و لکاندنی ئەو ناوچانەیان بە ئیسپانیا ڕاگەیاند . لە ئاداری ١٤٩٣ بۆ ئیسپانیا گەڕانەوە . دواتر لەمیانەی ئەنجامدانی سێ گەشتی تردا چەند ناوچەیەکی تریان لەدەریای کاریبی و کەنارەکانی ئەمەریکای ناوەڕاست لە نزیک پەنەما دۆزییەوە .بڕوانە: د.محمد محمد صالح،تاریخ اوربا من عصر النهچە وحتی الپورە الفرنسیە ١٥٠٠-١٧٨٩،مگبعە دار الجاحف،بغداد،١٩٨٢،ص١٤٢-١٤٥ .

٧- شارستانیەتی هیندیە سوورەکان نیشانەیەکی وێکچوونی ئەوتۆیان لەگەڵ شارستانیەتیەکانی ئاسیادا نەبوو. هەروەها ئەوشارستانیەتیە بەر لە گەیشتنی کۆلۆمبوس بۆ ناوچەکە ، جیاوازییەکی ڕیشەیی لەگەڵ شارستانیەتە باوەکانی ئەورووپای سەردەمی دۆزینەوە جوگرافییەکانی سەدەی چواردەوپازدەدا هەبوو.لە گرینگترین شارستانیەتی هیندییەکان:شارستانیەتی(ئەزتیك ، ئەنكاس و مایاس )بوون .بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی ڕوالەتەکانی شارستانیەتی هیندییەکان بڕوانە : د.عبدالعزیز سلیمان نوار و د.عبدالمجید نعنعی،تاریخ الولایات المتحدە الامریکیە الحدیپ،دار النهچە العربیە،بیروت،١٩٧٣،ص٢٠ وما بعدها .

٨- خۆراك كۆكەرەوەکان:واتە ئەوانەی لەسروشتدا خۆراکیان کۆدەکردەوە ،لەم ڕووەوە گەڵاوبەری درەخت و ڕەگی ڕووەکەکان سەرچاوەی سەرەکی خۆراکی ڕۆژانەیان بوو .

٩- هەرچەندە زانیاری هەیە لەبارەی ئەوەی کەوا چاپکردن بە پیتە بزێوەکان (الحروف المتحرکە) بۆ یەکەم جار لەلایەن کەسێکی هۆڵەندی بەناوی (لۆرانس کاستەر)و لەکۆتاییەکانی سەدەی پازدەدا بەکارهاتبێ ، بەڵام بەڵگەیەکی چەسپاونییە تاکو ئەوە بسەلمێنێ کەوا ئەم پیاوە ئامێری چاپی داهێنابێ . کەچی ئەوەی زانراوە ئەوەیە کە (جۆن گوتنبێرگ)ی ئەڵمانی لە شاری (مینز)دا لەدەوروبەری ساڵی ١٤٥٠ز پیتی بزێوی بۆ چاپ بەکار هێناوە . کۆنترین دەستنووسی چاپکراویش بریتیيە لە(رسائل الغفران)وەرگێڕانی ئینجیل کەوا لەساڵی ١٤٥٤ز لەلایەن گوتنبێرگ چاپ کراوە .

بڕوانە : د.محمد محمد صالح،المصدر السابق ، ص٧٥ .

١٠- لە ٢٩ی ئایاری ١٤٥٣ز و لەسەردەمی سوڵتان محەمەدی دووەم(١٤٥١-١٤٨١ز) عوسمانییەکان دەستیان بەسەر قوستەنتینییە داگرت و پاش ئەوەش ناوی گۆڕدراوە بۆ ئیسلامبۆل (ئەستانبۆل)و کرایە پایتەختی تازەی دەوڵەتەکەیان . محمد فرید بك المحامی ، تاریخ الدولە العلیە العپمانیە ، دار الجیل ، بیروت ، ١٩٧٧ ، ص ٦٠-٦١ .

١١- لەسەردەمی سوڵتان سلێمانی قانونی(١٥٢٠-١٥٦٦ز) فراوانخوازی عوسمانیەکان لە ئەورووپا دا گەیشتە دەروازەکانی ڤییەننا، بەڵام نەیانتوانی ئەم شارە بگرن .لەگەڵ ئەوەشدا توانیان ناوچەیەکی بەرفراوان لە

مەجەر بخەنە سەر موڵکەکانی تری دەوڵەتەکەیان .بڕوانە : احمد عبدالرحیم مصگفی،فی‌الاصول التاریخ العیمانی،الگبعه‌الاولی،دار الشروق،بیروت،١٩٨٢،ص ٩٠ .

١٢- مەبەست لەچاخەکانی ناوەڕاستە، کە بە کۆتایی هاتنی چاخەکانی کۆن دەست پێدەکات و بەهاتنی سەردەمی ڕێنیسانس ودەسپێکی چاخەکانی نوێ کۆتایی پێ دێت .لەبارەی مێژووی ئەوروپا لەم سەردەمە بڕوانە:د.السید الباز العرینی،تاریخ اوربا العصور الوسگی، دار النهچه‌العربیه،بیروت،١٩٨٦ .

١٣- یان لوتکەی هیوای چاکە (The cape of good Hope) مەبەست لە کەنارەکانی ئەوپەڕی باشووری کیشوەری ئەفریقایە ، کەوا لە ساڵی ١٤٨٨ز دا دەریاوانی پورتوگاڵی بریتلومیو دیاز پێی گەیشت و ناوی لێ نا (لوتکەی گێژەڵووکەکان The cape of Storm) ، بەڵام پاش گەڕانەوەی بۆ لیشبۆنە ناوەکەی بۆ لوتکەی هیوای چاکە گۆڕدرا . بڕوانە : د.محمد محمد صالح ، المصدر السابق ، ص ١٤٢ .

١٤- لە ڕاستیدا تەنها شوێنەواری یەك وشەی نهێنی ولاتا کەبریتی بوو لە(کرۆتێن Croatian) لە سەر قەدی درەختێك بەجێ مابوو.گەشتەکەی( والتەر ڕالی) یش کەوا لەساڵی ١٥٨٧ ئەنجامی دا چوارەمین گەشتی بوو بۆ ناوچەکە ئەنجامی دا . بڕوانە : د. محمد محمد صالح ، المصدر السابق ، ص ٥٠٩ .

١٥- کۆمپانیا پشکدارەکان :مەبەست لەو کۆمپانیایانەیە کەوا زیاتر لە کەسێك لایەنێك پشکیان تێدا هەبووە .کۆمپانیای لەندەن و کۆمپانیای پلایماوس لەو کۆمپانیایانەبوون کەوا جیاوگی چالاکی بازرگانی و دامەزراندنی نشینگەیان لە چەند ناوچەیەکی دیاریکراوی ئەمەریکا پێ درابوو . بڕوانە : الان نیڤینز وهنری ستیڤن کوماجر ، المصدر السابق ، ص١٥.

١٦- نموونە لەم بارەیەوە دوا گەشتی والتەر ڕالی بوو کەوا بێ سۆراخ مایەوە ، بەر لەوەش دووەم گەشتی هامفری گێلبەرت بوو لەساڵی ١٥٨٣ دا کەبە ونبوونیان لە دەریا کۆتایی پێ هات . د. محمد محمد صالح ، المصدر السابق ، ص ٥٠٨ .

١٧- لە هەندێ سەرچاوەدا بەناوی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەلاتی هۆلەندی ناوی هاتووە ، ئەمەش بۆ جیاکردنەوەی لە کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی بەریتانییە .

١٨- جێمسی یەکەم James I شای ئینگلترا بوو(١٦٠٣-١٦٢٥) . کەسێکی ڕاڕابووە لە بڕیاردانداا .شارەزایی لەبارەی ئینگلترا و گەلەکەی و دەستووری وڵات کەم بووە . هەوڵی داوە بەشێوەیەکی ڕەها فەرمانڕەوایی وڵات بکات و پرینسیپی مافی خواوەندێتی شاهانە (حق الملوك الالهی ) پیادە بکات .توندو تیژبووە لە بەرامبەر ئەو تایەفە ئاینییەی کەوا بە (پیۆریتانە زاهیدەکان) ناسرابوون . لە سەردەمی ئەودا ژمارەیەکی زۆر لە پیۆریتانەکان بۆ ئەمەریکا کۆچیان کرد . بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:

د. محمد محمد صالح ، المصدر السابق ، ص ٤٧٩ .

١٩- پاش ئەوەی کۆمپانیای ڤێرجینیا جیاوگی لە شا جێمس وەرگەرت بە دامەزراندنی دوو کۆمپانیای لاوەکی تر ، کەبریتی بوون لە کۆمپانیای لەندەن و کۆمپانیای پلای ماوس ، یەکەمیان جیاوگی بازرگانی و نیشتە جێکردنی لە ناوچەکانی نێوان هێڵەکانی پانی ٣٤-٤١ و دووەمیشیان لەنێوان ٣٨-٤٣ پلەی باکوور پێ درا .د. محمد محمد صالح ، المصدر السابق ، ص ٥١٠ ،

٢٠- پاش ئەوەی نرخی توتن لەبازارەکانی لەندەن بەرزبوونەوەی بەخۆوە بینی ، هەموولایەك دەستیان کرد بە چاندنی توتن . هەتا گۆرەپانی شاری جێمس تاون خۆیشی بەتوتن چێنرابوو . د. عبدالعزیز سلیمان نوار و د. عبدالمجید نعنعی ، المصدر السابق ، ص ١١ .

٢١- لەبەر ئەوەی بەرژەوەندی کۆمپانیاکە لەگەڵ ئەو سیستمی باجەی کەوا شا جێمس بە سەریدا سەپاندبووی یەکی نەدەگرتەوە ، بۆیە ناوبراو مافی جیاوگی لە کۆمپانیایەکە وەرگرتەوەو نشینگەکەشی کردە ناوچەیەکی شاهانە، کەوا لە سایەی ئەنجومەنێکی بچووك و یەکێکی تری یاسادانانەدا بەرێوە دەبرا . بەمەش ڤێرجینیا بوو بە یەکەم موقاتەعەی شاهانەی ئینگلیزی لە ئەمەریکا . بروانە : د. محمد محمد صالح ، المصدر السابق ، ص ٥١٢ .

# تراژیدیای " عبد المحسن سعدون "

و: شەماڵ ئەحمەد

دوای ئـەوەی کـە(عبـد الـرحمن نقیـب) لەسـاڵی ١٩٢٢ لەهـەوڵ وبیروباروەرەکـانی دا شکـستی هێنـا، وزیاترهەوڵەکانی لەنێوان پێ هەڵگرتن وکەوتن دابوو لەئەنجام دا خانەی متمانەی بەریتانی هەوڵەکانی خۆی خستە گەڕبۆ هەڵبژاردنی (عبد المحسن سعدون ) لـەپێناوپێك هێنـانی وەزارەتـدا ،بـەلآم کەمینەیەك لەگەڵ عێـراق دژی هەڵبـژاردنی ئەنجومـەنی دامەزرانـدن وەسـتانەوە ولەباشـوری عێـراق چـەندین فتـوا ونـاڕەزایی دەربارەی ئەم هەڵبژاردنە دەرکرا کەپەیوەست بوو بەقەدەغەکردنی بەشداربوون لەم هەڵبژاردنەدا.

لەناوەڕاستی ئەم کـەش وهەوایەتوندوتیـژە وڕوحـی بەگژاچـوونەوەی دەسـەلآتدا ،عبد المحسن سعدون توانی بەخۆڕاگری وئیرادەوە ڕێگای خۆی کەرت بکات بۆ هەڵبژاردنی یەکـەم ئەنجومـەنی دامەزرانـدن کـەبووە سەرەتاییەك بۆدانانی بنەڕەت وبناغەی دەستوری عێراقی ،جگە لەهەڵچوون وترسی زۆری خەڵك کەنزێك بـوو شۆڕش هەڵبگیرسێ لەدژی مەلیك فەیسەل ئەمەش زیاتر بەهۆی ئەوەی کـە(مهـدی خـالص) کەگـەورە پیـاوی تێکۆشەران بوو لەگەڵ چەند دەست وپێوەندێکدا ڕەوانەی دەرەوەی عێـراق کـرا کـەخۆی لـەخۆی دا ڕۆڵێکـی بەرچاوی هەبوو لەسەرنەخستنی بەڕێوەچوونی هەڵبژاردنەکان دا ...

(عبد المحسن سـعدون) تـوانی هـەنگاوی فـراوان بنێـت بـۆ بـەجێ هێنـانی هەڵبژاردنـەکان وسـەرکەوتنی لەدەستەمۆکردنی تەگەرە وکارە ئاڵۆزەکانی بەرامبەری ئەمەش زیاتر دەسەلآتی خـۆی پـێ تۆکمـەکرد، جگـە لەوەش توانی وەك پیـاوێکی بـەهێزی عێراقـی بـەئیرادە وجورئـەتی خـۆی بـەرەنگاری ڕوودلوە سیاسـیەکانی عێراق بێتەوە ئـەم کارانەشـی وایکـرد کەببێتـە جێگـەی متمانـەپێکراوی بەریتانیـەکان وزیـاتر بـەلای خۆیانـدا ڕایکێشن ،عبدالمحسن سعدون لەم کاتەدا زیاتر دەیویست هاوکاری سەربازی لە بەریتانیا وەرگرێ ولەباوەڕەدا بوو کەعێراق ناتوانێ بەتەنها ئامانج ومەرامەکانی بهێنێتە دی بەتایبەتی لایەنی ئەمنی وئابوری، جگە لـەوەش سنوری عێـراق لەئاراسـتەی بـاکوور وباشـوری ڕۆژهەلآتـەوە جێـی مەترسـی گـەورەن ،بۆیـە بەبۆچـوونی ئـەو بەریتانیا تاکە دەوڵەتە کەدەتوانێ سنوری عێراق بپارێزێ لەچاوچنۆکی وهێرشی دوژمنەکانی .

سەرەڕای ئەوەی کەئەم بۆچوونانە جێی ڕەزامەندی گەلیش نەبوون بەڵام عبد المحسن سعدون زۆر بەڕاشکاوی ئاشکرای کرد، ئەمش بووە هۆی ئەوەی کەکۆمەڵێك کەس وپیاوی سیاسی لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە وبەهەموویانەوە حیزبێکی بچووکیان دابمەزرێنن بەناوی (حیزبی پێشکەوتن ) کەلەپێناو میتۆد وڕێبازێکی تایبەتیدا کاری دەکرد .

لەم کاتەدا کەسایەتیەکی سیاسی بەناوی (یاسین هاشمی) ببووە نەیاری سەعدون وتەگەرەی لەبەردەم خواست وکارەکانیدا دروست کرد، کە لەرێگەی حیزبی گەلەوە ململانێی سیاسی لەگەڵ دەکرد وپلانێکی دیکەی لەدژی تۆمار کرد کەلەسەر ڕێبازی (وەربگرە وداوا بکە) یاخود ململانێی لەپێناو دەستکەوت دا، وە ئەم حیزبەی هاشمی زیاتر هانی بەرەی ئۆپۆزسیۆنی دەدا بۆ زیاتر لاوازکردنی باڵی سەعدون .

ناکۆکی وململانێی نێوان ئەم دووحیزبە ساتێك توندوتیژوساتێکیش ئارام بوو ،مەلیك فەیسەڵیش زۆر جار خۆی لەم ناکۆکییە ودوور دەخستەوە ،ولەمیانەی ئەم ململانێیەدا مەلیك هەوڵی دەدا کەسایەتی وبوونی خۆی بدۆزێتەوە ئەویش لەرێگەی ناردنی یەکێك لەهەواڵگرەکانی ،بەتایبەتی (جعفر العسکری) کەزۆر بەڕاشکاوی گووتبووی "گەر پیاوانی حیزبی پێشکەوتن کۆبوونەوە ئەنجام بدەن وڕێگە بەمن نەدەن لەدەرگاوە بچمە ژوورەوە ئەوا بێگومان لەپەنجەرەوە بەبێ ترس دەچمە ژوورەوە ".

ئەو ڕێبازە سیاسیەی کەسەعدون پەیڕەوی دەکرد بووە مایەی دروست بوونی ئۆپۆزیسیۆنی جۆراوجۆر لەناوچەکانی عێراق ،هەندێك لەناوەندەکانی کۆمەڵگە لەوبڕوایەدا بوون کەئەم سیاسەتە ئاسانکارییە بۆ داگیرکردن نەك سەلماندنی ئامانجە نەتەوایەتیەکان ،پێ ئەچێ مەلیك فەیسەڵ پشتگیری ئەم بۆچوونەی خەڵکی کردبێت بەشێوازێکی شاراوە ،زیاتر لەچارەنووس وپێگەی دەسەڵاتی خۆی دەترسا وڕاراییەکی پێوە دیاربوو ،چونکە خانەی متمانەی بەریتانی تادەهات زیاتر بایەخ وگرنگی بەچالاکیەکانی سەعدون دەدا سەروەرێتی فەیسەلی سنووردار دەکرد ،لەم کاتەدا فەیسەڵ هەوڵی دەدا زیاتر ئینگلیز هان بدات بۆ هەڵبژاردنی کەسێکی دیکە، لەراستیدا تەنها (عبد الرحمن نقیب ) بوو کە بتوانێ ببێتە ئەلتەرناتیڤی سەعدون کەزیاتر لەلایەن برسی کۆکسی نێردراوی سیاسی عێراقەوە پشتگیری لێی دەکرا...

مەلیك فەیسەڵ هەوڵی دەدا بەشێوازێکی گاڵتەجاڕی عبد الرحمن نقیب لەکورسی سەرۆك وەزیران دووربخاتەوە بەهۆی ئەوەی کەباوەڕی پێی نەبوو ولەهەمان کاتدا لێی دەترسا کەشوێنی پێ لەق بکات وتەختی داگیر بکات، هەوڵە خێرایەکانی فەیسەل کاریگەری ڕاستەوخۆی هەبوو بۆ سەر کەسایەتی نەقیب کەزۆر جار لەترسی فەیسەڵ پەنای دەبردە بەر برسی کۆکس بۆ یارمەتیدانی ،ئەم هەڵوێستەی نەقیب لەزۆر ڕۆژنامە وگۆڤارەکاندا دەنگ ورەنگی دابووەوە وبەشێوازی کاریکاتێری وێنەی نەقیب دەخرایە ڕوو

کەبەدەستێکی دەستنووسی وازهێنانی لەوەزارەت وبەدەستەکەی تریشی کاغەزی تەکلیفکردنی لەبرسی کۆکس بەرزکردبوەوە بۆ پێك هێنانی وەزارەت .

دوای ئەوی کەئینگلیز دەستی عبد الرحمن نقیب یان لەوەزارەت دوور خستەوە مەلیك بەتەنها مایەوە ئەمەش هەلێکی زێرینی بۆ رەخساند تا بەئاسوودەیی لەسەر کورسی حوکم بمێنێتەوە بەلام زۆر جار تووشی بێئومێد بوون دەبوو کاتێك خانەی متمانەی بەریتانی هەوڵی نزیك بوونەوەی عبد المحسن سعدون یان دەدا ..

مەلیك فەیسەل بەشێوازێکی نهێنی دەستی کرد بەبلاوکردنەوەی کاری پروپاگەندە وناوزڕاندن لەدژی عبد المحسن سعدون ،هەروەها سنووردارکردن وکەم کردنەوەی تواناکانی سەعدون لەنێو چین وتوێژەکانی گەلی عێراق دا وبەچەند رێباز وهەڵوێستێك هەوڵی نانەوەی کۆسپ وتەگەرەی دا لەبەرامبەر کارەکانی سەعدون دا ئەم هەولانەشی بۆیە دا تاوەکو زیاتر هەل لەبەردەم دامەزراندنی وەزارەت بۆ خۆی دروست ببێت و وەزارەتەکەش زیاتر مۆرکێکی فەیسەلی پێوە دیاربێت ،بۆئەم مەبەستەش فەیسەل لەچەند بوارێکدا هەولی سەرکەوتنی ئەم کارەی دا ..

عبد المحسن سعدون زۆر بەخۆراگری وهێمنانە بەرەنگاری ئەم دەردەسەرییەی فەیسەل بووەوە سەرەرای ئەوەی کەحیزبەکەی تووشی لەبەریەك هەلوەشانەوەیەکی خراپ بوو بەهۆی کارەکانی فەیسەلەوە ،بەلام سەعدون هەرلەسەر کارەکانی خۆی سوور بوو وپێی وابوو کەدەکرێ گرفتی موسڵ یەکلا بکرێتەوە وعێراقیش روو لەسەقامگیری بکات ،سەعدون لەساڵی ١٩٢٨ دەستی کرد بەرێکخستن وپوختەکردنی هەردوو رێککەوتنامەی سەربازی ودارایی نێوان عێراق وبەریتانیا ولەم رێککەوتنامەدا لەسەر چەند خاڵێك رێکەوتبوو لەوانە پێویستە عێراق بەرپرسیارێتی ئاسایشی ناوخۆ ودەرەوەی وولات لەئەستۆ بگرێت ،وەژمارەی سەربازانی ئینگلیز لەنێو سوپای عێراق دا کەم بکرێتەوە، سەرەرای ئەوەش بەڵێنی حوکمی عورفی بەئەفسەرانی عێراق بدرێ نەك بەریتانیەکان وپێویستە عێراق چاو لەخەرجی وبژێوی خانەی متمانەی بەریتانی نەکات وبەتوانای خۆی پرۆژەی دامەزراندنی هێلی شەمەندەفەربەئەنجام بگەیەنێت، بۆیە رێکەوتنامەی دارایی وسەربازی بۆماوەی چوار ساڵ سنووردار کرا .

سەعدون بەم هەلوێست وپەیمانانەیەوە زۆر پابەند بوو کەبۆیەکەم جار بووە هۆی پێکدادانی لەگەڵ خانەی متمانەی بەریتانی، جگەلەمەش نەیار ودوژمنی زۆری بۆ پەیابوو وهێرشی توندی کرایە سەر بەلام چەند کەسێك لەهاورێکانی وەك ( جەعفەر ابو تمن) پشتگیری وکۆمەکی زۆریان کرد ..

(هنری دۆبس ) نێردراوی سیاسی بەریتانی لەعێراق هەولی بێ ووچانی دا بۆ چارەسەرکردنی ئەم قەیرانە ئەوەبوو داوای کرد لەسەعدون کەلەبەرلەمان دا جۆرە تێگەیشتنێك دروست بکات لەنێوان خۆی وبەریتانیادا

بۆ مانەوەی ڕێکەوتنامەی سەربازی ودارایی (بەریتانی _عێراقی ) بەبێ هیچ قەید ومەرجێك بۆ کاتێکی دیاری کراو، بەلاّم سەعدون ئەم داوایەی پێ قبول نەبوو،بەتایبەتی دوای کۆکردنەوەی ئەندامانی حیزبەکەی (پێشکەوتن) پاشان نامەیەکی نهێنی نووسی بۆ (هنری دۆبس) وتیایدا ئاماژەی بەوە کرد کەئەو پیاوێکە پابەندە بەکەرامەت وەهەلّوێستی مرۆڤایەتیەوە ورازی نیەکەلە بەرامبەر ڕای گشتی دا پەشیمان ببێتەوە لەبڕیارەکانی،ورێزی زۆری لەبەرەی تۆبۆزیسیۆن دەگرت ونرخی تایبەتیان بۆ دادەنا.

لەنێو نامەکەدا نووسیبووی ((وادانیێ کەحکومەت بەیارمەتی حیزبەکەی تولنی قەناعەت بەئەنجومەن بهێنێ بۆ دەسەلاّت گرتنە دەست بەلاّم ناتوانێ درێژە بەمانەوەی خۆی بدات ،لێرەدا نەیارانی هەموو ڕێگەیەك دەگرنە بەر بۆ هەلّوەشاندنەوەی وەزارەت، ولەوانەشە ئەم نارەزایی وپێکدادانە یان ببێتە هۆی تێکچوونی بواری ئاسایشی وولاّت وئاکامی خراپی لێدەکەوێتەوە بۆ وولاّت کەکەس نازانێ تاچەند درێژە دەکێشێ، وپێی وابوو کەپراکتیزەکردنی ڕێکەوتنامەی سەربازی ودارایی مانایی گەڕانەوەیە بۆ سەردەمی زاڵبوون وستەمکاری وپەسەندکردنی ئەم حالّەتش دەبێتە مایەی نەبوونی ئاشتی وئارامی بۆ گەل وکەرامەتی وەزارەتیش دەچێتە خانی زبلّدانەوە ،لەسەر بنەمایی ئەم ڕەچاوکردنانە لەبەرامبەر وەزارەت هیچ ڕێگایەك نامێنێ بۆ ڕزگاربوون لەم تەنگ وچەلّمە تەنها بەوازهێنان کۆتایی پێدێت وقووتاری دەبێت .

بێگومان ئەم نزیك بوونەوەی نێوان بەرەی ئۆ پۆزیسیۆن وبەرەی سەعدون بووە هاندەرێك وپالّپێوەنانێکی زیاتر بۆ سەعدون تازیاتر هەنگاو بنێ بەرەو هاوکاری کردن لەگەلّ ئەو ڕەگەز وئەندامانی کەنیشتمانی ونەتەوەیین ،بۆیە سەعدون ئەزموونێکی نوێ لەوەزارەتدا هێنایە کایەوە ،وسەرەڕایی ئەمەش یاسین هاشمی وەك سەرۆکی حیزبی گەل هاوکاری زۆری سەعدونی کرد لەدانوساندنەکانی نێو وەزارەت دا .

هاتنی یاسین هاشمی بۆ نێو وەزارەتی سەعدون بووە جێگەی نارەزایی لای ئەندامانی حیزبی پێشکەوتن دا لەوانە (شێخ ئەحمەد داود) کەپێیان وابوو حیزبی شەعب بەربەستێکە لەبەردەم پێکهاتنی لایەنەکاندا وبەتایبەتی ئەم حیزبەش سێبەر ودەسەلاّتی ڕووی لەکەمی کردووە ولەڕیزەکانی دا ئەندامی زۆر نەماوون تەنها محمود صبحی دفتری ویاسین هاشمی نەبن ،هەربۆیە جارێکیان دفتری لەپاش تەواوبوونی مشتومڕ ووتوێژکردنی نێو کۆبوونەوەی وەزیرەکان بەگالّتەپێکردنەوە لەبانەیەکی سیاسی دا ووتبووی "چۆن وەزارەت نایەتە پێکهاتن لەکاتێکدا کەنیوەی حیزبی گەل تێدا بەشداربێت ".

بێگومان کەسایەتی یاسین هاشمی تابلّێی کەسایەتیەکی ناوبانگ وسەرنج ڕاکێش بوو لای خەلّك وبوون بەئەندامی لەحیزبی پێشکەوتن دا گوڕوتینێکی گەورەی بەحیزبەکە بەخشی وسەنترالیزمی حیزبەکەی تۆکمەترکرد وهێزێکی زۆری لەدەورووبەرەوە بۆ ڕاکێشا.

زۆربەی توێژەران لەو باوەڕەدابوون کەهەرەس هێنانی حیزبی پارێزگاران لەهەڵبژاردنەکانی ئینگلتەرا لەساڵی ١٩٢٨ گۆڕانکارییەکی سیاسی گەورەی لەبەریتانیادروست کرد ئەویش بەهاتنە سەر دەسەلاتی حیزبی کرێکاران ،کەلەساڵی ١٩٢٩لەوەزارەتی بەریتانیاوە بریارێکی کتوپڕ دەرچوو کەبەڵێنی بەعێراق دا ببێتە ئەندام لەکۆمەڵی گەلان،ئەوەبوو لەساڵی ١٩٣٢عێراق بووە ئەندام لەو کۆمەڵەیە ،ڕۆژگارە نەشیاو وخراپیەکانی (دۆبس) کۆتایی پێهات وپەیوەندییەکی سیاسی نوێ لەنێوان هەردوو وڵات (عێراق _ بەریتانیا ) دەستی پێکرد ،لەم کاتەوە سەعدون دەستی کرد بەدامەزراندنی وەزارەتی نوێ بۆ بەرەنگاربوونەوەی هەڵوێستی نوێی بەریتانیا لەنەخشەدانان ومەبەستەکانی دا ...

پاشان سەعدون پرۆگرام وبەرنامەی وەزارەتەکەی خستەڕوو بەوەی کەئامانجی زیاتر خستنەڕووی سەرخستنی بزووتنەوەی نەتەوایەتیە ،ئەم هەڵوێستەی سەعدون ببووە مایەی تووڕەبوونی خانەی متمانەی بەریتانی وبەتوندی وەڵامی درایەوە وجۆرە توندوتیژییەکی مەعنەوی لەنێوانیان دا ڕووی دا .

سەعدون کۆمەڵێك خاڵ وڕوونکردنەوەی جیاوازی لەوەزارەتەکەیدا خستە ڕوو لەوانە کارکردن بۆلابردنی هەموو سیفەت ومۆرکێکی داگیرکردن بەنێو چەوانی گەلی عێراقەوە "، "کۆتایی هێنان بەبەرپرسیارێتی حکومەتی بەریتانیا بۆ مەسەلەی بەرگری کردن " ، "جێ بەجێ کردنی پرۆسەی سەربازی کردن بەشێوازێکی خێرا "،"بەستنەوەی دەسەلاتە گشتییەکان بەکەسایەتی وەزیرەوە " .

هەرلەسەرەتای ڕۆژانی یەکەمی پێك هێنانی وەزارەتەوە سەعدون بەڕوح وئیرادەیەکی نوێوە هاتە نێو مەیدانی سیاسەتەوە کەئەو زیاتر پیاوێکی ناسراو بووە بە بێدەگی وخۆڕاگری ونهێنی پارێز ناسراووبوو .سەعدون لەمەو دوا لەووتارەکانی دا کۆمەڵێك ووشە ودەستەواژەی جیاواز ی بەکاردەهێنا کەلەوەوپێش شتی وای بەکارنەهێنا بوو وزیاتر لەدەربڕینەکانیدا ڕێبازی خوێن ڕشتن وکوشتن وتوندوتیژی بەکاردەهێنا ،لەسەر ئەم بیروباوەڕانەی پەشیمان نەبووەوە ولەدانشتنێکی پەرلەمانیدا لەلایەن بەریتانیاوە هێرشێکی گەورە کرایە سەری وئەندام بوونی عێراق لەکۆمەڵەی گەلان دا چووە حاڵەتێکی گوومانابیەوە وپرسیاری دەکرد دەربارەی گرەنتی جێبەجێکردنیەوە ،بەڵام سەعدون بەتووڕەییەوە لەپەرلەمان داوەڵامی بەریتانیای دایەوە وگووتی "ئەم دەربڕینە کەدەڵی عێراق دەبێتە ئەندام لەکۆمەڵەی گەلان بێبایەخ نیە بەڵکو گرنگیەکی تایبەتی خۆی هەیەچونکە بەوەرگرتنی عێراق لەو کۆمەڵەیە سەردەمی پەیماننامە وڕێکەوتنامەکان کۆتایی پێدێت وڕێکەوتنامەی نوێ دێتە کایەوە کەلەسەر بنەمای (سەربەخۆی گشتی عێراق )دەبێت ئەم دەربڕینە کەلەلایە حکومەتی بەریتانیاوە ووتراوە،نابێتە هۆی نەمانی گرفتەکەش چونکە گەر وەزارەتی حیزبی کرێکاران ڕووخا پێویستە ئەو دەربڕینە هەر بمێنێ ،بەڵام گەر ناکۆکیەك دروست بوو ئەوا لەوبڕوایەدام کەسەربەخۆی عێراق

دەکرێ بکەوێتە ئەستۆی ئیرادە وجورئەتی گەلی خۆیەوە ،گەلی عێراقیش کەسەربەخۆی دەوێ بەووشە وقسەی بەتاڵ نابێت بەڵکو هێز وقوربانی دانی دەوێت، هەندێك لە مێژوونوسان پێیان وایە کەدێڕی کۆتایی ووتەکانی لەپەرلەمان دا بەزمانی ریفی خۆی گووتوویەتی کەدەڵی (الاستقلال یؤخذ بالبنادق )واتا سەربەخۆبوون بەتفەنگ وچەك بەدەست دەهێنرێت .

بەهۆی گووتە ودەربڕینە بوێرەکانی سەعدون پەرلەمان تووشی شڵەژانێکی بێوێنە بوو ،کۆمەڵێك لایەنگر ودۆستی ووتەکانی بوون وهوتافیان بۆ لێ دەدا وکۆمەڵێکی دیکە دژی دەوەستانەوە ولەم کاتەدا مەلیك فەیسەڵ تووشی ڕاڕا ونیگەرانی بوو وبەناچاری ڕووی کردە خانەی متمانەی بەریتانی وبەچاوبڕینێکی تکا کردنەوە کەزۆر پەشۆکاوبوو پرسیاری لێکردن ((ئەم پیاوە چ تەڵەیەکی ناوەتەوە تاپێمان دا بتەقێنەوە ))،دواتر ڕۆژنامەکانی وەك (الاوقات العراقیة) پشتگیری وهەستی خۆیان لەبۆ سەرکەوتنەکانی سەعدون دەربڕی وخەڵکی سەرشەقام ونێو یانە وقاوەخانەکان ومزگەوتەکان قسەو باس ومقۆ مقۆ یان دەستی پێکرد دەربارەی ئەوەی کەسەرۆك وەزیر بانگەشەی شۆڕش وچەك هەڵگرتن دەکا بۆ دەرکردنی ئینگلیز وسەربەخۆبوونی عێراق ،بەڵام مایەی دڵنیگەرانی بوو کەخەڵکێکی زۆر هێرشی توندیان کردە سەر سەعدون وبەکرێ گیراو وخزمەتکاری بەریتانیان تۆمەتبارکرا وئەمانەش کاریگەری نێگەتیڤی لەهەست و ویژدانی سەعدون دا بەجێهێشت، جگە لەمەش هێرش کرایە سەر کەسایەتی وکەرامەت وئینسانییەتیشی وسووکایەتی لەرادەبەدەری پێی کرا ئەویش کاتێك تەماشای دەوروبەری خۆی کرد هیچ کەس لەلایەنگرانی ئامادەی ئەوەی تێدا نەبوو کەبەرگری لەبۆ چوونەکانی بکات لەم کاتەدا سەعدون هەستی بەتەنهاییەکی بێ وێنە کرد ودونیای سیاسەتی لەبەرچاو ڕەش بوو وتووشی نائومێدی وڕەشبینیەکی گەورەبوو .

پاشان سەعدون زۆر نائومێدبوو لەئەندامانی حیزبەکەی وزۆر بەئاشکرا خۆیان لەهەڵوێستەکانی دزییەوە ،سەعدون هیچ وەڵامێکی توندی پێنەبوو بۆ هاوەڵان وئەندامانی حیزبەکەی تەنها ئەوە نەبێ کەدوای تەواوبوونی دانشتنی پەرلەمان بەزمانێکی سادە پێی گوتن (بۆچی کەستان بەرگریتان لەهەڵوێستم نەکرد )،سەرەرای ئەمەش سەعدون تادەهات نائومێد بوو لەگەل وچینی نیشتمانپەروەرانی وولاتەکەی ،خەڵك تادەهات گومانینان لەکاروکردەوەکانی دەهاتەوە وتەمومژی دەکەوتە نێوان پەیوەندییەکانیان ...

هەروەها سەعدون نائومێدیش بوو لەسیاسەت وجموجۆڵە سیاسیەکانی بەریتانیا بەتایبەتی خانەی متمانەی بەریتانی وەچیدی بەرگەی ئەو هێرش وتۆمەتانەی نەدەگرت کەدەدرایە پاڵی وزیاتر خاوەن فیکرێکی خێڵەکی بوو ولەبڕوایەدابوو کە دانوساندن لەگەڵ داگیرکەری بەریتانیا هیچ سوودێکی نیە چونکە ئینگلیز ملنادا بۆ سەربەخۆی عێراق وبەڵێنەکانی هەمووی مۆری سەر کاغەزن وناچنە بواری جێبەجێکردنەوە .

سەعدون جارێکی تر نائومێد بوو لەفەیسەلّ ودەست وپێوەندەکانی کەبەردەوام بیرییان لەلەناوبردنی سەعدون وپلان دانان بۆ تیرۆکردنی دەکردەوە ئەمەش بەدووشێواز هەولێان بۆ دەدا ئەویش هاندانی نەیارانی ودوژمنانی لەلایەك وراکێشانی ئەندامانی حیزبەکەی لەلایەکی تر ،فەیسەل بەم رێگایانە هەوڵی دەدا کەئەندام وسیخورەکانی بەسەر حیزب دا زالّ بکات ،وجگە لەوەش ئەندامێکی زۆری حیزبەکەی سەعدون رووی تێکرد وتەنانەت حیزبی پێشکەوتن بەرێنماییەکانی فەیسەل کاری دەکرد ،ودەیویست لەرێگای ئەم کەسانەوە سەعدون بخاتە کارێکی ئالۆز وتەنگەتاوکردنەوە ،کاتێك کەحکمت سلێمان لەلایەن عبد المحسن سەعدونەوە پالێورا بۆسەرکردایەتی ئەنجوومەنی نوێنەران ئەندامانی حیزبەکەی دەستە وتاقمەکانی بەقسەییان نەدەکرد ولەبری ئەو (رشید عالی گیلانی)یان هەڵبژارد ،لەم کاتەدا فەیسەلّ هەوڵی خۆ دزینەوەی دەدا وخۆی دوور دەگرت لەو یارییە سیاسیە کەدەستیشی تێدابوو ،لەم کاتەدا سەعدون دەیوست بەناچاری دەست لەکاربکێشێتەوە ،تەنانەت کەسایەتیەکی وەك نوری سەعید جارێکیان بەپێکەنینەوە بەمەلیك فەیسەلی وتبوو "بۆچی پادشا هەربەیەکجاری هەوڵی لەناوبردنی حیزبی پێشکەوتن نادەی ولەرپیشە هەڵکێشی بکەی "ئەویش لەوەلآمدا گوتبووی "من باوەڕم وایە کەحیزبەکە لەناوەوەی خۆی دا بروخێ ئاسانترە وەك لەدەرەوە دا بروخێندرێ"..

سەعدون توشی بێئومێدی ورەشبینیەکی گەورە بوونەك تەنها لەهەموو ئەمانە بەڵکو لەخێزان ومالّەکەشی ،خێزانەکەی کەناوی "حۆریە هانم " بوو ،کەبەرەچەڵك تورکی ئەنازۆلی بوو ،ئەم خانمە بەردەوام هەوڵی دەدا کەئازار ونەهامەتیەکانی سەعدون کەم بکاتەوە وخەفەت وپەژارەکانی تیماربکات ،بەلآم بەپێچەوانەوە سەعدون هەست وخووی بەردەوام لەگۆران دابوو وتادەهات دۆگماتر وبەدبین تردەبوو ،توورەیی وگۆشەگیری رووی تێکرد ومالّەکەشی ببوە دۆزەخ ودەرگای حەوشەکەی بەرووی خزم ودۆست وکەس وکاری دا داخست وبەزمانی تورکی پێان دەگووت (پیس عەرەب ،پیس عەرەب ) ،سەعدون هیچ کات دوودلّ نەبوو لەو هەڵوێستانەی کەدینواند ،دەیەها بیانووی جۆراوجۆرییان بۆ دروست دەکرد بەلآم ئەو هەرسووربوو لەسەر کاری خۆی ورێگەی بەمیواناداران نەدەدا کەسەردانی بکەن ،ولەسەر ئەم نەریتەی بەردەوام بوو وحەزی نەدەکرد چاوی بەشێخانی عەرەب وهاورێکانی بکەوێ ،لەراستیدا شتێکی سادە وئاسان نیە بۆ کەسێکی وەك سەعدون کەشانازی بەکەرامەت وعەرەب بوونی خۆیەوە بکات کەچی لەپرێکدا دەرگای مالّەکەی لەبەرامبەر عەرەب و کەسە نزیکەکان وکورانی عەشیرەتەکەی خۆی دابخات و،سەرەرای ئەم خوو نەریتە ناشرینەی سەعدون خێزانەکەی بەردەوام لۆمەی دەکرد وئاگاداری دەکردەوە کەهەڵس وکەوتی خراپە دەبێت چاکی بکات ،سەعدون لەمالّەوەش بێزابوونێکی بێ وێنەی پێوە دیاربوو بۆ نموونە خواردن وچۆنێتی دانشتنی لەزوور

دا لەکەسێکی ئاسایی نەدەچوو ،هەرجارەی خواردنێکی خراپی دەخوارد وهەموو ئەو کەوچك وکەرەستە وقاپانەی کەشتی تێدا دەخوارد نەدەبوو کەس دەستی بۆ ببات چونکە بەدەستکاری کردنی لەلایەن هەرکەسێکەوە تووشی تووڕەبوون وهەڵچوونێکی خراپ دەبوو ،سەعدون زیاتر بەرەو گەوجێتی وشێتۆکەیەکی خراپ دەچوو وغیرەت ونیرادەیی تادەهات سست ولاواز دەبوەوە ..

بەم شێوازە سەعدوون تادەهات تووشی نەهامەتی و دەردەسەرییەکی بێ و ێنە دەبوو ئازار ونەشکەنجەی زۆری دەکێشا هەندێك جار هەوڵی خۆ دوورکەتنەوەی دەدا لەم نەهامەتیانە بەلام بێسوودبوو ولەناچاریدا پەنای دەبردەبەر مەی خواردنەوە یاری کاغەز ئەمەش بۆ زاڵ بوون بەسەر ئازارەکانیدا ..

ئەگەر هەرکەسێك گوێبیستی وتەکانی ببوایەئەواهەستی دەکرد کەئەم کەسایەتیە حەز بەژیان ناکات وعاشقی مەرگە ،جارێکیان هاوڕێیەکی "صباح نشات" هەواڵی مردنی کەسێکی بەسەعدون گووت کەدۆستێکی دێرینی بوو،سەعدون زۆر خەفەتباربوو وگووتی (خۆزگە من لەجیاتی ئەو بوومایە )،هەروەها جارێکی تریش وارێکەوت کەخێزانی عبد العزیز قصاب "وەزیری ناوخۆی وەزارەتەکەی سەعدون "کۆچی دوایی کرد ،لەرێورەسمی ناشتنەکەیدا سەعدون ئامادەبوو ،سەعدون زۆری پێ سەیر بوو کەقەصاب دەگریا وبەهاوڕێیەکی گووت (زۆرم پێ سەیرە کەئەو بەوشێوازە دەگری ) .

گومان وبۆ چوونەکانی سەعدون تادەهات زیاتر بوو ولەسەری کەڵە کەبوون وهۆکارەکانیشی زۆر تربوون وبیر وهۆشی کۆنترۆڵ دەکرد وڕەشبینیەکەی زیاد دەکرد لەبەرامبەر ژیان وهەموو ئەمانەش ڕێگا خۆشکەربوون بۆ پەنابردنە بەر حاڵەتی خۆکووشتن (الانتحار) ..

تورەیی ورەشبینی سەعدون لەلاوازی وبێدەسەلاتی کەسایەتی سەعدون خۆیەوە سەرچاوەی گرتبوو ،بەشێوازێك کەنەیدەتوانی لەبەرامبەر ئەم بیر وهزرانەدا خۆڕاگر وسەربەخۆ بێت ئەمەش بەتایبەتی دوای ئەوەی کەسەعدون هەستی کرد کەئەم هێرشانەی کەدەکرێتە سەری لەناوەندی ئەنجومەنی نوێنەرانەوە گواستراوەتەوە بۆ نێو بیر وبۆچوونەکانی خەڵکی سەر شەقام وتادەهات ئازار ونەهامەتیەکانی زیادی دەکرد ونەیدەتوانی بەئاسانی بیشارێتەوە .

لەسەر ڕۆژنامە ودەزگاکانی بلاوکردنەوەکان ونامەی کەسایەتیە بەناوبانگە سیاسیەکانیش هێرشی توند کرایە سەری ،بۆ نموونە "مزاحم امین باچەچی " ووتارێکی بەناونیشانی "بەلای نیشتمانی " بلاوکردەوە ،لەم وتارەدا باچەچی پڕوپاگەندەی زۆری بۆ سەعدون هەڵواسی ،لەپاش بلاوبوونەوەی ووتارەکە سەعدون چاوی کەوت بە(حمدی باچەچی) وپێی گووت "باتۆزێك باچەچی چاوەڕی بکات ببینێت وبزانێت کەئایاعبد المحسن سەعدون ناپاك وخائینە" .

عەلی مەحموود شێخ عەلی هەرلەزمانی خۆیەوە دەگێڕێتەوە کەڕۆژێکیان بەڕێکەوت چاوی کەوتووە بە سەعدون لەماڵی مەکی ئۆرفەلی ولەنزیکی دانشتووە ودەربارەی هێرشی ڕاگەیاندن وپڕوپاگەندەکانی ڕۆژنامەکان دەدوا وبەڕوونی پێی گووتم "ئەی عەلی ! عبد المحسن سەعدون نیشتمانپەروەرە ولەنیشتمانیەتی ئێوە کەم ناکاتەوە " دووڕۆژ بەسەر ئەم چاوپێکەوتنەدا تێنەپەڕی ،سەعدون بەڕووداوێکی دڵتەزێن خۆی کووشت .

ئەم تۆمەتانەی کەباسمان کرد ودەدرانە پاڵ سەعدون دڵ ودەروونی زیاتر تێك دەدا وتووشی تووڕەبوون ودەمارگیرییەکی بێوێنەی کرد ،لەڕاستیدا ڕووداوێك هەبوو کەزیاتر کەسانێکی زۆر وەك بیانوویەك بەگژی سەعدون دا بەکاریان دەهێنا کەبووە مایەی لاوازی کەسایەتی سەعدون ،ئەویش ئەوەبوو کەکاتی خۆی لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانی کەئەو کات سەعدون جێگری پارێزگاری بەسرە بوو ،ئەنجوومەنی نوێنەران هانی هەندێك لەکەسایەتیە بەناوبانگەکانی ئەو سەردەمەی دا بۆ زیاتر پشتگیری کردنی دەوڵەتی عوسمانی بۆ ئەم مەبەستەش (عبد الکریم سەعدونی) برای سەعدونی نارد بۆ بەسرە بۆ زیاتر پشتگیری کردنی عوسمانیەکان بەلاّم لەم کاتەدا سەعدون بەپێی چەند سەرچاوەیەك کەهەڵوێستی ناشرینی نواندووە وپشتگیری بەریتانیای کردووە بۆ ڕزگارکردنی عێراق لەژێر دەوڵەتی عوسمانی ،هەموو ئەوانەی کە لە پەرلەمان دا بوون ونەیاری سەعدون بوون ئەم ڕووداوەیان کردبووە کارتێکی فشار بەسەر کارەکان وهەڵوێستی سەعدونەوە وبەخائینیان لەقەڵەم دەدا .

ئەم هەواڵە وچەندین هەواڵی دیکەی دڵنیگەران وناڵەبار دەگەیشتە گوێی سەعدون بەلاّم ئەو هیچی بۆ نەدەمایەوە تەنها حاڵەتی وێرانکاری دەروونی خۆی نەبێت ،سەعدون لەم هەوالانە زۆر پەست بوو وبە ووتەیەکی کاریگەر هەڵوێستی خۆی دەربڕی وگووتی "بۆ کێ ئەم هەوالانە دەگوازنەوە سەعدون خۆکووشتنی پێ باشترە لەبیستنی ووشەی خیانەت لەژێر گوومەتی پەرلەمان دا " ئەم گووتەیەی سەعدون زۆر بەڕاشکاوی ودەنگێکی زولاڵەوە ووترا کەزیاتر تەعبیری لەڕاستگۆی وتوانایی ولیهاتووی گەورەی سەعدونی دەکرد.وباس دەکرێ کەکەسێك پێی باش بووە کەسەعدون خۆی لەناوببات وزۆر بەووریاوە سەردانی ماڵی سەعدونی کردووە وپێی ڕاگەیاندووە گەر ئەو کارە بکات هیچ کات نابێتە مایەی ئابڕۆبردن وسەرشۆڕکردنی بنەماڵەکەیان وئێمەش لەهەمان کاتدا یارمەتی وکۆمەکی ماددی ومەعنەوی کەس وکارەکەی دەکەین .

(عبد العزیز قصاب )لەیاداشتەکانی خۆی دا لەلاپەڕەی ٢٨١باسی دوایەمین چاوپێکەتنی خۆی دەکا لەگەڵ سەعدون دا کە لەڕۆژی ٣١ی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٩ ئەنجامی داوە ،کەسەعدون سەردانی ماڵەکەی کردووە وهەمان ئەو ڕۆژەش بووە کەسەعدون خۆی کووشتووە ،کەدەربارەی ئاهەنگ وبۆنەی کۆتای

هاتنی مۆڵەتی کارکدنی کۆرنوالیس گفتوگۆی دەکرد ،بەلآم سەعدون زۆر بەپەستی وبێزاری ئەوەی ڕاگەیاند کەچیتر من ماندوو بووم لەڕێ کردن وڕۆیشتن بەدوای بەڵێن وپەیمانە بێ سەروەبەرەکانی بەریتانیادا کەهیچ سوودێکی بۆ هیوابوون تێدا نیە ،لەدوایەمین قسەکانی دا بە قەسابی گووت (هەموو ئەو هیوا وئاواتەی کەبەئینگلیز هەمانە خەیاڵیە وناڕاستە وهیچی ناچێتە تەنانەت سێبەری حەقیقەتیشەوە ) .

دواتر سەعدون ماڵی قەسابی جێهێشت وبەچاوێکی پڕ فرمێسکەوە کەلەبێزارییەوە سەرچاوەی گرتبوو ڕووی کردە بارەگای(حیزبی پێشکەوتن ) ودەیوست ماڵئاوایی ئێجگاری بکات لەبرادەرانی ودواتر بۆ ماوەیەکی کەم لەیانەکەی دا دانیشت وپاشان ئەوێی چۆڵ کرد وڕووی کردە ماڵی خۆیان ناندەرەکەی (عائدە) وخێزانەکی ومنداڵەکانی بەناوی (نجلا واسف ) ڕووی کردە خواردنی نانی ئێوارە ولەگەڵ خێزانەکەی کەوتە قسەوە وبەزمانی تورکی پێیگوت "ئەوە چیتە ئەڵێی ناتوانی چایمان بۆ لێبنەیی "خێزانەکەشی لەوەلآمدا گووتی (من ئەمە نزیکەی ١٢ ڕۆژە زۆر بێزارم و وازم لەچێشت کردن هێناوە وحەزیش ناکەم لەبازاڕشت بکڕم ودەمەوێ شت لەماڵ دروست بکەم ببورە گەر شتێك ئامادە نەبێت )

بەپێکەنینەوە سەعدون پێی گوت تۆ بە بیرکردنەوەی من ڕازی نیت !خێزانەکەشی پێی گوت "من چۆن بەبیرکردنەوەی تۆ ڕازی نیم؟ " پاشان سەعدون زۆر بەگرژی ومۆنیەوە هەستا ودواتر چاوی کەوت بەکچەکەی وبەزمانی تورکی پێی گوت (بن چوق سورم )، دواتر سەعدون چووە ژوورێك ودەستی کرد بەنووسینی نامەیەك بۆ کوڕەکەی "عەلی " کەلە بەرمەنگهام دەژیا لەبەریتانیا بەمەبەستی تەواو کردنی خوێندن ،دواتر کەتەواوی کرد بەپەستی وبێزارییەوە چووە قاتی سەرەوە .

پێویستە لێرەدا تۆزێك بەووردییەوە باس لەچۆنێتی چیرۆکی ڕووداوی خۆکوشتنی سەعدون بکەین ،کەلەزمانی خێزانەکەیەوە بەم شێوازە باس لەساتە کۆتاییەکانی ژیانی سەعدون دەکات ودەڵێ ((تەنها ئەوەم بینی کەشێوازێك ڕێی دەکرد ترس ولەرزینی خستە ناخی دڵمەوە وشوێنی کەوتم تاوەکو ژووری نووستن کەبینیم دەمانجەکەی پڕفیشەك کرد ومنیش بەخێرایی چوومە لای وپێم گووت چی دەکەی ؟! وبۆ چ وادەکەی؟ بەلآم ئەو گووتی ((لێم گەڕێ وازم لێبێنە)) منیش پێم گووت ((نابەخوا وازت لێناهێنم ئەگەر هەرکارێك دەکەی ئەوا گەورەم یەکەم جار من بکوژە )) دواتر گووتی وازم لێ نەهێنی ئەتکوژم ،وبەزمانێکی پاڕاو وبەترسەوە پێم گوت ((بمکوژە )) ،ئەوە بوو دەستیم گرت بەلآم نەمتوانی کۆنترۆڵی بکەم وهەوڵیدا قووتاربێت لەدەستم وزیاتر بەرەو دەرگای بەلەکۆنەکە هەنگاوی دەنا کەئەو کات من دەستی چەپیم گرتبوولەو بڕوایەدا بووم کەڕێگای خۆکوشتنیم لێ گرتبوو بەلآم بەداخەوە دەمانجەکە لەگیرفانەکەی ئەو دیوی بوو وبەدەستی گرتبوو ومنیش هۆش وبیرم لای خۆم نەمابوو ولەگەڵ بەدەنگ هاتنی تەقەی فیشەکدا

لەشوێنی خۆم وەستام وئەویش بەسەر پەنجەرەی بەلەکۆنەکەدا کەوت وقاچێکی لەو دیوی پەنجەرەکە وقاچەکەی دیشی لەم دیو وهەرلەوێش دا دڵی لەلێدان کەوت..

ولەگەڵ دروست بوونی ئەم ڕووداوە دڵتەزێنە وبلاوبوونەوەی بەدەوروبەردا ،سەراپایی گەل وخەڵکی سەرشەقام تووشی ڕاچڵەکانێکی کتوپڕبوون ،وبەخێرایی خەڵکێکی زۆر ڕووی کردە ماڵی سەعدون کەلەسەر ڕۆخی کەناری ڕوباری دیجلە بوو ..

(عبد العزیز قەساب) کەوەزیری ناوخۆ بوولەوسەردەمەدا یەکەم کەس بوو ڕووی کردە ماڵەکەی سەعدون وچووە ژووری خۆکووشتنەکەی کەلەنهۆمی سەرەوەبوو ،ولەوێدا لاشەی ساردوسڕو مردووی سەعدونی بینی کەسینگیشی بەفیشەك کونکرابوو ،بەلام کاتێك هاتە خوارەوە بۆ نهۆمی یەکەم وچووە ژووری کتێبخانە ویستی پەیوەندی بکات بەسەرۆکی تەندروستی وپزیشکی و وەزیرەکانەوە لەڕێگەی تەلیفۆنەوە لەوکاتەدا چاوی کەوتە سەر نامەیەك وچەند کاغەزێك کەلەسەر مێزێك کەوتبوون ،بینی کەوەسیەتی سەعدونە ویەکسەر خستیە گیرفانەوە ،بۆیە لەگەڵ هاتنی وەزیر وپیاوانی حکومەت دا بۆ ماڵی سەعدون وچاوکەوتنیان بەو ڕووداوە ترازیدیایە ئەمانیش بەهەمان شێوە چاویان کەوت بەکاغەزێك کەلەسەر زەوییەکە فڕێدرابوو ،تەماشاییان کرد کەوەسیەتی سەعدونە وبەزمانی عەرەبی نووسراوە وتەواونەکراوە ولێرەوە گەیشتنە ئەو باوەڕەی کەپێدەچێت سەعدون لەشوێنی تر نامەی نووسیبێت ،کاتێك دەربارەی ئەم بیرکردنەوە پرسیارییان لەقەساب کرد ،قەسابیش وەسیەتەکەی کەلەلای بوو خستە بەردەستیان کەوەسیەتێك بوو بۆ کوڕەکەی (عەلی ) .

لەڕاستیدا سەعدون یەکەم جار هەوڵی داوە کەبەزمانی عەرەبی وەسیەت وڕاسپاردەکانی بنووسێت بەلام لەبەرئەوەی کەبەقسەی خۆی عەرەب وسیاسەتوانەکانی عەرەب خیانەتیان لێکردئەویش ئەو وەسیەتی کەبەعەرەبی نووسیبووی بەتەواونەکراوی فڕێدابوو ،دواتر بەزمانی تورکی وەسیەتێکی پڕاوپڕی لەسەر دەربارەی کوڕەکەی ودواڕۆژی میللەتەکەی نووسیوە کەدواتر ناوەڕۆکی ڕوون دەکەینەوە، ئەمەش جگە لەوە کەسەعدون لەڕووی چۆنێتی دەرخستنی ووشە ودەربڕین ولێکدانەوە زیاتر لەزمانی تورکیدا شارەزاتر ولێهاتوو تربووە .

پاشان قەساب داوای لەهەموو ئامادەبووان کرد کەئیمزا لەسەرئەوە وەسیەتە بکەن ،بۆیە (تۆفیق سویدی ) پێنووسەکەی گرت بەدەستەوە ولەسەر ئەم وەسیەتە نووسی ((ئەم نووسینە بابەتێکی وای تێزییەوە کەلەسەرووی هەموو کاغەزەکانی تایبەتەوەیە ))دواتر ئەم نووسینە لەلایەن پۆلیسەوە وێنەیەکی گیرا وبەکۆپی کردن لەگەڵ خۆیان دا بردیان کەلەشەوی ١٣/١٤ی تەشرینی دووەم ساڵی ١٩٢٩نووسراوەتەوە.

هەریەك لەوەزیرانی حكومەت (ناجی سویدی ویاسین هاشمی وعبد والعزیز قەساب وخالد سلێمان وجەمیل مد فعی _فەرمانداری بەغدا ،حاج سەلیم _بەڕێوبەری گشتی پۆلیسی ،ئەحمەد ڕاوی _بەڕێوبەری گشتی پۆلیسی بەغدا ) ئیمزاییان لەسەر ئەم دەستنووسەی ناوبراو كرد ..

ئەحمەد راوی ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە كەیاسین هاشمی نەیتوانیوە بەسەر هەستی تووڕەبوونی خۆیدا زاڵ بێت لەبەرامبەر لاشەی مردوی سەعدون دا ،بۆیە بەتووڕەیی وبەگیانێكی بەرپەرچدانەوە كاتێك چاوی دەكەوێت بەنوری سەعید پێی دەڵێ (ئێوە ئەمەتان دەوێ ئەی پادشا) ودواتر دەستی گرت بەپێنووسەكەیەوە ولەسەر وەسیەتەكەی سەعدون ئەم وەسیەتەی نووسی كەدەڵێ ((ئەمە گەورەترین سەلماندنە بۆكەسێك كەڕوحی كردبێتە قوربانی دەوڵەتەكەی ،سەربازێكی وونی عێراقە )).

لەڕۆژی دووەمی خۆكوشتن دا ڕۆژنامەی (عالم عربی) لەبەرەبەیانی ئەو ڕۆژەدا وەسیەتەكەی وەرگێڕایە سەرزمانی عەرەبی وبەوەرگێڕای بڵاوی كردەوە كەئەمەش دەقی نامەكەیەتی :_

كوڕەكەم ..چاوەكەوم ..ڕاگیركەرم ((عەلی))

لێم ببورە لەبەرامبەر ئەو تاوانەی كەئەنجامعدا ،لەبەرئەوەی وەڕس بووم لەم ژیانە وهیچ خۆش وچێژ وشكۆیی ومەزنیەكم تێدا نەبینی ،میللەت چاوەڕێی خزمەت دەكەن ،ئینگلیزیش پەسەندی ناكەن،پشتگیریكەر ویارمەتیدەرم نیە ،عێراقیەكان داوای سەربەخۆی دەكەن ،بەڵام لاواز وبێ هەڵوێستن ودوورن لەسەربەخۆییەوە ،ئەوان دەستەوەستان ولاوازن لەئاست ئامانج ومەبەستە نهێنیەكانی مندا ،لەوبڕوایەدان كەمن مرۆڤێكی ناپاك وخائینم وپیاوی بەكرێ گیراوی ئینگلیزم ،ئەم بەڵایە چەند گەورەیە ،من خۆبەخش وجگەر سۆزترین كەسی نیشتمانەكی خۆمم ،بۆیە گیرۆدە بووم بەدەست هەموو ئەوانەی كەبەسووك تەماشاییان كردوم ،ئازاری زۆرم چێشت وخۆڕاگریم زۆر نواند لەبەرامبەر ئەم پارچە پیرۆزەی باوباپیرانم بەڵام ....!

دوائامۆژگاریم بۆ تۆ ئەمەیە :_

١/بەبەزەی بیت بەرامبەر برا وخوشكە بچوكەكانت كەبێ باوك دەمێننەوە وڕێز لەدایكت بگرە وبەوەفابە بۆ نیشتمانەكەت..

٢/هەوڵی تەواو بخەگەڕ بۆ كۆتایی هاتنی دەسەڵاتی بەریتانی لەعێراق ونەمانی پاشكۆ وئەوانەی پشتگیری دەكەن .

ئەم وەسیەتە كاریگەری نێگەتیفی وپۆزەتیفی هەبوو بۆ سەر دەورووبەر وكاردانەوەی زۆری دروست كرد ،لەوانە خانەی متمانەی بەریتانی گیانێكی تووڕەیی نواند وسكاڵای ناڕەزایی بەرزكردەوە لەبەرامبەر ئەم

نووسینە چونکە هەست و ووڕەیەکی خراپی دژی بەریتانیا دروست کرد ،دەستی کرد بەسزادانی ئەو کەسانەی کە وەسیەتەکەیان بڵاوکردبووەتەوە ،ڕۆژنامەی عێراق سەرنجێکی کورتی دەربارەی ئەم ڕووداوە بڵاوکردەوە وئاماژەی بەوەدا بوو کەبەکرێ گیراوێکی بەریتانی لەشەوی خۆکوشتنی سەعدون دا ڕووی کردبووە خانەی متمانەی بەریتانی وپێیانی ڕاگەیاند بوو کەیەکی لەوەزیرەکانی وەسیەتەکەی نووسیوە ،وە(یاسین هاشمی ) بەم بۆنەیەوە تۆمەتبارکرا بەڵام لەڕاستیدا ئەمە ساختەکارییی بوو و هاشمی ئەم وەسیەتەی نەنووسیبوو بەڵکو تەنها چەند ووشەیەکی وەك دەستەواژەیەکی کەسێتیانە نووسیبوو کەلەپێشدا باسمان کرد ...

ڕۆژنامەی (تایمس ) لەندەنی هەوڵی شیوڵندنی هۆکار وپاڵپێوەرەکانی خۆکوشتنەکەی سەعدونی دا ،ویستی لەهۆکار نەتەوەیی ونیشتمانیە دلیمالێ ،یاخود تەنها لەبیری بباتەوە ولەسەر شانی قورسی خۆی لایببات ،لایەن وگرپە پەرگیرەکانی نێو خۆی عێراق دەیانویست سوود لەڕووداوەکەی کوشتنی سەعدون وەربگرن بۆ بەرژەوەندی سیاسی خۆیان بەڵام چەند هۆکارێك ئەوە دەخەنەڕوو کەشپرزەیی وپەشێوی سەعدون لەدوا ڕۆژەکانیدا تەنها لەبواری سیاسی دا نەبوو !!..

(مەلیك فەیسەل ) یش هەرچەندە خەم وپەژارە ڕووی داپۆشیبوو ،بەڵام نارازیبوو لەبڵاوکردنەوەی ئەو وەسیەتنامە ،هەربۆ ئەمەش (عبد العزیز قەساب) دەڵێ نۆو ڕۆژ دوای ڕووداوەکە پاشا فەیسەڵ بانگهێشتی کردوم وداوای دەرخستنی کۆمەڵێك بەڵگەی نووسین لەخانی باوەڕی بەریتانی ئەوەی پێ ڕاگەیاندم کەگەر لەسەرخۆ وخۆڕاگربوایە لەبڵاوکردنەوەی ئەوا لەبەرژەوەندیماندا بوو و ئەمن و ئارامی ناوخۆشی دەپاراست ...

(مەلیك فەیسەڵ ) لەشەوی خۆکوشتنی سەعدون دا بەخێرایی ڕووی کردە ئەوێی ولەسەر لاشەکەی وەستا وگەوتی (هەم خۆت وخەم ووڵاتەکەت دۆڕاند ) ،خەڵکی عێراق باوەڕیان بەم دیمەن وهەڵوێستەی فەیسەل نەدەکرد ولەناوخۆیاندا ئەو پرسیارەیان دەکرد ئایا ڕاستە کەفەیسەڵ گۆڕاوە یاخود ئەم هەڵوێستێکی شانۆگەرییانەیە ودەیەوێت ئەو ڕووداوانەی کەبەسەری داهاتووە پەردەپۆش بکات ،ئەم هەست وسۆزەی فەیسەل لەبەرامبەر لاشە مردووەکەی سەعدون دا لەهەست وسۆزی کەسێك دەچێ کەلەناو مێردزمەیەکی گەورە دا خۆی مەڵاس دابێت ..

هەڵوێستی بەریتانیا ومەلیك فەیسەل لەئاست *خۆکوشتنەکەی* سەعدون دا:_

یەکەم :ئەم خۆکوشتنەی مەودایەکی گەورەی لەبەردەم فەیسەڵ دا فراوان کرد بۆزیاتر خستنە گەڕی ئازادی لەکارەکانی دا وهەڵبژاردنی سەرۆك وەزیران دا ،چونکە خاوەن پلەو پایە ومەرکەزییەتێکی گەورە لەنێو خانەی متمانەی بەریتانی ،بەحوکمی ئەوەی زۆربەی ئەندامانی پەرلەمانی لەپشتەوەبوون وخاوەن حیزبێکی باڵا دەست بوون لەنێو پەرلەمان دا ،ئەمەش یارمەتیدەرێکی سەرەکی بوو بۆیان تاوەکو دەسەڵاتی

فەیسەلٚ سنووردار بکەن ،بەلآم بەداخەوە پاش نەمانی سەعدون گۆڕەپانی سیاسی بۆ فەیسەل چۆلٚ وبێ ترس بێ ململانێ مایەوە، یاخود دەتوانین بلێین ئەو ناکۆکیە سیاسیە ئەما کەلەنێوان سەعدون وفەیسەل دا هەبوو کەجارێك بەنهێنی وجارێکیش بەئاشکرا پێی هەلدەستان، فەیسەلٚ دەیویست پەیوەندییەکانی لەگەلٚ دەوروبەردا بگۆڕێت ولەسەر بنەماییەکی جیاوازتر مامەلە بکات ، بەهەمان شێوەی مامەلەی سەرکردە لەگەلٚ سەرباز وپۆلیس دا،هەرچی شتێك کەلەلایەن سەرکردەوە بگوترێ دەکرێ جێبەجێ بکرێ ،وکام کاریش کەسەرکردە مەیلی لێبێت دەبێت ئەنجام بدرێ ،بەلآم وەزیرەکان ئەم بیرۆکەیەی فەیسەلیان ڕەت کردەوە وپێی یان باش بوو کەپەیوەندی سەرۆك لەگەلیاندا لەسەر بنەمای ئەفسەر وپادشابێت بەتایبەتی ناجی سویدی کە زۆر جەختی لەسەر ئەم بیرۆکەیە دەکردەوە ودەیگووت ئێمە سەربازنین تاوەکو بەوشێوەیە مامەلەمان لەگەلدا بکرێت ،لەڕاستیدا بیرۆکەی تەماشاکردنی مەلیك بۆ وەزیرانی وەك ئەفسەر یەکەم جار لەلایەن (سعدون ) وە خراوە ڕوو ،باشترین نمونە بۆ ئەوەی کەسەعدون ڕۆلی کاریگەری وبەرچاوی بینی لەپێکهاتنی وەزارەت دا ئەوماوەیە بوو کەوەزارەتی (توفیق سویدی ) پێك هێنا لەسالی ١٩٢٨کەلەوکاتەدا قەیرانی وەزارەت لەلوتکەدا بوو ،ئەم وەزارەتەی سویدی نزیکەی ٩٠ڕۆژی خایاند .

پاشان فەیسەلٚ هەولی دا کەنوری سەعید بۆ وەزارەت بپالێوێ ،بەلآم سەعدون دەیویست سویدی بپالێوی وپشتگیری ئەوی کرد ،دوای چەند گفتۆگۆیەکی بی ئەنجام فەیسەلٚ لەگەل سەعدون هیچی بۆ نەمایەوە وهەموو هەولەکانی بۆ گەڕانەوەی سەعدون هەرەسی هێنا .

توفیق سویدی لەیادداشتەکانیدا بەڕاشکاوی باس لەم ناکۆکیە وکێشەی نێوان سەعدون ومەلیك دەکا کەپێی وایە فەیسەل لەحالەتێکی زۆر پەشێودا بوو چونکە بەلێنی بەنوری سەعید دابوو کەوەزارەت پێك بهێنێ بەلآم سەعدون پەیمانی پێدا کەکاری وانەکات ،لەمەشدا دەردەکەوێ کەسەعدون ونوری سەعید کلیلی کردنەوەی ئەم کێشەیە بوون .

توفیق سویدی بەڕوونی باسی پەیوەندی نێوان خۆی ونوری سەعید دەکات لەیادداشتەکانی دا کەدەلی ((چووینە ژوورەوە بۆ لای خاوەن شکۆ کەنوری سەعید لەگەلی دانشتبوو وهەموومان لەپۆلێك دا کۆبیینەوە وبۆ هەموومان چەند ووتەیەکی درکاند وپێی گووتین کەبایەخمان پێ دەدا ورێز لەبەهاکانمان دەگرێ وهەموومان دەکرێ بەدەست کراوی لەگەلٚ یەکدا کاربکەین بۆ پێك هێنانی وەزارەتێکی نوێ ،وداوای لەهەردووکمان کرد کەوەزارەتێك پێك بهێنین ،بۆیە ئێمەش لەلای خۆمانەوە ئەوەمان درکاند کەهەولی دامەزراندنی وەزارەت دەدەین .

دکرن ڤان هزران و وەرارا وان ب رێکا رێبازەك رامیاری و رەوشەنبیری یا بەرچاڤ بلند بکەت. دیاربوونا تەڤگەرا ئیخوان موسلمین (تایێ ئیخوانا ئیراقێ) ل داوییا سالێن چلان بوو. سەرۆکاتیا شێخ ئەمجەد زەهاوی کارتێکرنەك خورت د تەڤلیبوونا گەلەك ژ شاگردێن زانکۆ، فەرمانبەر و پشکێن دی ژ ملەتێ ئیراقێ هەبوو، هەتا بوویە بەرەیەك ب هێز و هەڤرکیا بەرەیێ کۆمۆنیستی ل وی سەردەمی کری. بازێرێ کوردان هەلەبجە، ئەوێ ل باشوورێ رۆژهەلاتێ سلێمانی یێ و ل سەر سنۆرێ ئیرانێ دەستپێشخەربوو د وەرگرتنا ڤێ هزرێ و ڤێ رێبازێ دا، ل دەستپێکا سالێن پێنجیان گەلەك شانێن ئیخوانان دناڤ دا خویابوون.

سەبارەت هزرا نەتەوی یا کوردان، ل وی چاخی پارتا هیوا و شۆرەش رۆلەکێ مەزن د پەیرەوکرنا ڤێ رێبازێ دا هەبوو، ب رێکا پشتبەستنێ ل سەر تیۆرییا مارکسیسزمێ هەولدان گەنجێن کوردان ب خوەڤە گرێدەن. بەلێ رێکخستنا پارتا کۆمۆنیستا ئیراقێ و توندییا وان وەکر، کو گەلەك ژ رەوشەنبیرێن کوردێن مارکسی، یێن چووینە دناڤ رێزێن هەردوو پارتێن پێشتر ناڤهاتی دا، دەست ژ پارتێن خوە بەردەن. ب بەهانەیا کومونیستان ژوان را، کو ئەو ژێلی پەرکەندێن برجوازییا بچووك پێڤە تشتەك نینن. هن ژوان چوونە دناڤ رێزێن پارتا کۆمۆنیست ب خوەدا. ئەڤێ دەلیڤە ژ هزرمەندێن کوردان را ڤەکر، کو پارتا دیمۆکراسا کوردستانێ ل ١٦ تەباخا ١٩٤٦ دامەزرینن. ئەمازە، کو بیرهاتنا شۆرەشا بارزانی یا داوی یێ و گوهارتنێن پۆزەتیڤێن د قادا کوردان و ئیرانێ دا پەیدابووین. ژدایکبوونا کۆمارا دیمۆکراسییا کوردستانێ ١٩٤٦ ل مەهابادێ هێشتا دبیردانکێ دا مایە.

ب ڤی رەنگی، قادا کوردان بوو شانوویا ململانا سێ هێزێن سەرەکی، مینا کۆمۆنیست و نەتەوەییا کوردان و ئیسلامی (ئەوێن دناڤ ئیخوانێ دا)، بەلێ ژبەر هەبوونا رەنگە نێزیکبوونا هزری و هەڤپەیمانی یێ ل ناڤبەرا هەردوو ئاراستێن بەراهیکێ و هەروەسا هەبوونا کەلتۆرەك دیرۆکی یێ گرێدای شۆرەشا شێخ مەحمودێ حەفید و شۆرەشێن ل پەی ئێکێن بارزان ب سەرۆکاتیا شێخ ئەحمەدێ بارزانی و مەلا مستەفایێ بارزانی پیرۆزیەك مشە و بەرفرەه ب بەلاڤبوونا رەهەندێ نەتەوی و پرۆپاگەندا وێ ئاراستێ بەخشی، چونکو ب بۆچوونا جەماوەرێ کوردان، ئەو گەلەك ژ ئاراستا ئیسلامی گونجای تر بوو. ژبۆ بدەستڤەئینانا داخوازێن وان، ئیسلامی ل وی چاخی هند بەرەڤ بدەستڤەئینانا داخوازێن ملەتێ کوردڤە، نە دچوون هندی کو بزاڤ دکرن بەهایێن ئۆلی و رەوشتێن پاك و راکرنا ستەمکارییا ل سەر چینا ب جە بینن. دخواستن شریعەتێ ئیسلامێ بهێتە چەسپاندن، ئانکو، بگۆتنەکا دی، داخوازێن ئیسلامیان دگشتی بوون، و بۆ تەڤاییا ملەتێ ئیراقێ بوون، ل سەر وی بنیاتی، کو ئیسلام جوداهی یێ ل ناڤبەرا عەرەب و کورد و تورکمانان ناکەت. ئیسلامی یان راستترە بێژین (ئیخوان) ئەوێن کو ل وی چاخی سەروەرێن قادێ بوون ب تیۆریکرنێن رامیاری سەبارەت گەلێ

کورد رانەبوون، مینا کۆمۆنیستان کری، چاخێ دکۆنگرە و کونفرانسێن خوەدا داخوازکرین دڤێت مافێن مللەتێ کورد بێن نەتەوی پێ بهێنە دان و دقۆناغێن داهاتی دا مافێ چارەنڤیسی ب وان بدەن. ئەڤە بوو ئەگەرا رەنگەک نێزیکبوونێ دگەل رەوشەنبیرێن کورد. ئەوان ددیت پارتا کۆمۆنیست پشتەڤانا مافێن وانە، ئەو مافێن رژێما شاهانە ژناڤبرین. بەلێ ئیسلامی ژ ئەڤان بۆچوونان ددوور بوون، چونکو بۆچوونێن وان بۆ هەموو موسلمانان دگشتی بوون، ژبەرکو ئەو ئیسلامی بوون، دا ب هشکباوەری و رەگەز پەرستی بێ نەهێنە گونەهبارکرن، هەر چەندە گەلەک ژ سەرکێشێن هزرا ئیسلامی ژ عەرەبێن ئیراقێ دناڤ پێڤاژۆیا رویدانێن دەڤەرا کوردان دا نەژیا بوون، پێزانینێن پێدڤی ل سەر راستیا سەروبەرێ جڤاکی و رامیاری و رەوشەنبیری یێ دەڤەرا کوردان نەبوون، نەدزانین ئارێشە وتا کریارێن ستەمکاری یێ ل سەردەما شاهانییێ (الملکی) چ بوون. بەلێ ئەڤە تەڤا سەرەدانێن سەردارێن ئیخوانێ ژ بۆ دەڤەرا کوردان و کارێ وان ل سەر چێکرنا تۆرەک رێکخستنان دناڤ کوردان دا هندا ناکەت. دەستپێکرن ژ بازێرێ هەلەبچێ ل سەر سنورێ ئیرانێ و تا ل زاخۆ ل سەر سنۆرێ تورکیا ب دوماهیک دهات. پێزانین و نێرینێن جودا جودا ل دوور چەوانیا برێڤەچوونا کارێ ئیسلامی ب سەردارێن خوە بێن ل بەغدا ددان وپاشەرۆژا چاڤەرێکری دیاردکرن. پێرا ژی ئیخوانان چادرگەهـ ل هندەک دەڤەرێن کوردان ددانان، ژبۆ بهێزکرنا پەیوەندییێن ل ناڤبەرا هەردوو مللەتێن مۆسلمانێن برا بهێز بکەن. داکو ژ نێزیکڤە کاودان و ئارێشە و گرفتارییێن کوردان بناسن. وەک نموونە چادرگەها بامەرنێ ل باکوورێ دهۆکێ، ل هاڤینا ١٩٥٥ و ١٩٥٦، هەکۆ ب دەهان ژ گەنجێن عەرەب ژ موسل و بەغدا و رمادی و بەسرا و پارێزگەهێن دی هاتبوون، دا دگەل برایێن خوە گەنجێن کوردان ل هەڤ ب جڤن. ئەڤە بوو ئەگەرا تێکهەلکرنا هزران و ژ نێزیک هایداربوونا ئەوا دسەرێ گەنجێ کورد دا هەیە و زانینا ئومێدێن وانێن پاشەرۆژی و هەڤرکی بێن وان دگەل هەڤبەرێن وان ژ نەتەوەخوازو کۆمۆنیستان.

هەرچەوابیت، گەلەک ژ رەوشەنبیرێن کوردان، مامۆستا و فەرمانبەر و شاگردێن زانکۆ و ئامادەییان هزرا کارێ رێکخستنی یێ ئیسلامی وەرگرتن و ب مەرەما ڤەژاندنا رێنماییێن ئیسلاما سیاسی، ئەوێن گەلەکان های ژێ نەبوون بزاڤێن رژد دکرن. ب رەنگەکێ بەرچاڤ ژ بۆ ئێکەمین جار گەنج د مزگەفتان ڤە ل کێلەکا مەزنان هاتنە دیتن. ئەڤ رێڤشتێ هەنێ، ل دلوییا هەشتێیان و نۆتان ژ چەرخێ بیستێ ئەڤ هزرە پەسندکرن، ئەوێن ل کوردستانێ ب ئێککرتۆی ئیسلامی کوردستان و بزاڤا ئیسلامی یا ئیراقی و کۆمەلا ئیسلامی ل کوردستانا ئیراقێ دهێنە ناسکرن. لێ کاودانێن چەتنێن پشتی شۆرەشا ١٤ تەموزا ١٩٥٨ ئیراق دناڤ را دەرباز دبوو، هەولا کومۆنیستان ژبۆ وەرگرتنا دەستهەلاتێ ل سەردەمێ سەردار عەبدولکەریم قاسمی و رلوەستیانا هێزێن ئیسلامی و نەتەوی ل بەرامبەری بەربەلاڤبوونا وان یا خورت و ب پالپشتیا سازییێن دەولەتێ و ئاسایشێ و

لەشکەری، بوو ئەگەرا گرفت و شکەستنێن هەتا نها ژی گەلێن ئیراقێ ژبەر دنالن. ژبۆ نموونە بزاڤا شەوافی ل ئادارا ١٩٥٩ ل باژێرێ موسل و رابوونا کومۆنیستان ب پالپشتیا رژێما عەبدولکەریم قاسمی، ژبۆ ڤەمراندنا بزاڤا شەوافی ل دویف گۆتنا وان و چوونا چەکدارێن کورد دناڤ بازێرێ موسلێ دا و ب سەردا زالبوونا وان ژبۆ ئێکەمین جار د دیرۆکێ دا، بوو ئەگەرا تێکچوونا پەیوەندیێن عەرەب و کوردان.

ئەڤێ کارتێکرنا خوە ل سەر رویدانێن پشتی هینگێ کر، ئەمازە پشتی کوردان ل ١١ ئەیلولا ١٩٦١ شۆرەشا خوە یا نەتەوی ل دژی رژێما عەبدولکەریم قاسمی راگەهاندی، پشتی کو پەیوەندی دگەل وی و دگەل کومۆنیستان ل سالێن شێستان و هەفتێیان دناڤبەرا هەردوو ئالیان دا بەرەڤ ژ هەڤ دابرینێ ڤەچوون. هەر چەندە هەوێن لەشکەرێ ئیراقێ د سەردەما دەستهەلاتا بەعس یا ئێکێ ١٩٦٣ و یا دوویێ ل ١٩٦٨ێ، ل سەر کوردان گەلەك یا دژوار بوو. هەکو ل سالا ١٩٦٣ێ رژێما بەعس یا ئیکێ، ب گونەهکاریێن کومکوژیان ل شەڤا ١٠/٩ خەزیرانا ١٩٦٣ ل دژی خەلکێ بازێرێ سلێمانی پێ رابووی، کو سەردار (عمید) سەدیق مستەفا بەرپرسێ (لیوا) هێزا بیستێ ب گرتنا پێنج هزار کەسان ژ خەلکێ سلێمانی پێ رابووی و هەشتێ و شەش کەس ژ وان د چالەکێ دا بن ئاخکرن، ئەو سەروبەرێ گەلەك ژ بازێرێن کوردستانێ بوو.

بەلێ کومکوژیا دوویێ، ئەوا رژێما بەعسیان ل سالا ١٩٦٩ ل گوندێ دهکان، سەر ب قەزا شێخان ل پارێزگەها موسل پێ رابووی. هەکو کەرتێن (فرقا) تیپا چوارێ یا پیادە ب سەرکێشی یا (العمید الرکن، عبدالجبار الاسدی) ب هەڤکاری دگەل نۆکەرێن کورد (جاشان) ب هێرشەکێ ل سەر دەڤەرا شەمکان رابووی، ژ ئەجامێ توپبارانکرنێ ب فرۆکێن جەنگێ و رەنگێن دی ژ توپبارانکرنێن تانك و تۆپان، خەلکێ گوندێ دهکان ژ ترسا توپبارانێ و دەستدرێژیێن سەرباز و جاشێن کورد بەرەڤ شکەفتەکا نێزیك گوندی رەڤین. بەلێ ئەوا د هزرا کەسێ دا نەبوو رویدا. هەکو لەشکەری و چەتان دەرێ شکەفتێ ل ئەوان پەریشانێن خەلکێ گوندی ژ پیر و ژن و زارۆکان گرتی و ئاگر ددەرێ شکەفتێ دا هەلکری و هەموو تێڤە خەندقین. د هەمان سالێ دا لەشکەرێ ئیراقێ ب سەرکێشی یا ئەفسەر، پاشی عقید (عەبدولکەریم جحێشی) کومکوژیەکا دی ددەرحەقێ فەلەهێن کوردێن گوندێ (صوریا) ل باشوورێ زاخۆ، ل دەشتا دوبانێ ئەنجام دا، کورتیا رویدانێ: ئەو سریا جحێشی سەرداریا وێ دکر، ل راستی مینەکا پێشمەرگەهی هاتن، کو د رێکا لەشکەری دا ڤەدابوون، د وێ پەقینێ دا هندەك ژ سەربازان بریندار بوون. وی ژی هەموو خەلکێ گوندێ نێزیك جهێ مینێ و دگەل قەشەیێ گوندی جڤاندن، هژمارا وان ژ هەفتێ کەسان پتر بوون. ژ ژن و زارۆك و گەنج و پیران بوون، جحێشی فەرمان ب سەربازێن خوە دا، ئەو هەمی گولەبارانکرن و پێکڤە کوشتن، کومکوژیەکا وەسا ژبیر ناچیت.

د سەر ڤان کومکوژی و هنگامێن رژێما بەعس ب سەرێ کوردان ئینایین، سەرۆکاتیا کوردان ب سەرداریيا ئەمر مەلا مستەفایێ بارزانی دگەل حوکمەتا ئیراقی یا وی سەردەمی ب پەیمانا ١١ ئادارا ١٩٧٠ گەهشتن و ب ئومێدا چاکیا ئەڤێ پەیمانێ ب هەموو خەلکێ ئیراقێ بگەهیت. د سەر گەلەک سەرپێچیان و دەستدرێژیێن ب پلانا بەعسیان را، سەرداریێ کوردان مەلا مستەفا بارزانی دڤیا ل سەر پێڤاژویا ئاشتی و ڤیانێ بەردەوام بیت، هەر چەندە سەردارێن کورد یێن لەشکەری و سڤیل گڤاشتن دکرن ئەڤێ پەیمانێ تێک بدەن یان هەر چ نەبیت د سەر را دەرباز بن، لێ ئەو هەتا داویێ ل سەر ئاشتی یێ بەردەوام بوو، ئانکو هەتا ئادارا ١٩٧٤، ب وێ ئومێدێ، کو حکوومەتا ئیراقێ ئەرکێن خوە، ئەوێن بەری هینگێ سەبارەت (مافێ ئۆتۆنۆمی ل کوردستانێ) ل سەر مۆر کر بوو، ب ئەنجام بگەهینیت، ژ وان ئارامکرنا سەروبەری و کریارا (سەرژمێرییا ئاکنجیان) ژبۆ چەسپاندنا مافێ کوردان ل کەرکوک و خانەقین و مەندەلی و شنگال و دەڤەرێن دی یێن عەرەبکری. ئەگەر ل وی چاخی حوکمەتا ئیراقی نیڤەک ژ وان ئەرکان ئەنجام دابان. ئەوا چێبووی چێنە دبوو، دا نها ئیراق مشتی پێشڤەچوون و بەختەوەری بیت و پەیوەندیێن ل سەر بنیاتێ رێزگرتنا بەرامبەر دا دناڤ هەموو نەتەوێن ئیراقی دا هەبیت، نوکە دا ئیراق ل رێزا دەولەتێن پێشکەفتی بیت، هنگامێن ئەنفال و هەلەبچە و بن ئاخکرنا ب ساخی یا هزاران کوردێن بێگونەه ل بەرییێن باشوورێ ئیراقێ نە دهاتەکرن. کا چەوا هەوار و بانگینێن وان ژ دەستێ ستەمکاریێ ب ئەسمانان دگەهشتن. لەوا ئەڤە ب سەرێ ئیراقێ هات.

ژبەر بن ئاخکرنا سەدان ئەساریان" ئەوێن باوەری ب خودایێ ب تنێ و تەنها هەبوون، ب دەستێن شاهێ یەمەنی (ژو نواس الحمیری)، خودایێ مەزن ئایەت د قورئانێ دا ئینا خوارێ و هەتا رۆژا رابوونێ دمینیت. ئەرێ، ئەگەر قورئان سەبارەت نێزیکی دوو سەد هزار کوردێن ب ساخی بن ئاخکرین، د وان چالێن ژ وان را ل ئەردی هاتینە کۆلان، دناڤ تارییا چال و شەڤا رەش دا و ل ڤێ بەرییا بەردریای. ب دەستێن رەشەکێن بەعسیان و سازیێن وان یێن کوشتن و قرکرنێ ژ (ئەمن و ئستخبارات و مخابرات) ێن وان، ئەوێن خودای هەموو رامانێن دلوڤانی و دلپێڤەمانێ و مرۆڤاتیێ ژ دلێ وان دەرکرین، ب ئاخڤیت، دێ چ بێژیت؟

هەکو، دەلیڤا تولهەلدان و تولڤەکرنێ ل پشتی سەرهلدانا مەزنا ئادارێ ژ کوردان راڤەبووی، بەرسڤا وان ئەو بوو. پتر ژ سەد هزار لەشکەرێ ئیراقی پشتی دیلکرنێ ئازادکرن و خوارن و ڤەخوارن ب وان بەخشین. هەر چەندە ئەو بخوە ژ هەر کەسەکێ دی پتر د پێدڤی بوون، چونکو ئەو سەروبەرێ مللەتێ کورد تێرا دەرباز دبوو، گەلەک یێ بەرتەنگ بوو. تنێ تولڤەکرن ژ وان بکوژان کرن ئەوێن کێم جاران دیرۆک کارێن وەکی یێن وان ڤەدگێریت، کو ئەوان د ئافراندنا ئاوایێن ئیشکەنجە و ستەم و رەنگێن کوشتنێ دا ژ هۆلاکۆی، تەیمورێ لەنگ

و هێتلەری دەربازکرنە، د سەر وێ را کریارێن وانێن هۆڤانە، تاقیکرنێن ل تاقیگەهێن بایۆلۆژی و کێمیایی ل سەر گەنجێن کوردان دکرن.

ئەوێن بۆری هەست و ئەستێن کوردان هاڤێتینە ددوانیەکا دژوار دا، خەم و ژان ل وان جڤاندنە، برایێن وانێن ئۆل و کیش (مەزهەب) و دیرۆکا هەڤپشك ئەڤێ ب سەرێ وان دئینن. ئەڤا، کۆ چ دژمنێن مرۆڤاتیێ ب سەرێ مرۆڤان نەئینای.

ژبەر کو گەلەك (عەرەب) وەسا ل کوردان دنێرن، هەر وەکی نوکەرێن ئەمریکا و ئیسرائیلن، چونکە ئەو ب کەتنا دکتاتور سەدامی شاد و بەختەوەر بووینە، ئەڤە وەك رێکخوەشکرنەك ژبۆ کوشتنا وان دبینە و گەلەك فەتوایێن کافرکرنێ ل دژی وان دەرکەتن. بەلێ ئەوان دویڤەلانکێن ستەمکاران ژبیرا خوە برنە. کو باپیرێ کوردان سەلاحەدینێ ئەیوبی مزگەفتا پیرۆز (بیت المقدس) ژ خاچپەرستان پاکژ کر بوو.

ئەرێ، خودێ نەکت، ئەگەر ئەڤا رەشەکێن سەدامی ب سەرێ کوردان ئینای، کوردان ب سەرێ عەرەبان ئینابا، ما ئەڤرۆ عەرەبان دنیا خراب نەدکر و ئاڤا نەدکر. بەلێ ئەو- کورد- ب درێژیا دیرۆکێ ملەتەکێ ستەملێکرینە.

ئەز (هەموو) عەرەبان ب کوشتنا کوردان گونەهبار ناکەم، ئەڤە نە ژ رەنگێ وانە، چونکە ئەو هەلگرێن نامەیا بەراهیکێ یا ئیسلامینە و ئەو بەلاڤکەرێن دلوڤانی و باوەرداریینە دناڤ جیهانێ دا. لێ ئەز ژ رەفتارا هندەك ژ ئەوێن ل سەر ئیسلامێ دهێنە هژمارتن سەرسوٚرمان دمینم، ئەوێن رژێمێن شۆڤەنستێن نەژادپەرستێن عەرەبی و بەعسیێن عەلمانی و نەژادپەرست گەلەك چام و هنگام ب سەرێ وان ئیناین و ئەو ڤەبژاندینە وەلاتێن جیهانێ، هێشتا ئەو کوردان ب گەلەك رەنگێن گونەهکاریان گونەهبار دکەن، داکو ئەوان نۆکەر و ستەمکار دناڤ جیهانا ئیسلامی و ملەتێن موسلمان دا بدەنە دیارکرن. ل بەرامبەری وێ ژی ستەمکار و دکتاتۆر سەدامێ کوژەك بێگونەه دەرکەڤیت: ئەو جهەکی دناڤ موجاهدێن ئیسلامێ دا وەك خالدێ کورێ وەلیدی و سەلاحەدینێ ئەیوبی و موحەمەدێ فاتح و عومەرێ موختار دا بگریت.

دا پەیوەندیێن عەرەب و کوردان مینا بەرێ ڤەگەرینن- ب تنێ ئەڤرۆ ژ پارتێن نەتەوە پارێزێن عەرەب و عەلمانی دهێتە خواستن، کو لێبۆرینێ ژ کوردان بخوازن، ل سەر ئەوان هنگام و کارەساتێن بدەستێن دڕندەیێن ل سەر عەرەبان دهێنە هژمارتن هاتینەکرن و ب سەرێ کوردان هاتین ب گونەه ب هژمێرن. چونکو عەرەب (وەك ملەت) ژ وێ کریارێ د بێ گونەهن مینا بێگونەهیا گورگان ژ خوارنا یوسفی.

# ڕۆڵی تاکایەتی ( ئازادی تاك ) لە ڕەوتی مێژوودا مێژووی ڕۆژئاوا وەك نموونە

سامان حسين احمد

ئەگەر چی مێژووی مرۆڤایەتی بە سەرجەم قۆناغ و ڕووداوەکانیەوە بریتیە لە زنجیرەیەك ململانێ و شەڕوشۆڕ و بەریەکەوتنی بەرژەوەندیە جیاجیاکان کە سەرنجام لە شێوەی کۆمەڵێك ڕوداوی سیاسی و گۆڕانی ئابوری و کۆمەڵایەتیدا دەردەکەوێت، بەڵام ڕاستیەکەی لەجەوهەردا یەکێك لەپاڵنەرە سەرەکیەکانی ئەم جوڵەیەی مێژوو،(تاکایەتی)یان ئازادی تاکە. تاکایەتی یان هەست کردن بەتاکایەتی (چونکە مرۆڤ ناتوانێت هەست بە ئازادی بکات و مافەکانی بە ئازادی مومارەسە بکات تا هەست بەتاکایەتی خۆی نەکات)هەر لەهەنگاوە سەرەتاییەکانی ڕەوتی ڕەوڕەوەی مێژووەوە بزوێنەرێکی سەرەکی ئەم ڕەوتە بووە ولە ناخدا قۆناغە جیاجیاکانی مێژوو بە جۆرێك لەجۆرەکان گوزارشتکردنێکی ناوەخنیانەی ڕادەی پانتای بەدەستهێنانی بڕی ئازادی تاك بووە و تاکیش هەر لە سەرەتای مێژووەوە بە هەموو جۆرێك و بەپێی ئاستی گەشە سەندوی ئەو قۆناغەی تیایدا ژیاوە هەوڵی بەدەستهێنانی هەرچی زیاتری ئەو ئازادیەی داوە و لەم پێناوەشدا بەشی زۆری ململانێکانی لەگەڵ سروشت وەك بەربەستێك و سەرجەم بەربەستە کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی وفیکرییەکاندا ئەنجامداوە، بۆیە دەکرێت بڵێین ڕادەی بەدەستهاتووی ئازادی تاك پێوەرێکی ڕاستەقینەی ئاستی گەشەسەندنی هەر کۆمەڵگایەکە، یان بەمانایەکی تر ئەم ئازادیەی تاك ڕەنگدانەوەی ئاستی گەشەکردووی کایە جیاجیاکانی ژیانی مرۆییە وپێچەوانەکەشی هەر ڕاستە،چونکە هەر گۆڕانێك کەبەسەر پانتایی و ڕادەی ئەم ئازادیەدا هاتبێت، لە دوا ئەنجامدا بەشێوەیەکی ڕێژەیی گۆڕینێکی هەمە لایەنی بەسەر تەواوی کەلێنەکانی ژیاندا هێناوە. کەواتە مرۆڤ هەر لە بەرەبەیانی مێژووەوە کاری بۆ ئەوە کردوە کە خاوەنایەتی تاکایەتی خۆی بۆ خۆی بێت و ئازادیەکانی وەك تاك و مرۆڤ بەدەستبهێنێت و ئەمەش بەڕێگای کەناڵی جیا جیاو بەڕادەی جیا کە لە

قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر بە پێی ڕادەی گەشەکردویی ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و کلتوری و سیاسی دەگۆڕێت.

مرۆڤ لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا کە لە قۆناغێکی زۆر دواکەوتووی ژیاندا بوو و بۆ دابینکردنی بژێوی ژیانی پشتی بە دەست و چەنگاڵەکانی خۆی و ئامێرە زۆر سادەکان دەبەستا و لەئاستێکی زۆر سەرەتایی فیکریدا بوو، بەشێکی دانەبڕاو بوو لە سروشتەکەی دەورووبەری، هاوکات ئەم نزمی ئاستە وای کردبوو کە مرۆڤ نەتوانێت بەتاك ڕووبەڕووی سروشت و دەورووبەری ببێتەوە، بۆیە ناچاری کردبوو نەتوانێت لەدەرەوەی گروپ و کۆمەڵدا بژێت وسەرئەنجام مرۆڤ بەشێکی دانەبڕاو بوو لە کۆمەڵ یان هۆز، کەواتە لەو قۆناغەی مێژوودا مرۆڤ بەتەواوی وابەستەی سروشت و کۆمەڵ بوو بەڕادەیەك بوونی تاکایەتی بەدی نەدەکرا، لەم قۆناغەی ژیانی مرۆڤدا و دوای دەرکەوتنی کۆمەڵێك سلوکی کۆمەڵایەتی و دواتر داب و نەریتی کۆمەڵایەتی و فراوان بوونی گروپ و کۆمەڵەکان و دەرکەوتنی هۆزەکان و ئاڵۆزتربوونی کایە جیاجیاکانی ژیان و پێویستی ڕێکخستنی ژیانی ئەم گروپانە و پاراستنی ئاسایشیان، ئەوە بوو کۆمەڵێك دابونەریت و سلوك لە چەشنی یاساگەلی گشتی دەرکەوت بەناوی تابۆ. تابۆ کۆمەڵێك داب و نەریتی گشتی بوو لە هەر گروپێکدا شوێنی دەیان یاسا و هەزاران پۆلیس و سەرباز و دادگا و بەندیخانەی دەگرتەوە، بەپێی ئەو تابۆیە کۆمەڵێك موحەڕەمات و یاساخ کراوی کۆمەڵایەتی دەست نیشان کرابوو، کە مرۆڤی ئەو کات لە ترسی سزاکانی بەنهێنیش نەیدەتوانی بیر لە سەرپێچی کردن بکاتەوە، چونکە سزای هەر سەرپێچیەك کوشتن یان دەرکردن بوو لە کۆمەڵ کە ئەمیش بۆخۆی هەر کوشتن بوو.بەمجۆرە مرۆڤی کۆمەڵگای سەرەتایی بەتەواوی لە ژێر باری سروشت و لە چوارچێوەی کۆمەڵدا دەژیاو تەواو ماف و ئەرك و ڕەفتار و بیرکردنەوەی بە تابۆ سنوردار کرابوو، بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا ئەگەر بە شێوەیەکی زۆر سەرەتایی و بێ ئاگاییانەش بووبێت و ئەگەر بەڕادەیەکی دیاری کراو و لە چەند بوارێکی زۆر کەمیشدا بووبێت مرۆڤ توانیویەتی بە شێوەیەکی دیاری کراو گوزارشت لە کەسایەتی و تاکایەتی خۆی بکات، بۆ نمونە لە دەربڕینی ئازایەتی و بوێری لە جەنگدا یان ژیری و وریایی لە ڕاودا یان دروستکردنی ئامێرێکی بەردی، یان بەرەوپێشتر بردنی دروستکردنی ئامێرێکی بەردی یان کێشانی وێنەیەك یان هتد.ئەم کارانەی مرۆڤ لە ڕاستیدا هەنگاوێکی گەورەی مرۆڤ بوون لە قۆناغەکانی هەستکردن بە تاکایەتی و ئازادی مرۆڤ، چونکە بەم کارانە مرۆڤ جگەلەوەی توانیویەتی گوزارشت لە تاکایەتی خۆی بکات، هاوکات توانیویەتی ئەو ڕۆڵە گرنگە دەربخات کەتاك لە کۆمەڵگادا دەیگێڕێت، لە بەر ئەوەی هەر ئەم کارانە دواتر دەبنە

هۆکارێکی گرنگی پێشکەوتنی کۆمەڵی مرۆیی، هەر بۆیە دەکرێت بڵێین سەرجەمی ئەو پێشکەوتنانەی کۆمەڵگا لە کۆندا بەدیوێکدا دەگەڕێتەوە بۆ تواناو داهێنانی تاك، چونکە گومانێك لەوەدانیە کە بیرۆکەی دروستکردنی بەلەمێك لەدار یان قاپ و کەو چك لە بەرد و پەسك یان دەستاڕ لە بەرد و هتد دەگەڕێتەوە بۆ تاکێکی ناو کۆمەڵ، کە بەشێك لەم ئامێرانە بۆخۆیان شۆڕشێکی گەورەبوون لەمێژوودا. کەواتا سەرەڕای ونی تاکایەتیش لەو کۆمەڵگایەدا بەڵام مرۆڤ توانیویەتی لەڕێی کارەکانیەوە تاکایەتی خۆی نیشان بدات و دواتریش ببێتە بەشێك لە پێشکەوتنەکان، کە هەر ئەم پێشکەوتنانەش زەمینە سازی بۆ فراوانتر کردنی ئازادیەکانی تاك و سوکتر کردنی ڕادەی کۆیلایەتی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فیکری تاك کردووە بەبێ درك پێکردن و سەرئەنجامیش کۆی ئەو گۆڕان و پێشکەوتنانەی بەسەر ئامێرەکاندا هاتوون لە دوا ئەنجامدا ژیانی مرۆڤیان گۆڕی لە شێوازی کۆ کردنەوەو ڕاو شکاری و شوانکاریەوە بۆ شێوازی کشتوکاڵی، واتا پەڕینەوەی کۆمەڵگا لە قۆناغی کۆچەریەوە بۆ قۆناغی نیشتەجێبوون، کەئەمەش گەورەترین بەردی بناغەی شارستانیەت و هەنگاوێکی زۆر گرنگیش بوو لە ڕەوتی بەرەو فراوانتر چوونی پانتایی ئازادیەکانی تاك، لەبەرئەوەی ئەم گۆڕانە دواجار بوو بەمایەی لەبەر یەك هەڵوەشاندنەوەی سیستەمی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فیکری باو ئیدی تابۆ و پێکهاتە کۆنەکان وردە وردە لە چەشنی لەمپەر لەبەردەم گەشەی عەقڵی مرۆڤ و توانا ڕەخنەییەکانی دەرکەوتن، واتا گەشەکردنی تاکیان وەك تاکێکی ئازاد بەربەست کردبوو، ئیدی لەم قۆناغە نوێیەدا چەند شێوازێکی نوێی کارکردن دەرکەوتن وەك کشتوکاڵ، و ئاڵوگۆڕ و پیشەگەری و هونەری و فیکری و زانست هتد، کە شێوازەکانی ئەم کارانە ئەوەندەی تر کۆنترۆڵی کۆت و بەندە کۆنەکانی لاوازتر کرد لەسەرتاك، هاوکات هەر لەم قۆناغەشدا ناوەندی شارستانیەکان و ژیانی ئاڵۆزتر و فراوانتر کەناڵ و ڕێگا و شێوازەکانی داواکردن و بەدەستهێنانی ئەم ئازادیە فراوانتر کرد لە ڕێی فیکر و فەلسەفە و ئاینەوە و ئیدی هەوڵەکانی مرۆڤ لە بەدەست هێنانی ئازادیەکانی و تاکایەتی خۆی وردە وردە لە قۆناغی درك پێنەکردنەوە گۆڕا بۆ قۆناغی داواکردن و پلانڕێژی بۆ کردن و ڕادەی ئەم ئازادیە لە چاو پێشتر فراوانتر بوو، بەڵام ئەم ئازادیە لەو قۆناغەشدا لە ژێر کۆمەڵێك بەربەستی گەورەدا بوو کە دەبوو ڕووبەڕوویان ببێتەوە، لەوانە پیرۆزی پیاوانی ئاینی و دەسەڵاتی ڕۆحیان بۆ ملکەچکردنی تاك بۆ ئیرادەی خۆیان و سنورداركردنی ئازادیەکان تاك لەو چوارچێوەیەدا کە لەگەڵ بەرژەوەندیەکانی خۆیاندا دەگونجا و داب و نەریتە کۆمەڵایەتیە کۆنەکان و سیستەمی کۆیلایەتی کە ڕاستەوخۆ بەشێکی تاکی لەو بڕە ئازادیەی هەبوو هەر بێبەشکردبوو و لە

سەرووی هەمووشیانەوە سیستەمی دەسەڵات کە لە لایەك پارێزەری هەموو ئەمانە بوو لە لایەکی تریشەوە بەو ڕەهایەتی و پیرۆزیەی کە هەیبوو مافی ژیان و کوشتنی بەسەر تاکەوە هەبوو و سەرجەم ئازادیەکانی تاکی لەو سنورەدا بە تاك ڕەوا دەبینی کە خۆی دەیویست، بەمجۆرە لەگەل دەرکەوتنی فۆرمە نوێیەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی و فیکرییەکاندا، ئیدی بەدەستهێنانی ئەم ئازادیە ململانێەکی قورسی دەخستەوە لە نێوان ویستە نوێیەکانی تاك لە فراوانتر کردنی هەرچی زیاتری مەودای ئازادیەکانی کە لەگەل پێشهاتە ئابووری و فیکریە نوێیەکاندا بێتەوە، لەگەڵ پێکهاتە کۆنەکان لە فۆرمە ئابووری و کۆمەڵایەتی و فیکریە کۆنەکان کە لەدوا جاردا دەسەڵات نوێنەرایەتی هەمووانی دەکرد، کەواتە لە سەرەتاو کۆتایی هەر قۆناغێکی مێژوویدا ئیدی ململانێیەکی قورسی هەوڵەکانی فراوانترکردنی ئازادیەکانی تاك لەگەڵ دەسەڵات و پایە کۆنەکانی دەردەکەوت کە ئەمەش فۆرمی ڕاستەقینەی ڕەوتی مێژووە، لێرەوە فیکرە نوێیەکان شەڕێکی قورسی لەگەڵ دەسەڵاتدا دەبوو.

لە کۆمەڵگای گریکی کۆندا کاتێك کە سەرجەمی ژیان لە ژێر دەستی پیاوانی ئاینی دابوو، و لێکدانەوە ئەفسانەییەکان بە تەواوی دەسەڵات و ئیرادەیان لە تاك زەوت کردبوو، لە قۆناغێکی دیاریکراودا تەوژمێکی گەورەی فیکری، کە زادەی عەقڵی مرۆڤ بوو کەوتە کێشەیەکی گەورەوە لەگەڵ بۆچوونە کۆنەکاندا، کە تالیسی مالتی(٦٤٠-٥٤٦پ.ن) سەر مەشقی ئەم ڕەوتە بوو، تالیسی مالتی لە بۆچوونەکانیدا بە تەواوی هەوڵیدا دەسەڵاتی ئافرێنەر لە خواوەندەکان وەربگرێتەوە و ئەم لێکدانەوە ئەفسانەییانە پوچەڵ بکرێتەوە کە خواوەندەکان ئافرێنەری هەموو شتێکن، بەڵکو ئەو دەیگوت هەموو شتێك لە سروشتەوە سەرچاوەی گرتووە و هۆکاری خۆیشی هەیە و ئاویش سەرچاوەی هەموو شتەکانە، کەواتەتالیس مالتی دەیویست شوێن بەدەسەڵاتە ڕەهاکان کە ئەفسانە کۆڵەکەیان بوو لەق بکات.بەڵام لەبەرئەوەی ئەم کابرایە ڕاستەوخۆ بەگژ بەرژەوەندیەکانی دەسەڵاتدا نەچووەوە بۆیە دوچاری هیچ ڕووبەڕوو بونەوەیەکی دەسەڵات نەهاتەوە و لە ماڵەکەی خۆیدا کۆچی دوایی کرد.کەچی ئەنسکا گۆراس کە هەر فەیلەسوفێکی گریکی بوو دوای تالیسی مالتی دەرکەوت، بە نزیکەیی هەمان بۆچوونەکانی تالیسی مالتی دووبارە کردەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەمیان ئەو ئەفسانەیەی ڕەتکردەوە کەباسی لەرۆڵی خواوەندە دەکات لە دروستکردنی گەردوون، کە کۆڵەکەی سەرەکی پاراستنی دەسەڵاتی پیاوانی ئاینی بوو بەسەر تاکەکانی کۆمەڵگادا، بۆیە پیاوانی ئاینی گوشاریان خستە سەر دەسەڵات تا بڕیارێك دەربکات بۆ زیندانی کردنی هەر کەسێك کە باوڕی بە ئاینە کۆنەکە نامینێت و باوڕی تر بڵاو دەکاتەوە، بۆیە ئەنکسا گۆراس لەلایەن دەسەڵاتەوە ڕاپێچی زیندان کرا.

فەیلەسوفی دوای ئەمان پرۆتاگۆراس لە دەربڕینەکانی دا جەختی زۆری لە سەر گرنگی تاك دەکردەوە و دەیگوت مرۆڤ پێوەرە بۆهەموو شتەکان، ژیانیش لەوە کەمترە کە بە گەڕان بۆ دۆزینەوەی خواوەندەکان بەسەر ببرێت، بەڵکو پێویستە هەموو کار و چالاکیمان لەپێناو گەشاوەتر کردن و خۆشتر کردنی ژیاندا بێت. کەواتە پرۆتاگۆراس دەیویست لە بایەخی خواوەندەکان کەم بکاتەوە و بایەخی مرۆڤ و تاك بەرزتر رابگرێت کە ئەمە مایەی نیگەرانی پیاوانی ئاینی بوو، و ئەم قسانەی پرۆتاگۆراسیش لەوکاتەدا بوو کە ئەسینا لە بەرانبەر ئیسپارتیەکان شکستی خواردبوو، بۆیە ئەم قسانەی ئەویان بە هۆکاری نیگەرانی خواوەند و هۆکاری ئەو شکستە لە قەڵەم دا و راپێچی دادگا کرا. ئەمە جگە لەوەی کە هەموان چارەنوسی فەیلەسوفی مەزنی گریکی سوکرات دەزانین کەلەسەر بۆچونەکانی بەسەری هات، کەلە بەشێك لە بۆچونەکانیدا بەڕادەیەکی زۆر بانگەشە بۆ ئازادیەکانی تاك و رۆڵی تاك دەکات کە دەڵێت: "هیچ کەس بۆی نیە بۆچونی خۆی بەسەر ئەوانی تردا بسەپێنێت، یان داوایان لێ بکات وەکو ئەو بیر بکەنەوە " و دەڵێت مادام کەس ناتوانێت بگاتە ئەنجامی دروست تەنها لەرێی لێکۆلینەوەی وردەوەنەبێت، بۆیە پێویستە دەرفەت بدرێتە هەموو کەسێك کە بە ئازادی و دوور لە دەستوردانی دەسەلات لە هەموو شتەکان بکۆڵێتەوە " کۆی ئەو گوتانەی سوکرات لە دوا ئەنجامدا نیگەرانی گەورەیان بۆ دەسەلات و باوەڕە کۆنەکان دروست دەکرد، چونکە لەلایەك داوای ئازادی باوەڕ و بیرکردنەوەی دەکرد و لە لایەکی تر کەسەکانی یەکسان دەکرد لە مافی لێکۆڵینەوە و گەیشتن بە ڕاستیەکان، کە هەموو ئەمانە لە پێگەو دەسەلاتی پیاوانی ئاینیان کەمدەکردەوە، لە لایەکی تر لە دەسەلاتی دەستێوەردانی دەسەلاتی کەمدەکردەوە، هەر بۆیە ناحەزەکانی بەوە تۆمەتباریان دەکرد کەباوەڕی بەخواوەندی شار نەماوە و خواوەندی تر لە خەیاڵی خۆیەوە دادەهێنێت و ئەمەش دەبێتە مایەی تێکدانی مێشکی گەنجان، هەر بۆیە داوایان دەکرد کەبەکوشتن سزابدرێت. سەرجەمی ئەم دەربڕینانەو دەیانی تری لەم چەشنەش کە لەو کاتەدا لە کۆمەڵگای گریکیدا دەورووژێندران گوزارشتیان لە ویست و داخوازیەکانی تاك و کۆمەڵگای ئەو کاتەی ئەو ناوچەیە دەکرد و سەرئەنجام بەشێوەیەکی رێژەیی کاریگەری خۆیان لەسەر کۆمەڵگا داناوە و کاریگەر بوون لە رەنگرێژ کردنی فۆرمە کۆمەڵایەتی و سیاسی و کلتوریەکانی ئەوێ. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم تێروانینانە بەپێی سەردەمی خۆیان تەواوی ئازادیەکانی تاکی تێدا بەرجەستە نەبوو.

لە کۆمەڵگای ڕۆمانیشدا کە کۆمەڵگایەکی کۆیلایەتی بووە و ئازادیەکانی تاکیشی بە ڕادەیەکی زۆر بە کۆمەڵێك بەربەستی کۆمەڵایەتی و سیاسی بەرتەسك کرابوونەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە حوکمی فراوانی ئەم ئیمپراتۆریایە و فرەیی لە پێکهاتە ئاینی و ڕەگەزی و کلتوریەکانی لەلایەك و پێشکەوتوویی شێوەکانی کارکردن و بەرهەمەکان لەلایەکی تر تارڕادەیەك ئازادی پەرستن و بیرکردنەوە بەدی دەکرا، بە مەرجێك ئەو پەرستن و بیرکردنەوەیە، ترسی بۆسەر دەسەڵات دروست نەکردایەو نەبوایە هۆی کۆکردنەوەی خەڵکی لەدژی دەسەڵات و باوەڕە کۆنەکانی هەروەها نەبوایەتە هۆی نەدانی باج و سەبازی نەکردن کەئەمانە کۆڵەکەی سەرەکی ئەو دەسەڵاتە بوون، بۆیە ئەگەرچی ئاینی مەسیحی وەکو ئاینێکی نوێ لە ناوچەکە دەرکەوت بەڵام لەسەرەتادا لەبەر ئەوەی هیچ ڕەخنەیەکی لە پێکهاتەی کۆیلایەتی ئەو کۆمەڵگایە نەدەگرت و لایەنگرانی کەم بوون و قسەی لەسەر نەدانی باج و سەربازی نەکردن و نە پەرستنی ئیمپراتۆر نەکردبوو، بۆیە لەسەرەتادا ڕووبەڕووی پەرچەکرداری توندی دەسەڵات نەبووەوە، بەڵام هەر هێندەی ئاڕاستەکانی پێچەوانەی ویستەکانی دەسەڵات کەوتەوە لە نەدانی باج و نەپەرستنی ئیمپراتۆر و سەربازی نەکردن و قسەکردن لەسەر لەبەریەك هەڵوەشانەوەی کۆیلایەتی و خروشاندنی بەشێکی زۆری کۆمەڵگا لە دژی دەسەڵات، ئیدی بەتوندترین شێوە کەوتە بەر شاڵاوی ستەمکارانەی دەسەڵات.

بەڵام سەرەڕای توندی ئەو ستەمکاریەش کە نزیکەی دوو سەدە زیاتری خایاند، بەهۆی بیر و ڕاکانی ئاینی مەسیحیەوە کە لەو کاتەدا باسی یەکسانی و مافەکانی کۆیلە و ئازادیەکانی تاکی دەکرد، لەو کاتەدا کەسەرلەبەری پێکهاتە ئابوری و کۆمەڵایەتی و سیاسیەکەی دەوڵەتی ڕۆمانی بەرەو لەبەریەکهەڵوەشان دەچوو و دەبووە بار بەسەر کۆمەڵگاوە، ئیدی تاکەکانی ئەو کۆمەڵگایە ئەم باوەڕەیان بە بەدیهێنەری هەرچی زووتری ئازادیەکان دەزانی، بۆیە ئاینی مەسیحی بەخێرایی لە چەشنی بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی گەورە دەرکەوت و توانی وردەوردە شوێنی پیکهاتە کۆنەکانی ئەو کۆمەڵگایەبگرێتەوە.

بەڕوخانی کۆمەڵگای ڕۆمانی، ئیدی وردەوردە پەیوەندیە ئابوریەکانی سەدەکانی ناوەڕاست کەخۆی لە ژیانی کشتوکاڵی دەبینیەوە بەرەو جێگیر بوون چوون و بوونە شێوازی سەرەکی دابین کردنی ژیانی ئابوری کۆمەڵگا و سەرئەنجام بوونە بناغەی دەرکەوتنی کۆمەڵگایەکی داخراو و باڵادەستبوونی پەیوەندیە دەرەبەگایەتیەکان و سەرئەنجام ئەم پەیوەندیە داخراوە زەمینەی دەرکەوتنی کۆمەڵگایەکی

دواکەوتووی خۆش کرد، کە هەموو ئەمانە ڕێخۆشکەری بالادەستبوونی ئاینی مەسیحی و دواتریش داتاشیتی باوەڕە عەقیدەییە خورافی و ئەفسانەییەکانیان کرد، بەمەش لە سەدەکانی ناوەڕاستدا تاکایەتی تاك بەتەواوی لە ناو ژیانی کشتوکالی و پێکهاتەی خێڵەکی و هۆزایەتی لادێ دا ونبوو، هاوکات بیروڕا عەقیدەیی و ئەو دونیایەکانی ئاینی مەسیحی کە پشتگیریان لە ملکەچی بۆ خاوەن زەوی و دەسەلات دەکرد و هەوڵی دەدا بەتەواوی ژیانی ئەم دونیایە بێبایەخ بکات و سەرلەبەری ژیان لەم دونیا بخاتە خزمەت بەدەستهێنانی ئەو دونیا، ئەوەندەی تر وای لە مرۆڤی ئەو سەردەمە کرد لە بۆتەی کۆمەڵدا بتوێتەوە و تاکێکی بێ ئیرادەی دروست کرد، بەڵام ئەمجۆرە کۆمەڵگایەش جارێکی تر لەگەڵ ئەو گۆڕان و گەشەکردنانەی بەسەر شێوازەکانی بەرهەمهێنان و دابین کردنی بژێویدا هاتن لە دوادوایی سەدەکانی ناوەڕاستدا کە بازرگانی و پیشەگەری وردەوردە گەشەیان کرد و دیاردە ئابوریە سەرمایەداریەکان چەکەرەیان کرد و شارەکان بەرەو فراوان بوون چوون، ئەمجۆرە کارو پێشکەوتنەش ڕاستەوخۆ وابەستەی ئازادبوونی مرۆڤەکان، بوو لەو کۆت و بەندانەی کەژیانی ئابوری و کۆمەلایەتی سەدەکانی ناوەڕاست سەپاندبوویان و ئەو پەیوەندیە کۆنانە لەشێوەی لەمپەر لەبەردەم ئازادیەکانی تاك و گەشەی عەقڵی مرۆڤ دەرکەوتن، بە جۆرێك کە لەسەدەی سێزدەدا خەڵکی ئەوروپا، شارەکانیان بەمایەی ئازادی دەزانی و دەیان گوت کەش و هەوای شار ئازادی دەخولقێنێت، چونکە لەوێدا جوتیارەکان لە کۆت و دەسەلاتی دەرەبەگایەتی ڕزگاریان دەبوو و ئازادانە کاریان دەکرد ئەم ئازادی کارکردنەش سەرئەنجام ئازادی بیرکردنەوە و دواتریش تاکایەتی تاکی دەڕەخساند، لێرەشەوە عەقڵی ڕەخنەیی و داواکاری ئازادیەکا،ی تاك جارێکی تر کەوتنەوە ململانێ لەگەڵ دەسەلاتە کۆنەکان دا و ئەمەش شەرێکی قورسی خستەوە کە دەب ان کەسی وەکو ڕۆجێر بیکۆن و جۆن هس و سافۆناڕۆلای دووچاری ڕاپێچ کردن بۆبەردەم دادگاکانی پشکنین و جۆرەها سزای قورس کردەوە، ئەم ململانێیەش شان بەشانی ئەو پێشکەوتنانەی کەبەسەر ژیانی ئابوری دا دەهاتن ئاڵۆزترو هەمەلایەن تر دەبوون و ڕوونتر دەردەکەوتن و لەم بوارەشدا دەیانی وەك دانتی و پەترارك و بۆکاشیۆ و ئیراسموس و هتد. لە بەرهەمە ئەدەبی و هونەری و زانستی و فیکریەکانیاندا جەختیان لەسەر ڕۆڵی تاك و ئازادیەکانی دەکردەوە، لێرەشەوە جارێکی تر بەدەستهێنانی هەر چی زیاتری ئازادیەکانی تاکە وەك بزوێنەرێکی مێژوویی دەرکەوت و پێویستبوونی خۆی لە ڕەوتی مێژوویدا سەپاند، بەو مەبەستەی کەڕادەی ئازادیەکان بگاتە ئەو ڕادەییەی کە لەگەڵ پێشهاتە ئابوری و کۆمەلایەتیەکاندا بگونجێت، ئەمەش وای

کرد کە ڕۆژ بە ڕۆژ تەوژمی ئەو جوولە فیکریە بەتینتر بێت و سەرئەنجام لە چەشنی بزوتنەوەیەکی هەمەلایەنەدا دەرکەوێت بەناوی بزوتنەوەی ڕێنسانسەوە کە ئەرکی سەرەکی ڕخنەگرتن بوو لە پەیوەندیە کۆنەکان و هەوڵی گەڕان بوو بەدوای پەیوەندیە نوێیەکاندا. ئەم بزوتنەوەیە ئەگەرچی لە ڕواڵەتدا وەك بزوتنەوەی زیندوکردنەوەی کلتور و فیکری گریك و ڕۆم دەرکەوت، بەلام لەجەوهەردا بزوتنەوەی بانگەشە کردن بوو بۆ ئازادی عەقڵ و بەدەستهێنانی مافەکانی بیرکردنەوە و گوتن و گرنگی دان بە خود و تاکایەتی تاك. لە ڕینسانسدا ئەم جوولەیە بەناوی تاکگەراییەوە تەواو خەملی و ئیدی بەتەواوی پێکهاتەی کەسایەتی و تاکایەتی سەدەکانی ناوەڕاستی دایە بەر ڕەخنەی عەقلانیانە و هەوڵەکانی بۆ بەرزو پیرۆزتر ڕاگرتنی توانای جەستەیی و عەقڵی مرۆڤ بە گوڕتر کرد، لە ئەنجامی ئەم بزوتنەوەیەشدا بەتەواوی تێڕوانینی مرۆڤ بۆ ژیان و خود گۆڕا، لە وتێڕوانینە کۆنەی سەدەکانی ناوەڕاستەوە کەبریتی بوو لە خەفەکردنی خود، بۆ تێڕوانینێکی نوێ کەتاك بتوانێت زۆر ڕاست گۆیانەو بێترس گوزارشت لە خۆی بکات و بونی خۆی دەربخات.بەمجۆرە ڕێنسانس و سەرجەم جوڵەکانی تریش بەجۆرێك لە جۆرەکان گوزارشتیان لە هەوڵی مرۆڤ بۆ هەستکردت بەتاکایەتی خۆی کردوە.لە ڕێنسانسدا سەرجەم مافە جستەیی و ڕوحی و فیکریەکان مرۆڤ جەختی لەسەر کرایەوە بەرانبەر بە سەرجەم دەسەلاتەکان، ئیدی لێرەوە بەتەواوی پێکهاتەی ئابوری و کۆمەلایەتی و فیکری سەدەکانی ناوەڕاستی سەرەوەلێژ کردەوە بەرەو نەمان و کەسایەتی و تاکایەتیەکەی سەدەکانی ناوەڕاست لە بەریەکهەڵوەشا و لەبەرانبەریشدا سیستەمی سەرمایەداری و ململانێ ئابوریەکان و ڕۆڵی تاك لەدابین کردنی بژێوی تادەهات ویستە تاکایەتیەکان ڕونتر و بە گوڕتر دەکرد لە سەرجەم کایەکانی ئابوری و فیکری و زانستی و هونەری و فەلسەفی و ئاینی دا و لە ڕیفۆرمی ئاینیشدا ئەوەندەی تر پانتایی ئەم ئازادیە لە ژیانی ئاینی و هەڵبژاردنی باوەڕەکاندا فراوانتر بوو ئیدی ئەم پانتایی ئازادیەش تادەهات لەگەڵ گەشەکردنەکاندا فراوانتر دەبوو بەرەو کایە سیاسی و مەدەنیەکانی تر پەلی دەهاویشت،ڕۆڵی عەقڵ و بالادەستبوون بەسەر ژیاندا کە ئەمە هێمای بنەڕەتی ئازادی تاکە، گوڕی دەسەند و دەبووە ویستی کۆمەڵگا، دیکارتی فەیلەسوفی داهێنەری پرەنسیپی گومان لە شوێنێکدا دەڵێت"جیهان پڕە لە نەزانی ، چارەسەریشی هەر ئەوەیە سەرجەم پێکهاتەکانی کە هەن تێکبشکێندرێن و سەرلەنوێ لەسەر بنەمای عەقڵ و ئەزموون بونیاد بنرێتەوە" و فەیلەسوفی یەهودیش سپینۆزا دەڵێت" بەرژەوەندی گشتی ئێستا لە دژی پیاوانی ئاینی و سیستەمی فەرمانڕوایەتی باو دایە ئاماژەش بۆ ئەوە دەکات کە ڕاستگۆیی فیکری و دەستپاکی زانستی و هەڵوێستی شەریفانە بۆ

سەلامەتی و ئاسایشی دەوڵەت باشترە لەنیفاقی فیکری و شێواندنی زانستی وەرایی کردن و پێیاهەڵدان بۆ دەسەلات و دەڵێت ئەوە هیچ زیان ناگەیەنێت گەر عەقڵ ببێتە بناغەی باوەڕ و سیستەمی سیاسی، بەڵکو قازانج لەوەدایە". ململانێی نێوان بیرە نوێیەکان و پێکهاتە کۆنەکان کە وەك پێشتر باسکرا ئازادی تاك ڕۆڵی کارای تێدابوو لەدوای ڕێنسانس و ڕیفۆرمی ئاینی و گەشەکردنە زانستیەکانی سەدەی حەڤدەوە هێندەی تر بە تینبوو لە کۆمەڵگای ڕۆژئاوایدا و لەسەرەتای سەدەی هەژدە شەوە هەوڵ و نوسینەکانی ئەم بوارە زۆرتر وکاریگەر تر دەبوون لەکۆمەڵگا و کۆمەڵگای ڕۆژئاوایی تادەهات بەهۆی ئەو گەشەکردنە خێرایانەی لە ڕووی ئابوری و کۆمەلایەتیەوە بە خۆیەوە دەیبینی لە بارتر دەبوو بۆ دەرکەوتی ئەو فیکر و بانگەشانەی کە هەرچی زیاترە داوای ئازادیەکانی تاك و مافەکانی مرۆڤیان دەکرد، لێرەوە بەجۆرێك ئەم فیکرانە بوون بە پیویستیەکی مێژوویی لە پێناو بەردەوام بوونی ڕەوتی مێژوو، کەدواجار ئەمجۆرە فیکرە لە بەرگی جوڵەیەکی کۆمەلایەتی و سیاسی شۆڕشگێڕانەدا دەرکەوت، کەلەم قۆناغەدا ڕۆشنگەرەکان دەرکەوتن و بەشێوەیەکی عەقلانیانە هەوڵیاندا کۆڵەکە ڕزیوەکانی کۆمەڵگای سەدەکانی ناوەڕاست لەسەرجەم کایەکانی ژیان تێکبشکێنن، و پێشەنگانی ئەم ڕەوتە فیکرییە ڕۆڵێکی گەورەیان گێڕا لە زەقتر کردنی وێنەی ئازادیەکانی تاك و کردنی بە جوڵەیەکی کۆمەلایەتی فرە لایەن و ئیدی لە بەرهەمەکانیاندا زۆر بەڕوونی ڕەخنەیان ئاراستەی شێوازی دەسەلات و پەیوەندیە کۆمەلایەتی و ئابوریە باوەکان دەکرد، بۆ نمونە جان جاك ڕۆسۆ لە کتێبی پەیمانی کۆمەلایەتیدا دەڵێت " کۆمەڵگا لە ئەنجامی گرێبەستی نێوان تاکە ئازادەکانەوە دروستبووە،واتا مافەکانی تاك بەر لە یاساکانی کۆمەڵگا هەن، بۆیە تاکە زامنی مانەوەی کۆمەڵگا پاراستنی ئەو مافانەی تاکە، ڕۆحی تاکایەتی بەهایەکی پیرۆزە و هیچ هێز و دەسەلاتێك مافی خەفەکردنی نییە، بۆیە ئازادی مافی سروشتی مرۆڤە، و گەلیش مافی ئەوەی هەیە بەهێزیش بێت ئەوانی تر ناچار بکات دان بەئازادیەکانیدا بنێن"، واتا ئەم بیریارانە بە هێمنی ئەوەیان ڕوندەکردەوە کە ئازادیەکانی تاك مافێکی سروشتیە و دەسەلاتەکان دەیانەوێت لێیان زەوت بکەن، هەربۆیە تاك و دواتریش کۆمەڵ مافی بەرگری کردنیان لەم ئازادیانە هەیە ئەگەر بەهێزیش بێت، کەواتە ئەمان ڕۆحی شۆڕشگێڕانەی مرۆڤەکانیان دەوروژاند، لەم قۆناغەشدا بەهۆی ئەوەی کە کۆمەڵگا لە گەشەکردنی بەردەوامدا بوو ، بۆیە پێویستی بە گۆڕینی سەرجەم کایەکانی تری دەسەلاتی سیاسی و یاساو ڕێسا کۆمەلایەتیەکان بوو کە بەجۆرێك مافەکانی تاك فەراهەم بکات لەگەڵ ئەو گەشەکردنانەدا بگونجێت، بۆیە لەم ماوەیەدا ململانێی نێوان دەسەلات و کۆمەڵگە گەیشتبوە لوتکەی گرژی، دەسەلات

بۆ خۆ پارێزی سەرجەم رێگاکانی دەگرتە بەرو لەوپەری توندو تیژیدابوو، کۆمەڵگاش بۆ فەراهەم کردنی ئازادیەکانی تەواوی کەناڵەکانی دەگرتەبەرو رەوتی جۆراوجۆری فیکری دەرکەوتن، بۆ نمونە مەوسوعیەکان کە هەوڵیان دەدا بناغەی خورافیانەی فیکر لەبەریەك هەڵوەشێنن، ئەوە بسەلمێنن کە فیکر لە ئەنجامی ئەزمون و هەستەکانی مرۆڤەوە هاتوە، نەك پێش وەخت بوبێت ، ئەوان جەختیان لەوە دەکردەوە ، کە ئامانجی مرۆڤ هەر ئەوەیە برێکی زیاتر لە خۆشگوزەرانی بەدەست بێنێت کە لە ژێر باری عەقڵدا بێت و دژی بازرگانی کۆیلەو ئیستعمارو ئەشکەنجەدانی مرۆڤ و سزای قورس و باجی زۆرو شەڕوشۆڕ بوون و بایەخیان بە پیشەسازی و رۆڵی کار دەدا. ئەمانە ئەگەر چی بەشێوەیەکی راستەوخۆش هێرشیان نەدەکردە سەر باوەڕ بەلام هێرشیان دەکردە سەر خورافە، هێرشیان نەدەکردە سەر ئاین بەڵکو پیاوانی ئاینی، راشکاوانە داوای شۆڕشیان نەدەکرد بەڵکو ئەمجۆرە روحەیان لە نێو کۆمەڵدا دەوروژاند.

لەم قۆناغەدا لە رۆژئاوا ململانێکانی تاك لە پێناو ئازادیەکانی تەواو چڕبووەوە و تایبەت لە دژی دەسەلاتی رەهایەتی پاشا. چونکە بەهۆی ئەم جۆرە دەسەلاتەوە کۆمەڵێك مافی کۆمەلایەتی و ئابوری و سیاسی تاك فەرامۆش کرابوون، کە سەرەنجامی ئەم ململانێیەش تەقینەوەی شۆڕشی فەرەنسی ساڵی ١٧٨٩ز . ئەم شۆڕشە هەر لەسەرەتاوە کۆمەڵێك مافی زۆر گرنگی تاکی وروژاند لە ئازادی و یەکسانی و برایەتی و مافی هاولاتی بوون ، لەمانیش گرنگتر ئەوەبوو کە مافەکانی مرۆڤی راگەیاند لە ٢٦ی ئابی ١٧٨٩ز کە تیایدا هاتووە ( مرۆڤ بە ئازادی لەدایك دەبێت و ئازادو یەکسانیش دەمێنێتەوە لە مافەکانیدا کە بریتین لە ئازادی و موڵکایەتی و سەلامەتی و بەرەنگاربونەوەی ستەمکاری و ئازادی کەسایەتی ...، لەبەرئەوەی مرۆڤ خۆی سەروەری خۆیەتی بۆیە ئازادی گوتن و نوسین و بلاوکردنەوەو رادەربرینی هەیە )، راستیەکەی ئەم شۆڕشە جگە لەوەی وەرچەرخانێکی مێژوویی گەورەبوو لە مێژووی رۆژئاوادا ، هاوکات هەنگاوێکی زۆر گەورەی رەوتی هەوڵەکانی بەدەست هێنانی ئازادیەکانی تاك بوو کە سەرەنجام لێکەوتەکانی ئەم شۆڕشە بونە مایەی دابەش کردنی کۆمەڵگای ئەوروپی بەسەر دوو رەوتی فیکری، سیاسی، کۆمەلایەتی، جیاوازدا. رەوتێکیان لایەنگری ئازادیەکانی تاك و رزگار بوون لە کۆت و بەندە ئابوری و کۆمەلایەتی و سیاسیە کۆنەکان بوو کە لە لیبرالیەکان ناسرابوون ، ئەوی تریشیان ئەوانە بوون کە داکۆکیان لە پاراستنی فورمە سیاسی و ئابوری و کومەلایەتی و فیکریە باوو کۆنەکە دەکرد کەبە پارێزگاران دەناسران.

کۆمەڵگای رۆژئاوا لە سەدەی نۆزدەدا بە تەواوی لە ململانێی نێوان ئەم دوو رەوتەدا دەژیاو کە لە ناخدا ئەم ململانێیە گوزارشتی لە هەوڵەکانی بە دەست هێنانی هەرچی زیاتری ئازادیەکانی تاك دەکرد، چونکە لیبرالیەکان ئەو بزافە بوون کە لە رووی فیکریەوە داوای ئازادی فیکریان دەکردو پێیان وابوو ئاین شتێکی کەسییە، داوای ئەوەیان دەکرد کە کڵیسە لە پێگە بە هێزەکانی داماڵرێت. لە رووی ئابوریشەوە پشتیوانی ئازاد بوونی تاکیان دەکرد لە ژیانی ئابوریداو هاندەری کێبڕکێی ئابوری نێوان تاکەکان بوون. لە رووی سیاسیشەوە دەیان گوت دەوڵەت نابێت دەست لە کاروباری کەسی هاوڵاتیان وەربدات، بەڵکو ئەرکی دەوڵەت تەنها پارێزگاری کردنە لە سنورەکانی وڵات و پاراستنی موڵکایەتی تاکەکانێتی، هەروەها داوای شێوازی حوکمرانی دەستوری و پەرلەمانییان دەکرد. هەرچی موحافیزکارەکان بوو سوربوون لەسەر هێشتنەوەی دۆخەکە وەك خۆی و مانەوەی دەسەڵاتی رەهای پاشاو پاراستنی سیستەمە کۆمەڵایەتی و ئابوری و فیکریە کۆنەکەو ریشەکێش کردنی ئەو هەوڵانەی کە مەبەستیان بڵاو کردنەوەی بیروراکانی شورشی فەرەنسی و بنەماکانی ئازادی و یەکسانی و مافەکانی تاکە. ئەم ململانێیە تا دەهات توندتر دەبوو، لەلایەك دەسەڵاتی کۆن هەموو رێگاکانی دەگرتە بەر بۆ بەرگرتن لە لیبرالیەکان ، هەر لە داپلۆسین و سەرکوت کردنی سەربازیانەوە بگرە تا بەرتەسك کردنەوەی ئازادیەکانی رۆژنامەگەری و خۆرێکخستن و دەنگدان؛ داتاشینی یاساکانی پەرلەمان لەخزمەت بەرژەوەندیەکانی خۆیان. لەلایەکی تریش کۆمەڵگاو رەوتە لیبرالییەکان بەسەرجەم کەناڵ و رێگاکان لە هەوڵی بەدیهێنانی ئامانجەکانیاندا بوون، بە جۆرێك لەو سەردەمەدا کونجێکی ئەوروپای رۆژئاوا نەمابوو کە ئەم جۆرە جوڵەیە نەیگرێتەوە و ئەم ململانێیە نەبووبێتە مۆرکرێژکەری رەوتی رووداوەکانی و. سەرئەنجام چەندین شۆڕشی گەورەی لە چەشنی شۆڕشەکانی ١٨٣٠ و ١٨٤٨ لێکەوتەوە کە هەنگاوی گەورە بوون لە فراوانتر کردنی پانتاییەکانی ئازادیەکانی تاك و پاشەکشە پێکردنی فۆرمە کۆنەکانی دەسەڵات و ناچار کردنیان بە رازی بوون بە حوکمی پەرلەمانی و دەستوری.لەم سەدەیەداو تایبەت لە نیوەی دووەمی بەدواوە، گەشەکردنە ئابوریەکان لە رۆژئاوا تادەهات خێراتر دەبوون و ژیانی ئابوری و کۆمەڵایەتی بەرەوپێشتر دەچوون. ئەمەش ئەوەندەیتر هەوڵەکانی تاکی بەگورتر و زیاتر دەکرد و کەناڵەکانی ئەم هەوڵەی فراوانتر دەکرد و ئیدی لە رێگای خۆرێکخستن و دامەزراندنی سەندیکا و دەرکەوتنی بیرۆکەی سۆسیالیستی و رۆژنامەگەری و دەرکەوتنی خۆپێشاندان. دواتریش لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە ئەوەندەی ترئەم هەوڵانە فراوانتر بوون و چەندین رێکخراو پارت و سەندیکا بۆ

گوزارشت کردن لە بەرژەوەندی و مافی چین و توێژاڵە جیاجیاکان دەرکەوتن و ئیدی سیستەمی حوکمی دیموکراسی جێگیربوو لە دوای جەنگە گەورەکانی سەدەی بیستەمیشەوە چەندین ڕێکخراوی نێودەوڵەتی بۆ ئەم مەبەستە دەرکەوتن. کەواتا لە ئەنجامی ئەم چاوخشاندنە زۆرکورتە بەمێلە گشتیەکانی مێژووی ئەو بەشەی جیهاندا دەتوانین بڵێین سەرلەبەری جوڵەی مێژوو بەدیوێکدا گوزارشت لەو هەوڵە دەکات کە مرۆڤ لە قۆناغە جیاجیاکانی ژیانیدا لەپێناو بەدەستهێنانی کۆمەڵگایەکی گونجاو لەگەڵ ئاستی ئازادیەکانیدا داویەتی تا سەرئەنجام لە سیستەمە تابۆوە لەگەڵ ڕەوتی گەشە کردنەکاندا توانیویەتی بگاتە سیستەمی دیموکراسی و کۆمەڵگای سکۆلار و مەدەنی لە ڕۆژئاوای ئەوروپا.

سەرچاوەکان

١. سبينوزا، رسالة في اللاهوت والسياسة، ترجمة وتقديم د.حسن حنفي، مراجعة د.فؤاد زكريا،ط٤،بيروت، ١٩٩٧.
٢. كارلتون هيز، تاريخ اوربا الحديث، ترجمة د.فاضل حسين، جامعة بغداد، ١٩٨٧.
٣. محمد العزب موسى، حرية الفكر، بيروت.
٤. د.محمد علي ابو ريان،تاريخ الفكر الفلسفي (الفلسفة اليونانية من طاليس الى افلاتون)، ج١،ط٢،اسكندرية،١٩٦٥.
٥. كمال مظهر احمد، النهظة، بغداد ١٩٧٩.
٦. عرض الاقتصادى التاريخي، جامعة باتريس لومومبا للصداقة بين الشعوب، بغداد
٧. ج.بيوري ، حرية الفكر، ترجمة محمد عبد العزيز اسحق، القاهرة.
٨. فرديناند شيفل، الحضارة الاوربية في القرون الوسطى و عصر النهضة، ترجمة منير البعلبكي، بيروت،١٩٥٢.
٩. البيرسو بول، تاريخ الثورة الفرنسية، ترجمة جورج كوسي، بيروت ١٩٨٩.
١٠. د.رلوية عبد المنعم عباس، ديكارت و الفلسفة العقلية، بيروت،١٩٦٦.

# قۆناغەكانی مێژووی كۆنی كوردستان

هۆشەنگ ساڵح نەجارِ

ئەگەر بمانەوێ مێـژووی كۆنی كـورد بنووسـینەوە، دەبێ لەپێشدا،ئاماژە بەمێـژووی كـۆنی كوردسـتان بكەین. چونكە كوردستان لانكەی چەندەها نەتـەوە بـووە، كەلەوخاكـەدا ژیـاون وشارستانیان هـەبووە. بـەڵام ئەوەی جێگەی ئاماژەیە ئەوەیە، كە مێژووی كورد لەخاكی كوردستان مێـژوویێكی كۆنەولەهەموونەتـەوەكانی دیكە زیاتر خاك وزمانی خۆی پاراستووە .ئەگەرچی دەوڵـەت وقـەوارەكانی لەناوچوبن، بـەڵام وەك نەتـەوە، بـوونی خـۆی پاراسـتووە وبـەرەی پێداوە تـاوای لێهـاتووە، لەناوبۆتـەی ڕووبـەرێكی جوگرافیـدا، زۆرتـرین ڕێژەوئامادەیی خۆی سەلماندووە وئەوڕووبەرەش بەهۆی ئەم زۆری ڕێژەیە دواتر ناوندراوە (كوردستان) *.

دكتۆر (جەمال ڕەشید)لەوبارەیەوە دەڵێ:

((ئەگەربمانـەوێ لەمێـژووی كوردبكۆڵینـەوە، دەبـێ لەپلەیـەك بكۆڵینـەوە كەپلـەی پـێش بـە كوردبـوونی دانیشتوانی كوردستانە. كەدەكەوێتە بەرلە مێژووی وڵاتی كوردستان. كـەوابوو مێـژووی كوردسـتان ومێـژووی كورد دوو بابەتی جیاوازن بەڵام تەواوكەری یەكترن )).

پاشان دەڵێ ((لەوڕۆژەی ئادەمیزاد خوڵقاوە، لەسـەر ڕووی ئـەم زەمینـە، كوردسـتان مەڵبەنـدی بـووە بـەڵام كـورد وەك میللـەتێك پرۆسێـسێكی مێژووییـە، دەبـێ بپرسـین لـەم وڵاتـەدا كـێ هـەبووە یـان كـورد لـەچ كەرەستەیەك پەیدابووەوچۆن و چی بووە؟))(١)

كەوایە ئێمە پێویستمان بەتوێژینەوەیەكی گشتگرە، لەسەر مێـژووی كوردسـتان ودواتـر پەیـدابوونی كـورد لەخاكی كوردستان و پێكەوە نانی ئەو قەوارانەی كـە بـەزمانێك قـسەیان كـردووە، بناغـەی زمـانی كـوردی ئـەمڕۆ بـوە. وەك چـۆن هەسـتی نەتـەوەیی كـوردی لەئێـستادا لـەبیری بـاو و باپیرەهاوبەشـەكانیانەوە سەرچاوە دەگرێت.

سـە بـارەت بەمێـژووی تەمـەنی مـرۆڤ وزەوی، تـاكو نیـوەی دووەمـی سـەدەی نۆزدەهـەم، زانایـان نەگەیشتبوونە بیروباوەڕێكی ڕاستەقینەی زانینی تەمەنی زەوی ودەركەوتنی مرۆڤایەتی لەسەریدا. مێژوونوسە

یۆنانی وڕۆمانییەکان، تەنها ئەوەندەیان درك پێکردبوو، کەمێژووی دەرکەوتنی مرۆڤ لەسەر زەوی مێژوویێکی دووروودرێژە، بێ ئەوەی هیچ کات وشوێنێك دیاری بکەن، بەڵام هەندێ لەمێژوونووسەکان، کەلەژێر کاریگەری (تەورات)وکتێبە ئاسمانیەکان دەیانوسیەوە. ئەم سەرەتایەیان، دەگەڕاندەوە بۆ(ئادەم وحەوا) بێ دیاریکردنی هیچ کاتێك ،کەئەوانە بەیەکەم مرۆڤی دروستکراوی خواوەند دادەندرێن، لەسەرزەمین وەرچەی ڕەچەڵەکی مرۆڤەکان هەیە، دەگەڕێتەوە سەرئەوان. پاش ئەوەی مرۆڤەکان لەوڕێبازانە لایاندا کەخواوەند لەڕێگەی پێغەمبەر (نوح)ەوە بۆمرۆڤایەتی ڕەوانەی کردبوو لەسزای ئەوە، خواوەند سەرتاپای گۆی زەوی کردە(لافاو)وبەئاو داپۆشی. ئەوانەی کەلەم کارەساتە ڕزگاریان بوو ،(نوح)و هاوڕێ شوێنکەوتووەکانی بوون، کەبەهۆی کەشتییەکەوە لەسەرشاخێك بەناوی (جودی)گیرسانەوە، ڕزگاربووانی ئەم ڕووداوەش بۆ جاری دووەم بوونە باوەگەورەی ڕەچەڵەکی مرۆڤایەتی. ئەم ڕووداوە تەنانەت لەلایەن سۆمەروئەکەدوئاشورییەکانیش تۆمار کراوە(٢).

گومان لەوە دانییە، کە چیای (جودی)کەوتۆتە ناو خاکی کوردستان .(تەهاباقر)لەوبارەیەوە دەڵێ((ئەوشاخەی کەکەشتییەکەی (نوح)ی لەسەر گیرساوەتەوە، بەپێی ئەوەی کەلە تەورات گێردراوەتەوە، بریتییە لە(ئارارات)لە(ئەرمینیا)،لەقورئانیش بەوشاخە گوتراوە (جودی)ئاشوریەکانیش لەمێژووی خۆیان بە(نصیر)تۆماریان کردووە ڕەنگە مەبەست لەم شاخە، شاخی (پیرەمەگرون) ی ئێستای نزیك سلێمانی بێت..))(٣) بەڵام ئەمە لەڕاستیدا وانییە، چونکە (چیای نسێری)هەرچیای (جودی)یە، کەلە باکوری دەشتی (سلۆپیا)یە. ئەم ناوچەیەش لەپێش ئیسلام بە(قردۆ)لەسەرچاوە سریانەکانیش بە(قردا)ناوی هاتووە(٤).

تەنانەت مێژوونوسە عەرەبەکانیش، بەهەمان شێوە لەمێژووەکانیان پشتیان بەمێژوونوسە یۆنانی وسەرچاوەکانی وەك(تەورات)بەستووە. سەرەڕای ئەوەی مێژوونوسانی ڕۆژئاواش کاریگەری تەوراتیان بەسەرەوە بووە. تاوەکوو سەدەی نۆزدەهەم لەساڵی (١٨٥٦ز) یەکێك لەو مێژوونوسە ڕۆژئاواییانە ئاماژە بەوە دەکات، کە خوا (ئادەم)ی دروست کردووە، لە ٤٩٦٣ ساڵ پێش (عیسا) وە دواتر خواوەند بەهۆی هەڵەیەکەوە سزایان دەداو مەرگ وژیانیان بەسەردا دەسەپێنێ (٥).

بەڵام لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم بەولاوە ،کۆمەڵێك تیۆری پشت بەستوو بەپێوەرە زانستییەکان سەبارەت بەڕەچەڵەکی مرۆڤ وبونەوەران لەسەرزەوی، هاتنە کایەوە .

سەبارەت بەتەمەنی (زەوی)یش هەریەك لە(ئیزاك ئاسیمۆف وفرانك وایت)لەکتێبەکەیان(مێژووی شارستانییەت)دەڵێن ((ڕای هەرەڕوونی زانایان ئەوەیە، کە جیهان لە وردە ماددەی لەژمارە نەهاتوو پێکهاتووە. بەتینی یەکجار زۆری گەرما تەقیونەتەوە. شوێنەواری ئەم تەقینەوەیە، تا ئەمڕۆش

هەستپێدەكرێت. كاتی ئەوتەقینەوەیان دەگەڕاندەوە، بۆنزیكەی دووملیار ساڵ لەمەوبەر، بەڵام لێكۆڵینەوە وردەكان، مێژووی ئەم تەقینەوەیان گواستەوە بۆسەردەمێكی دوورتر، مێژوویەك كەئەمڕۆ هەموو لایەكمان لەسەری كۆكین پانزدەملیار ساڵە. دەربارەی پێكهاتنی جیهان حیسابەكان بەگوێرەی ملیار دەكرێن. چ لەبواری ئەوكۆمەڵە ئەستێرانەوە كە بەكاكێشان دەناسرێن ودەستبەجێ دوای تەقینەوە پەیدابوون و چ دەربارەی ئەونەستێرانەی كەلەدڵی كاكێشانەكاندان. خۆرونەستێرەكانی كۆمەڵەی خۆر نزیكەی چوارملیاروشەشسەدهەزارساڵ لەمەوبەر پێك هاتوون))(٦)

لەكاتێك هەندێ كەمتری دەكەنەوە، دەیگەڕێننەوە بۆ پێنج ملیار ساڵ وقۆناغەكانی پێكهاتنی بەم شێوەیە دابەش دەكەن :

١-قۆناغی بریكەمبری le precambrian :ماوەكەی چوار ملیار ساڵ بووە.

٢-قۆناغی دووەم primarie :ماوەكەی (٥٧٠)ملیار ساڵ بووە .

٣-قۆناغی سێیەم tertaire :ماوەكەی ٦٥ملیۆن ساڵ بووە (٧).

بیروڕای زانا نوێیەكان، سەبارەت بەسەردەمی پەیدابوونی مرۆڤ لەسەر زەوی لەیەك جیاوازن. هەندێكیان ئەم سەردەمە دەبەنەوە بۆ چل هەزار ساڵ لەمەوبەر. بەڵگەی ئەمەش دۆزینەوەی كەللەسەرێكی ئادەمیزادە، كەلە (نیاندەرتاڵ) دۆزراوەتەوە.لەوانەیە كەللەسەری یەكەم ئادەمیزاد بێت. ئەم ئادەمیزادە لەسەردەمی بەستەڵەكدا ژیاوە. لەكاتێك دا ئەوروپا پارچەیەك سەهۆڵ بوە. ئەوسا ئاو ئینگلتەرا و فەرەنسای لەوبەشەدا، كەئیمڕۆ پێی دەڵێن (دەریای مانش) لەیەك جیاكردبۆوە. لەكاتێكدا كە دەریای(سپی ناوەڕاست) و دەریای (سوور) بریتیبوون لەدۆڵێكی قوڵ كەگۆماوی بچكۆڵە، ئێرە ولەوێ تێیدا بڵاوببونەوە و زوقم هەموو خاكی ئەفەریقیای ئەمڕۆی داپۆشیبوو(٨).

بێگومان شوێنەواری مرۆڤی بەردینی كۆن هاوچەرخی مرۆڤی نیاندەرتاڵ لەئەڵمانیا لەكوردستانیش دۆزراونەتەوە. بۆ دۆزینەوەی ئەم جۆرە ژیانەی مرۆڤی كۆن، لەكوردستان دا پسپۆڕی ئاركیۆلۆژی (ڕاڵف سۆلیكی) لەگەڵ ئەندامانی كۆمەڵی خۆیدا، دەستدەكەن بەپشكنین لەسێ مەڵبەندی ناوچەی شانەدەردا. لەسەر(ڕووباری زێی گەورە).لەگوندی(شكێفت وزاوی چەمێ ) كەلەكۆتاییدا ئەنجامێكی بەسوودی دایە دەستیان وگرنگیەكی زانستی هەبوو بۆ (ئاركیۆلۆژیا)(٩).

هەندێكی دیكە، سەرەتاكانی پەیدابوونی مرۆڤ ،زۆر دوورتر لەمە دەگێڕنەوە. پاش لێكۆڵینەوە ئەم زانایانە بۆیان دەركەوت، كە ڕەنگە دەركەوتنی مرۆڤ لەسەر زەوی بۆ چاخی جیۆلۆجی سێیەم بگەڕێتەوە. ئەم بۆچونەش لەڕێگەی دۆزینەوەی پاشماوەی ئێسك وپروسكی چەند مرۆڤێك بوو كە مێژووەكەی

دەگەڕێتەوە بۆ یەك ملیۆن ساڵ. هەمان تیۆر پێیوایە کە سەرەتاکانی دەرکەوتنی مرۆڤ لەکیشوەری (ئەفریقیا)بووە.دواتر گواستویانەتەوە، بۆ (ئاسیا) وشوێنەکانی دیکە.زانایان ناوی جۆراوجۆریان لەومرۆڤە کۆنانــــە نــــاوە، کــــە دۆزیویانەتــــەوە. کۆنترینیــــان جۆرێکــــە، پێــــی دەڵــــێن مرۆڤــــی (ئۆسترالۆپیتیك_australopithsque) .کەلەچاڵەکانی(حەبەشە)لەساڵی (١٩٧٤ز) دۆزراوەتەوە. هەروەها جۆری (لوسی)کەدەگەڕێتەوە بۆچوارملیۆن ساڵ پێش ئێستا.لەکیشوەری ئاسیاش شوێنەواری جۆرێك لە کـۆنترین مـرۆڤ دۆزراوەتـەوە، کـە مێژووەکـەی دەگەڕێتـەوە بـۆ (٧٠٠)هـەزار سـاڵ پـێش ئێستا. لـەجۆری مرۆڤی(جاوا)یە. هەروەها مرۆڤی (پەکین–sinanthrope)کەمێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ (٥٠٠)هەزار ساڵ (١٠).

چاخەکانی پێش مێژوو بەشێوەیەکی گشتی دابەش دەبن بۆ دوو قۆناغی سەرەکی، کەبریتین لەچاخی بەردینی کۆن وچاخی بەردینی نوێ. وە قۆناغێك لەیەکیان جیا دەکاتـەوە پێی دەڵێن قۆناغی ناوەڕاست–میزۆلیتی .

یەکەم/چاخی بەردینی کۆن–ئایۆلیتی eolithic:

سەردەمانی ئەم چاخە زۆر ڕوون نییە، دەگەڕێتـەوە بۆناوەڕاستی دەم وساتی (بلایستۆسین) واتـە کۆتـایی چاخی بەستەڵەك لەئەورووپا کەدەکاتـە دەوروبەری (٥٠٠٠٠)تـا(١٠٠٠٠)سـاڵ پـێش ئێستا. لـەم سـەردەمە، پاشماوەی چەند ئامێرێکی کۆن وسەرەتایی لەئەفریقیا دۆزراونەتەوە(١١).

ئەم قۆناغەش دابەش دەبێت بۆ:

١–چاخی بەردینی کۆنی نزم(lower palaeolithic):

دابەشدەبێت بۆ ( ئەبیفیلی یان شیلی–chellean).کاتەکەی لەئەورووپا، دەگەڕێتەوە بۆ چاخی بەستەڵەکی یەکەم. پاشماوەی کـەل وپەلـەکانی ئـەم قۆناغـە لـەعێراق ومیسۆپۆتامیا دۆزراونەتـەوە. .هـەروەها مـاوەی (کلاکتــۆنی–clactonian)،کەئــەویش هــەر دەکەوێتــە ئــەو قۆناغــە. پاشماوەکــانی لەکوردســتان دۆزراوەتەوە.بەڵام ماوەی (ئاشولی–acheulian) هەندێك لەکەل وپەلەکانی لەکوردستان دۆزراونەوتـەوە، لەناوچـەی (پردەپلکـا)ی نزیـك (چەمـچەماڵ) دوا مـاوەی چـاخی بـەردینی زۆر کـۆن مـاوەی(لفـالوازی–levallosian)یان چاخی مستیری یە(١٢).

٢–چاخی بەردینی کۆنی ناوەڕاست (middle palaeolithic):

ئەم چاخە تاکوو چاخی بەستەڵەکی چوارەم درێژ دەبێتەوە.لـەم چـاخە جـۆرە مرۆڤێـك ژیاوە پێـی گـوتراوە (نیانــدەرتاڵ Neanderthal)(١٣)،کــەپاشماوەی ئــەم جــۆرە مرۆڤــە لەکوردســتان لەئەشــکەوتی (شانەدەر)لەچینی(d)بەپێی هەڵکۆڵینەکانی (ڕاڵف سۆلیکی)دۆزراوەتەوە.جگە لـەپاشماوەی کـەل وپـەلـەکانی

قۆناغی (مستیری) بەپێی لێکۆڵینەوەکەی (سۆلیکی) ئەم چەشنە ئێسك وپروسكەی، لەچینی(d)ئەشکەوتی (شانەدەر)دۆزراوەتەوە،لەکۆمەڵی(نیاندەرتاڵی پارێزن).جیاوازە لەکۆمەڵی (نیاندەرتاڵی پێشکەوتوو-progressive).کەلەئەشکەوتی (کەرمەل)لە(فەلەستین)دۆزراوەتەوە.ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە(نیاندەرتاڵی کوردستان) وشاخەکانی زاگرۆس بۆماوەیەکی درێژ خۆی پاراستووە وبەردەوام بووە .دکتۆر جەمال ڕەشید دەڵێ ((تیپی (نیاندەرتاڵی کوردستان) بەپێی کات کۆنترە لەوەی (فەلەستین).بەپێی بیروباوەڕی (سۆلیکی)، نیاندەرتاڵی شانەدەر ئامێرێکی وای بەکارهێناوە کەبەتیپ نوێتر بووە لەئامێری کاری نیاندەرتاڵی کەرمەل لە فەلەستین))(١٤).

٣-چاخی بەردینی کۆنی بالا (upper palaelithic):

دەکەوێتە بەشی کۆتایی ماوەی (بلایستۆسین-چاخی بەستەڵەکی چوارەم بەرلە٥٠٠٠تا٤٠٠٠٠)ساڵ بەرلەئێستا، لەوسەردەمەجۆرە مرۆڤێکی نوێ دەرکەوتووە، پێی گوتراوە (مرۆڤی نوێ home sapiens).کۆمەڵێك کەل وپەلی لەبەرد دروستکراوی ئەوسەردەمە لەچینی (b)لەئەشکەوتی(شانەدەر)ی شاخەکانی(برادۆست)لە کوردستان دۆزراونەتەوە.بۆیە ئەم قۆناغە ناوندراوە(قۆناغی برادۆستی).کەل وپەلەکانی ئەشکەوتی (هەزارمێرد)و(زەرزی)هاوچەرخی هەمان ئەو قۆناغەن(١٥). شوێنەوارناس (دوروتی گارود-garrod) لەساڵی( ١٩٢٨ن) ،کاتێك پشکنینەکانی خۆی لەکوردستان دادەکرد، ئەوەی دەرخست کەوا ئەشکەوتی (زەرزی)شوێنێکی نمونەییە بۆ کەل وپەلەکانی چاخی بەردینی کۆن.هەروەها ئەوکەل وپەلانەشی کەوا لەئەشکەوتی (زەرزی)دۆزرانەوە، لەبەرگرنگییەکەی دەشێ ناوبندرێن (پیشەسازی مۆستێری Mousterian)(١٦).

دووەم/چاخی بەردینی ناوەڕاست Mesolithic:

کاتەکەی دەگەڕێتەوە بۆچاخی بەستەڵەکی چوارەم. کەناسراوە بەدەوری (ئامێرە بەردینە وردەکان microlithic). زۆربەی کەل وپەلەکانی ئەم چاخەش، لەئەشکەوتی (زەرزی)و(هەزارمێرد)لەپارێزگای سلێمانی وچینی (c) لە ئەشکەوتی (شانەدەر)دۆزراوەتەوە.ئەمە جگە لە زۆر شوێنی دیکەی کوردستان، هەمان چەشنە کەل وپەلی هەمان سەردەم دۆزراوەتەوە.وەك (زاوی چەمێ) لە سەر(زێی گەورە)ی نزیك ئەشکەوتی شانەدەر وئەشکەوتی (پالگەوەڕومەلفەعات وکەریم شار)(١٧).دکتۆر ڕالف سۆلیکی ودکتۆر رۆزتێل سۆلیکی، لەگەڵ پشکێنەران (بریدود)و(هاو)کاتێك مەتریالەکانی ئەشکەوتی (شانەدەر و زاوی چەمێ)یان پشکنی بۆیان دەرکەوت کە نزیکایەتی لەنێوان ئەوان وکەرەستەو مەتریاڵەکانی(مەلفەعات وکەریم شار)هەیە، بەتایبەت لەڕووی( بەردە هەڵکەندراوەقورسەکان heavy ground stone )(١٨).

سێیەم/چاخی بەردینی نوێ Neolithic):

سەرەتاکەی لەدەوروبەری هەزارەی هەشتەم وحەوتەمەوە دەست پـێ دەکات تـا (٥٦٠٠پ.ز) دەخایـەنێ قۆناغەکانی ئەم چاخە، سەبارەت بە کوردستان و هەندێ لەبەشەکانی (ڕۆژهـەڵاتی دوور) بـەم شـێوەیە دابەش دەبن:

١-سەرەتای چاخی بەردینی نوێ وکۆتایی چاخی بەردینی ناوەڕاست (proto Neolithic):

شوێنەوارەکانی ئەم چاخە لەچینەکانی(a-b٢)ی ئەشکەوتی شانەدەر و زاوی چەمێ وکـەریم شـارومەلفەعات وگردچـای)دۆزراونەتـەوە.ئەوانـەی لـە(گردچـای)دۆزراونەتـەوە، بـریتین لەپارچـەکانی (بـەردی هاڕین_دەستاڕ)وپارچەکانی (دەسکە هاوەن)و(بیوری بەردین).کەهـەمان ئـەم چەشنە بیورانە لـە(مەلفەعات وکەریم شەهر)یش دۆزراونەتەوە(١٩).دکتۆر (جەمال ڕەشید)لەوبارەیەوە دەڵێ(ئەوپاشماوە کەلتوری وئامێری کارانەی کەلەهەڵکەندراوەکانی (کەریم شارومەلفەعات وگردچای)دۆزراونەتـەوە، نیشانەی ئـەو پێشکەوتنەی ئادەمیزادن لەوڵاتی کوردەواریدا، هەروەها گواستنەوەیانە لەچەرخی (میزۆلیت)ەوە بەرەوچەرخی (نیـولیتی) واتە (چەرخی بەردینی ناوەڕاستەوە بەرەو چەرخی بەردینی نوی)(٢٠).

٢-قۆناغی پێش گڵێنە سازی(pre pottery Neolithic):

لـــەم چـــاخەدا هێـــشتا کـــاری گڵێنەســـازی (فخـــار)دەرنەکـــەوتبوو. چـــینەکانی خـــوارەوەی (جەرمۆ)لەنێوان(٦)تاکوو(١٦)بریتین لەچینەکانی ئـەم قۆناغـە. چینی پێنجـەم کەدەکاتـە پلەیـەك سـەرووی چینی شەشەم ،(گڵێنە)ی تێدا دۆزراوەتەوە.هەروەها چینەکانی سەرووی (زاوی چەمێ)وچینی(١٤)تاکوو(٦)ی گردی شمشارە، لەچینەکانی ئەو قۆناغەن ئەمەجگەلەوەی (ئامرازە کشتوکاڵیەکان) لەگرنگترین مەتریاڵەکانی ناوئەوچینەن، کەئەم قۆناغەیان پێ جیا دەکرێتەوە(٢١).

٣-قۆناغی گڵێنە سازی proto Neolithic :

پاشماوەی ئەم قۆناغە بریتین لەدەفروگڵێنەی لەقوڕدروستکراو، لەچینەکانی پێنجەم تاکوو یەکەمی (جـەرمۆ) دۆزراونەتەوە(٢٢). ئەمەبەسەرەتایەکی ساکارانەی پیشەسازی ئەو قۆناغـە دادەنرێت. تەنانـەت لـەم قۆناغـە پیـشەسازی گڵێنـەیی لـە(کـەریم شـار)یش دا، هەسـتی پێـدەکرێت. کەلەچـینە بـەرزەکانی ئـەم مەڵبەنـدەدا دۆزراونەتەوە. ئەم پیشەسازییە لەگەڵ کلتـوری گڵێنـەیی (جـەرمۆ)دا لای چەمـچەماڵ یـەك شـێوەن. بـەنێوی گڵێنەی(شۆڕشی نیولیت)ناسـراوە(٢٣).لێکۆڵینـەوەکانیش ئـەوەیان دەرخـستووە،کەکاری (گڵێنـە)لـە(کـەریم شار)ەم قۆناغەبەتەواوی نەبووە. بەڵام دووپەیکەرۆکەی قوڕینی کەم سوورکراوەی بچووك دۆزراونەتەوە، کەتا ئاستێك لێکچوونێکیان هەیە لەگەڵ نمونەکانی (جەرمۆ)(٢٤).

چوارەم/چاخی بەردینی كانزایی(chalcolithic):

ماوەكەی دەگەڕێتەوە بۆ (٥٦٠٠ پ.ن)تاكوو(٣٥٠٠ پ.ن). بەشێوەیەكی گشتی مرۆڤ لەچاخی نیۆلیتی، زۆر شتی گرنگی دۆزییەوە، وەك پێشتر ئاماژەمان پێی كرد (گڵێنە)و(سەبەتە) هەروەها كاری دوورین وڕستن، بەسوودوەرگرتن لە(خوری ومووی ئاژەڵان).هەروەها دروستكردنی جل وبەرگ بۆمەبەستی خۆپاراستن لەسەرماوتووشی(٢٥). لەگرنگترین سیمایەكانی ئەو قۆناغە دروستكردنی خانووبەرەو شوێنی نیشتەجێ بوون بو. كەدواتر ئەم كۆمەڵە خانووە لە تەك یەك بەیەكەوە (گوند)یان دروست كرد. دواتر ئەوگوندانەش گەورەبوون (دەوڵەتە شار)یان دروست كرد(٢٥).ئەمەجگە لەوەی لەماوەكانی دواتردا، مرۆڤ هونەرەكانی وەك (پەیكەرتاشی و وێنەكێشان) ی ناسی. سەرەڕای دروستبوونی ژیانی بەكۆمەڵ كە سەرەتایەك بوو بۆ دروستبوونی (پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكان) ژیانی ئەم كۆمەڵەیەش پابەندبوو، بەموڵكایەتی گشتی وتایبەت.ئەوموڵكانەش وژیانی ئەوكۆمەڵە خەڵكە، پێویستی بەسەركردەیەك یان رێبەرێك هەبوو تاكارەكان رایی بكات وئاسایش بپارێزێ. هەربۆیەئەوسەردەمەسەرەتایەكە بۆدروست بوونی قەوارە وسەركردایەتی قەوارەكە. ئەمە سەرەڕای دامەزراندنی رێكخراوی سەربازی ئەم رێكخراوە سەربازیانە، لەئەنجامی ئەوەوە دروستبوون، كاتێك دۆزینەوەی كشتوكاڵ وخەریكبوون بەكاری كشتوكاڵی بوونە مایەی نیشتەجێبوون ،ئاوەدانكاری و شەڕ تێكەڵاوی ژیانی مرۆڤ بوون. جوتیارەكان بۆ ئەوەی پارێزگاری لەخۆیان وبەرهەمەكانیان بكەن، خۆیان لەگرووپی بچوك دا رێك خستووە. ئەم كۆمەڵە بچووكانە بەیانیان چوونەتە سەر كێڵگەكانیان وئێواران لەكاتی مەترسیدا گەڕاونەتەوە ناو گوندەكانیان وهەموو پێكەوە بەرگری یان لەخۆیان وبەرهەمەكانیان كردووە(٢٦).بەپێی لێكۆڵینەوەكانی(تەهاباقر) ،چاخەكانی پێش مێژوو لەگەڵ دەسپێكی (دەركەوتنی بنەماڵە فەرمانڕەواكان)كۆتایی پێ دێت. كەدەكەوێتە قۆناغی كۆتایی (چاخی نیمچە نووسین ونیمچە مرۆیی proto literate proto historic)(٢٥٠٠—٢٨٠٠پ.ن)(٢٧)ئەم زاراوەیەش، لەئەنجامی لێكۆڵینەوەیەكی (زانكۆی شیكاگۆی ئەمریكی)داڕێژراوە. كەلەچینەكانی (٥،٤)ی (وەركا) ئەنجامی داوە وگەیشتوونەتەبەرئەنجامی دۆزینەوەی یەكەم بنەماڵەی فەرمانڕەوایی وماوەكەیان لەنێوان(٢٥٠٠-تا- ٢٨٠٠پ.ن)لێك داوەتەوە. بەپێی كەرەستە دۆزراوەكانی ئەم سەردەمە، دەركەوتووە كەشارستانیەت پێشوچوونی بەخۆیەوە دیوە و ئەمەجگە لەپەرەسەندنی بەردەوامی پەرستگاكان، سەرەڕای جوانتربوونی شێوازەكانی نەخشەسازی ودروست بوونی رژێم ویاسای سیاسی كەشارستانیەتی (میسۆپۆتامیا)ی پێ جیادەكرێتەوە. كوردستان وەك یەكێك لەكۆنترین ناوچەكانی میسۆپۆتامیا و جیهان،قۆناغەكانی پێش مێژووی پێدا تێپەڕیوە. هەر لەچاخی بەردینی كۆنەوە بگرە تا دەگاتە ئەو چاخەمێژووییانەی كەبەچاخی(بنەماڵەكان) یان (دەوڵەتەشار–early dynastic)ناودەهێندرێ(٢٨).

**چاخی بەردینی كۆنی نزم لەكوردستان**
**lower palaeolithic**

بەپێی لێكۆڵینەوەكانی (ئەناتۆمی)،كۆنترین جۆری ئادەمیزاد لەم چاخەدا ژیاون. پاشماوەی كۆمەڵێك لەم جۆرە مرۆڤانە لە (جاوە)ی باكوری (چین)دۆزراوەتەوە .ئەمانە هاویەشی دەكەن لەگەڵ مرۆڤایەتی(هۆمۆ).هەرچەندە هێشتا نەبوونەتە پۆلێك لەمرۆڤی (سابینزsapins) واتە(مرۆڤی باڵاڕێك) كەدەگەڕێتەوە بۆ (چاخی بلایستۆسینی ناوەڕاست).هەروەها مرۆڤی (هۆمۆ سابینز)سەبارەت بەكوردستان تائێستا شوێنەوارێكی ئەوتۆی ئەومرۆڤانە نەدۆزراونەتەوە. جگە لەهەندێ كەل وپەلی كەم نەبێ وەك(كەل وپەلەزیخیەكان_pebble tools)(٢٩).چاخی بەردینی كۆن بەچەند قۆناغێكی بەستەڵەك داتێپەڕیوە كەماوەكەی لەنێوان(٦٠٠٠٠٠–تا–١٠٠٠٠٠پ.ن)بووە(٣٠).

**چاخی بەردینی كۆنی ناوەڕاست**
**middle ) (palaeolithic**

چاخی (مۆستیری) یان (لفوالوازی) بشی پێ دەڵێن. دەكەوێتە كۆتایی قۆناغی بەستەڵەكی سێ یەم وسەرەتای قۆناغی بەستەڵەكی چوارەم** بیروڕایەكی دیكە پێی وایە(چاخی بەردینی كۆنی ناوەڕاست)لەسەرەتای چاخی سەهۆڵبەندانی دووەمەوە دەست پێ دەكا ولەچاخی سەهۆڵبەندانی سێیەم كۆتایی پێ دێت.واتە لە(میندل)ەوە بۆ(ریس)(٣١).كۆنترین كەل وپەلەكانی ئەم چاخە كەلەكوردستان دۆزرابێتەوە لەلایەن(دورۆتی گارود)بووە .لەئەشكەوتی (هەزارمێرد)لەساڵی(١٩٢١ ن)كۆمەڵێك كەل وپەلی بەردینی دۆزییەوە.هەروەها لەئەشكەوتی (زەرزی)و(شانەدەر)وئەشكەوتی (بێستون)بەهەمان شێوە.ئەمەجگە لەدۆزینەوەی ئێسك وپروسكی (مرۆڤی نیاندەرتاڵ)كە بۆ هەمان چاخ دەگەڕێتەوە لەكوردستان دۆزرایەوە.مێژووەكەی دەگەڕێتەوەبۆ(٦٠٠٠٠)ساڵ پێش ئێستا(٣٢).

**چاخی بەردینی كۆنی باڵا**
**upper palaelithic**

ماوەكەی دەگەڕێتەوە بۆ كۆتایی چاخی بەستەڵەكی چوارەم (فۆرم).واتە كەوتبووە نێوان سەردەمی (ریس)وسەردەمی(فۆرم)ی سەهۆڵی.ئەم قۆناغە جیادەكرێتەوە، بەدۆزینەوەی جۆرەها كەل وپەلی لەبەرد دروستكراو. جگە

لەسەرەهەڵدانی (مرۆڤی ئاقڵ homo sapiens)ئەم چاخە لەبەر گرنگی پاشماوەکانی (ئەشکەوتی شانەدەر)ناوی لێندراوە(چاخی برادۆستی)وەك ئاماژمیەك بۆ ئەوناوچەیەی کەئەشکەوتی (شانەدەر)ی لێیە. جگە لەشوێنەوارەکانی ئەشکەوتی (هەزارمێرد)و(پەلگەوەرە) کەبریتیبوون لەوکەل وپەلانەی کەلەبەردی (گرکانی)دروستکرابوون.ماوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ(٢٥٠٠٠)ساڵ پێش زایین(٢٣).

دەکەوێتە کۆتایی چاخی بەردینی کۆن. پاشماوەی کەل وپەلەکانی ئەم سەردەمە بەوە جیادەکرێتەوە، کەقەبارەکەی بچوکترە لەقۆناغەکانی پێش خۆی وەك ئەوانەی کەلە(ئەشکەوتی زەرزی)دۆزراونەتەوەلەناوچەی (سلێمانی).ماوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ دەهەزار ساڵ پێش زایین. بۆیەکەمجار لەوسەردەمە کاری کشتوکاڵی دەرکەوتووە.کەپاشماوەی ئەم کارەش لەگوندەکانی (زاوی چەمێ وجەرمۆ)دۆزراونەتەوە.بەلگەیەلەسەر دروستبوونی قۆناغێکی نوێ

**چاخی بەردینی ناوەڕاست Mesolithic**

کەمرۆڤ لەئەشکەوتەکان هاتۆتە دەرەوەو لەدەرەوەدا نیشتەجێ بووەو گوندی دروست کردووە. تەنانەت لەپاشماوەکانی گوندی (زاوی چەمێ)ئێسك وپروسکی مەڕومالآت (sheeps) دۆزراوەتەوە، کەبەلگەیە، لەسەر بەخێوکرن وسوودلێ وەرگرتنیان ئەمەسەرەڕای دۆزینەوەی پاشماوەی هەمان قۆناغ لەناوچەکانی (کەریم شارومەلفەعات وگردچای)(٢٤).

**چاخی بەردینی نوێ Neolithic**

ئەم چاخە ماوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ( ٦٥٠٠-٥٥٠٠پ.ز).بەزۆر گۆڕانکاری ودەسکەوتی گرنگی مێژوویی جیادەکرێتەوە. کشتوکاڵی دانەوێڵەپەرەی سەند. ئەمەجگەلەپێشکەوتنی ئامێرەکشتوکاڵییەکان و ڕاو و ڕاوکردنی ماسی بووە پیشەیەکی ئەوسەردەمە.ئەمەجگەلەماڵیکردنی مەڕومالآت وپەلەوەر وسوودوەرگرتن لە(زەل وقامیش) بۆدروستکردنی خانوویەرە.جگەلەدۆزینەوەی دەفروکەل وپەلی لەقوڕدروستکراو و(سیرامیك)وەك(نوکەڕم وداسولکەوئامرازی

کێڵان)ی لەبەردروستکراو.پشکنینەکانی شوێنەوارناس(بریدود)لە(جرمۆ) دۆزینەوەی کۆمەڵێك لەپاشماوەکانی کەئەم قۆناغەی پێ جیادەکرێتەوە (٣٥).

### چاخی بەردینی کانزایی (chalcolithic)

لەدەوروبەری (٥٦٠٠دەست پێ دەکا تا٣٥٠٠پ.ن) دەخایەنێ. ئەویش بەچەندقۆناغێك تێپەڕدەبێ. بۆیە پێی دەگوترێ(کانزایی). ئەم قۆناغە بەوە جیا دەکرێتەوە، کەمرۆڤ بۆیەکەم جار سوودی لە(ئاسن)وەرگرت وبەهۆی (ئاگر)کەوتە تواندنەوەی ولەڕێگەی ئاسنەوەش زۆربەی کەل وپەلەکانی لەشێوازی بەردەوە گۆڕی بۆ ئاسن.تواندنەوەی (ئاسن)جیهانی بەرەوسەردەمی(برۆنز)پاڵ پێوەنا وکەڵك وەرگرتن لە(دووچەرخەی)کردە باو(٣٦).لەم قۆناغە جگەلەئاسن (مس)و(گۆگرد)یش سوودی لێ وەرگیراوە.بەتایبەت لەشارستانیەتی (میسۆپۆتامیا)،وێڕای ئەوەی گۆڕانکاری زۆر بەسەردروستکردنی ئامرازە بەردینەکان ولەقوڕدروستکراوەکان داهات .لەکوردستان گرنگترین ئەوشوێنانەی کەل وپەلەکانی چاخی بەردینی کانزایی لێ دۆزراوتەوە، بریتین لەپاشماوەکانی(گردی شمشارەوبتوێن وڕانیە(بێتواتە)وگردەدێم وقوڕەشینەودوگردکان وگردەکانی یاسینتەپەوبێگم ودوازدەئیمام)(٣٧).

### چاخی نیمچە مێژوویی ونیمچە نووسین proto literate proto historic

دەگەڕێتەوە بۆدەوروبەری (٣٥٠٠–٢٨٠٠پ.ن).ئەم قۆناغە قۆناغی گواستنەوەیە، لەچاخەکانی پێش مێژووەوەبۆچاخی(نووسین ودەرکەوتنی دەوڵەت وبنەماڵە فەرمانڕەواکان).نووسین بەشێوازێکی زۆر ساکار بەکارهاتووە،کەبریتیبووە لە(نووسینی وێنەیی)کەئەویش کەل وپەلێکی زۆر کەم دەگرێتەوە،بۆ نمونە (داهاتی دارایی پەرستگاکان).

ئەم چاخەلەگەڵ دەرکەوتنی بنەماڵەکان( ٢٩٠٠–٢٨٠٠پ.ن) کۆتایی پێدێت(٣٨).

سەرچاوە وژێدەر:

(*)سەبارەت بەووشەی کوردستان، بەپێی زۆر لەبۆچونە مێژووییەکان، ئەم ووشەیە زۆر درەنگتر لەنیشتەجێبوونی نەتەوەی کورد، لەم سەر زەمینە دەرکەوتوە.زۆربەی بۆچونەکان، کۆکن لەسەر ئەوەی کەئەم ووشەیە، بۆیەکەم جار لەسەردەمی (سەلجوقییەکان)لەسەدەی یازدەهەم ،بەکارهاتووە وبە ڕووبەرێکی بەرتەسکی جوگرافی گوتراوە،بەلأم دواتر بەهەموو ئەو شوێنانەی کوردی تێدا نیشتەجێبووە، گوتراوە.بڕوانە(د.فەرهادپیربال:کوردلەدیدی ڕۆژهەلأتناسەکانەوە،چاپی یەکەم،دەزگای ئاراس،هەولێر،٢٠٠٦،ل٥٨).

(١) د.جەمال ڕەشید:چاوپێکەوتن،گۆڤاری(ڕامان)،ژمارە(٢٧)،ئەیلولی١٩٩٨،ل٦٢.

(٢)د.وهیب ابی فاچل:موسوعه عالم التاریخ والحچاره–الجزو الاول،الگبعه الیالیه،نوبلیس،٢٠٠٧،ل٦٢.

(٣)گە باقر:مقدمەفی ادب العراق القدیم،گبعەالاول،الدار الدولیەللاسپمارات الپقافیه،مصر،٢٠٠٧،ل١١٠.

(٤)ئازادعبدالواحد: هەڤپەیڤینێکی فراوان لەگەڵ عبدالرقیب یوسف،چاپی یەکەم،چاپخانەی پەروەردە،هەولێر،٢٠٠٥،ل٧٣.

(٥) د.وهیب ابی فاچل: س،پ،ل١٥.

(٦)ئیزاك ئاسیمۆف وفرانك وایت:مێژووی شارستانیەت (هەنگاوی هەزارەکان)،چاپی یەکەم،دەزگای ئاراس،هەولێر،٢٠٠٣،ل١٤.

(٧) د.وهیب ابی فاچل: س،پ،ل١٥.

(٨)جۆرج حەنا:چیرۆکی ئادەمیزاد،و:ڕەووف زوهدی،چاپی یەکەم،بەڕێوەبەرایەتی چاپ وبلأوکردنەوە،سلێمانی،ل٣٢.

(٩)د.جەمال ڕشید:مرۆڤی چاخی بەستەڵەك،گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)،ژمارە(١١١)،ئەیلولی١٩٨٦،ل٥٥.

(١٠) د.وهیب ابی فاچل: س،پ،ل١٧–١٨.

(١١) گە باقر: س،پ،ل٢٠ .

(١٢) گە باقر: س،پ،ل٢٠ .

(١٣) گە باقر: س،پ،ل٢١ .

(١٤) د.جەمال ڕشید: (ڕۆشنبیری نوێ)،ژمارە(١١١)، س،پ،ل٥٧ .

(١٥) گە باقر: س،پ،ل٢٢ .

(١٦)سیتون لوید: اپار بلاد الرافدین،ت:محمدگلب،الگبعەالاولی،داردمشق،١٩٩٣،ل٩٣.

(١٧) گە باقر: س،پ،ل٢٢ .

(١٨)ڕۆبەرت جێی وئەوانیتر:لێکۆڵینەوەکانی پێش مێژوو لەکوردستان–بەشی یەکەم،و:ئاسۆس محمد،چاپی یەکەم،چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە،هەولێر،٢٠٠٥،ل١٢٤.

(١٩) ڕۆبەرت جێی وئەوانیتر: س.پ،ل١٣٣.

(٢٠) د.جەمال ڕشید: مرۆڤی چاخی بەستەڵەك ، س،پ،ل٦١.

(٢١) طه باقر: س،پ،ل٢٣ .

(٢٢) طه باقر: س،پ،ل٢٣ .

(٢٤) رۆبەرت جێی وئەوانیتر: س.پ،ل٢٤.

(٢٥) طه باقر:عصورماقبل التاريخ ف وادى الرافدين،گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد،بەرگی یەکەم-بەشی یەکەم،ژمارە(١) ،١٩٧٣،ل٥٩٦.

(٢٦) ئیزاك ئاسیمۆف وفرانك وایت:س،پ،ل٢٣.

(٢٧) طه باقر: مقدمه فى ادب العراق القديم، س،پ،ل٢٤ .

(٢٨) طه باقر:عصورماقبل التاريخ ف وادى الرافدين،گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد،بەرگی دووەم-بەشی دووەم،ژمارە(٢) ،١٩٧٣،ل٥٨.

(٢٩) طه باقر:عصورماقبل التاريخ ف وادى الرافدين،گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد،بەرگی یەکەم-بەشی یەکەم،ل٥٩٦.

(٣٠) طه باقر:عصورماقبل التاريخ ف وادى الرافدين،گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد،بەرگی یەکەم-بەشی یەکەم،ل٥٧٥.

(**)هەرچوار قۆناغی چاخی بەستەڵەك ،واتە یەکەم ودووەم وسێیەم وچوارەم لەئەوروپا پێی دەڵێن(گونتزومیندل وریس وفۆرم). لە(ئەمریکا)ش پێی دەڵێن(جیرسان وکەنسان وئیلینۆیان وویسکۆنسین)بڕوانە(د.جەمال رەشید:مرۆڤی چاخی بەستەڵەك،س،پ،ل٤٤).

(٣١) ) د.جەمال رشید: مرۆڤی چاخی بەستەڵەك ، س،پ،ل٤٥.

(٣٢) طه باقر:عصورماقبل التاريخ ف وادى الرافدين،گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد،بەرگی یەکەم-بەشی یەکەم،ل٥٩٦.

(٣٣) د.جەمال رشید: مرۆڤی چاخی بەستەڵەك ، س،پ،ل٤٥.

(٣٤) طه باقر:عصورماقبل التاريخ ف وادى الرافدين،گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد،بەرگی یەکەم-بەشی یەکەم،ل٥٩٥-٥٩٦.

(٣٥) سیتون لوید: م.س،ص٤٤.

(٣٦) ئیزاك ئاسیمۆف وفرانك وایت: س،پ،٣٢.

(٣٧) گه باقر:عصورماقبل التاريخ ف وادى الرافدين،گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد،بەرگی دووەم-بەشی دووەم،ژمارە(٢) ،١٩٧٣،ل٣٧.

(٣٨) طه باقر:عصورماقبل التاريخ ف وادى الرافدين،گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد،بەرگی دووەم-بەشی دووەم،ژمارە(٢) ،١٩٧٣،ل٥٧.

# زاراوەی مێژوویی

و: محمد عبدالله کاکە سوور

١- أتابك العسكر : گەورەی یان میری سەربازان.

٢- الأخشيد : نازناوی شایەکانی فرغانە

٣- أرسلان : شێر

٤- أرناؤوط : ئەلبانی

٥- أسطا : وەستای شارەزا لە پیشەکەی

٦- مسلمانی : تازە موسوڵمان بوو

٧- الاغا : برای گەورە، بەمانای گەورە، یان سەرۆکی خزمەتکاران دێت.

٨- الانكشارية : سەربازی نوێ

٩- أوغلی : کوڕ

١٠- أوطاف : خێوەتی مەزن

١١- بك : میر

١٢- إيلاق : ئەوەی کاری نیە

١٣- البازار : شوێنێکی گەورەی شت و مەك کڕین و فرۆشتن

١٤- باشا : بەرزترین نازناو (شایان سەرۆك)

١٥- البخت : بەخت و نسیب (فارسیە)

١٦- برادر : برا

١٧- البزاز : بازرگانی قوماش

١٨- البقچە: بوخچە، قوماشێکە شتی تێدا کۆدەکرێتەوە و لول دەدرێت

١٩- بقشيش : (فارسیە) بەمانای ئەو بەخشیش یان ئەو شتەی بە کەسێك دەدرێت.

٢٠- البهلول : ئەو کەسەی دەبێتە مایەی پێکەنینی خەڵك

٢١- بیبرس : پڵنگە میر

٢٢-البيرق : ئاڵا

٢٣-البيشه : فارسييه، بەمانای پيشه و لێهاتوويی دێت.

٢٤-البيضة : کڵاوێکه له ئاسن، سەربازەکان بۆ شەڕکردن له سەری دەکەن.

٢٥-بيمارستان : نەخۆشخانه

٢٦-التتن : توتن

٢٧-التخت : کورسی پاشا، يان سندوقی جل و بەرگ.

٢٨-التصدير : وانه گۆتنەوه، پێشڕەوی کردن له وانه گوتنەوەدا

٢٩-تطلي : شيرنەمەنی

٣٠- التنباك : هيندييه بەمانای مس دێت، و له تورکی به مانای دەفری نەرگيله يان شيشه دێت.

٣١- چاويش (شاويش) : پلەيەکی سەربازييه يان پەردەدار يان نامەبەر

٣٢-ضلبي أو شلبي : خانەدانی چاکەکەر يان گەوره

٣٣-الجمرك : ئيتالييه، بەمانای ديوانی باجەکان لەسەر شت و مەك دێت.

٣٤-الحمقدار : ئەوکەسەی لەلای ڕاستی سوڵتان دەڕوات بۆ پاراستنی.

٣٥-الجناب : نازناوی خاوەنانی شمشێر و قەڵەمه

٣٦-الجيزه : لايەکی ڕووبار يان لايەکی دۆڵ

٣٧- الحاشيه : ئەوەی له خوارەوەی لاپەڕه و له دەرەوەی نووسينه دەرەکيەکه دەنووسرێ.

٣٨- الحرفوش : الفقير: هەژار

٣٩-الخربشه : نووسين به خەتێکی خراپ يان نا ڕوون

٤٠- خرمان : پەرۆشی زيادبوو بۆ شتێك که خۆشی دەوێت.

٤١- الخزندار : بەرپرسی خەزێنەی سوڵتان

٤٢- الخشداش : هاوڕێ له کاردا

٤٣-الخوجا : فارسييه بەمانای گەوره و بازرگان و دەوڵەمەند دێت.

٤٤- الخولد : کەسێکی گەورەی مەزن يان مير

٤٥- الخوله : ئەو کەسانەی خزمەتی ئەسپ دەکەن

٤٦-الدبوس أو الدبسا : له دار يان ئاسن دروست دەکرێت، چيلکەيەکه و سەری خڕه.

٤٧-الدرابزون : شورەی قاڵدرمه يان پێپليکانه

٤٨–الدفتردار : دفتەری بەردەست و بەرپرسی کاروباری دارایی

٤٩–الرزنامە : فارسییە، ڕۆژ بە کوردیش هەمان مانای هەیە، ونامە بەنامەی کتێب و واتا کتێبی ئەمڕۆ یان ڕۆژژمێر دیت.

٥٠– الروشن : پەنجەرە و تاقینچکە

٥١– زادە : فارسییە بەمانای کوڕ دێت.

٥٢– زرکش : زەخرەفە

٥٣–زلطة : دراوێکی تورکی فێڵێکراوی تێکەڵکراوە.

٥٤–السلحدار : نازناوی ئەو کەسەیە چەکی سوڵتان هەڵدەگرێت.

٥٥–السماط : سفرە و خوانی سوڵتانی

٥٦–شاد : ئەو کەسەی بەدوای وەزیفەیەکدا دەگەڕێ

٥٧–الشباك : پەنجەرەیەکە بە ئاسن یان دار چوارچێوەی بۆ کراوە.

٥٨–الشريك : نانێکە بەڕۆن یان زەیت شێلدراوە و ڕەشکەی بۆ زیاد کراوە.

٥٩– شقدف : سندوقێکی دارە لەسەر پشتی وشتر.

٦٠– شواشر جمع شوشرة : سەرسامی و پەشێوی

٦١– شيركو : شێری دارستان

٦٢–الصفر : مسی زەرد

٦٣–الصيرفي : ئەو کەسەیپارە کۆدەکاتەوە و خەرجی دەکات

٦٤–الطابور : کۆمەڵە خەڵکێکن لەدوای یەکتری دەوەستن

٦٥–الطلبسي أو تلبسي : قاپی بچووك یان ناوەندی

٦٦– الطشت : قاپی گەورە

٦٧– الطرخان : المتقاعد

٦٨– الطرحة : قازییەکان لەبەریان دەکرد و مێزەری دادەپۆشین و بەسەر پشتیاندا دەهاتە خوارەوە.

٦٩–الظلمة، الظولمية : ترومپای ئاو

٧٠– غصبَ : قاچی براوەتەوە

٧١–العلج : پیاوی قەبە لە کافرەکانی عەجەم، و هەروەها وتراوە پیاوی شەهوەتبازی بێ سەروبەر

٧٢–الفتوة : ئازایەتی و یاری دەست سوکی و بەهێزی

٧٣- الفستان : جلێکی ئافرەتانەیە

٧٤-الفنجان : فنجانی قاوە و چایە

٧٥-القبة : لە چەتر گەورەترە

٧٦- قرة : ڕەش

٧٧- قشلە : سەربازگەی زستانە

٧٨- قلاوون : مرلوی یان میری رلوی

٧٩-القندقچی : چەك فرۆش

٨٠-قیصر : شای ڕۆمیان

سەرچاوە ئەنتەرنێت

# سلسلة مصطلحات تاريخية تركية، مصطلحات و ألفاظ تركية و فارسية إستخدمت في عصر المماليك و العثمانيين

